وَاذْكُر رَّبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ
مِنَ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ الْغَافِلِينَ





# لەخوا غافڵ مەبە











فاتیح مەلا ڕەسوڵ شارستێنی

بەرگی دووەم





ناوی کتیب: له خوا غافڵ مەبە —بەرگی دووەم—

نوسینی : فاتیح مەلا رەسول شارستێنی

نەخشاندنی نوسین و سەرپەرشتی: مەریوان ئەحمەد

نەخشاندنی بەرگ: قەیدار

تایپ کردن: ئیحسان ئەحمەد

نۆبەی چاپ: یەکەم، ٢٠١٥

بڵاوکردنەوەی: پرۆژەی گەشە.

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارە (١٣٩٢) ساڵی (٢٠١٥)ی پێدراوە.



## پێشکەشە بە:

- پێغەمبەری سەرومرم ﷺ، ئەو کەسەی کەخوا کردی بە ڕەحمەت، بۆ هەموو عالەم و لابەری هەموو زەحمەتێك.

- باوك و دایکی خۆشەویستم.

- هەموو مامۆستاکانم.

- هاوسەر و هاوژینم (سێوە خان) کەهەمیشە هاوکارم بوە.

- جگەر گۆشەکانم: (محمد و ئیبراهیم و ئاسودە و ئەڤین) خوای گەورە قبوڵیان بفەرموێت بە خزمەتکاری ڕێبازەکەی پێغەمبەری خواﷺ، و لە کێشە و گرفت لەگەڵ ڕۆڵەی مسوڵمانان بیان پارێزێت.. ئامین..

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ [الأعراف:٢٠٥]

واتە: وەلەدڵ و دەروونتدا یادی پەروەردگارت بکە، بەپاڕانەوە و ترس و بیمەوە، بەبێ ئەوەی دەنگ بەرز بکەیتەوە، لەبەرە بەیانی و دەماو دەمی ئێواراندا، وە لەبێئاگایان مەبە.

# پێڕست

## وانەی بیست و چوارەم: پزیشکی بەڕێز: دڵسۆزبە بۆ نەخۆشەکان

**وانەی بیست و پێنجەم: هێمنی و ئاسایش خەڵاتی خوایە**

## وانەی شانزەیەم:

# ئەی کوڕو کچێ هاوسەرگیریت بۆ نەکراوە.. پەنا بۆ بێشەرعی مەبە

- بەشی یەکەم -

## وانەی شانزەیەم:

## بابەت: ئەی ئەو کوڕو کچەی هاوسەرگیریت بۆ نەکراوە، نا ئومێد مەبەو پشت بە خوا ببەستەو پەنا بۆ بێ شەرعی مەبە.

### ـ بەشی یەکەم ـ

۞ **قالَ اللهُ سُبحانَهُ وتَعالى:** ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾﴾ الروم: ٢١.

۞ **قال رسول الله ﷺ: (مَنْ يَضْمَنْ لي ما بَينَ لَحْيَيْهِ وَ ما بَينَ رِجلَيْهِ أَضْمَن لَهُ الجَنَّة.)** رواه البخاری(٦٤٧٤).

**سەرچاوەکان:**


١) لاتَحزَن إنَّ الله مَعَنا، محمد متولي الشَّعراوي، ص٤٠١.

٢) ڕۆژنامەی (باسك)، ژ: ٥٠٠ ، لا١٢.

٣) گۆڤاری (ئاینده سازی)، ژ: ٩ ، لا١٨.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

**الحَمدُلله ربِّ العالَمِين وَالصَّلاة وَالسَّلام عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ أَجمَعِين:**

**شتێکی بەڵگە نەویستە کەهەموو گەنج و لاوێك بە کوڕو کچەوە، خوای پەروەردگار فیترەتی وا دروست کردووە، کاتێك تەمەنی دەگاتە پێگەیشتن و باڵغ بوونی جەستەیی و عەقڵی و دەرونی، یەکسەر حەز بەوە دەکات کەئەو پێویستیە گەورەیەی کە ناخی داوای لێدەکات جێبەجێ ببێ، کەئەویش پێکهێنانی ژیانی هاوسەرگیریە. لەبەر ئەوەی کوڕ و کچ کەگەیشتنە تەمەنی پێکهێنانی ژیانی هاوسەری، لە ناخیدا هەست بە تەنهاییەك دەکات، ئەو کوڕو کچە لە ناو ماڵی باوکیدایە، لە ناو خوشك و براکانیدایە، ئەوپەڕی خۆشەویستیان هەیە بۆی، لە هیچی کەم نیە لەڕوی خواردن و پۆشاك و ماڵ و حاڵەوە.. کەچی حەز دەکات ئەم خۆشەویستانەی بە جێ بهێڵێ..**

**ئەم سفرە ڕازاوە بەجێ بهێڵێ، ئەم خانوە خۆشە بە جێ بهێڵێ و بڕوات بۆ لای کەسێکی تر کە تائێستا لەگەڵی نەژیاوە، بڕوات بۆ سەر سفرەو خوان و مەتبەخێك کە زۆر خواردنەکانی لەمە سادەو ساکارترە و سفرەیەکی هەژارانەیە، بڕوات بۆ خانویەك ئەگەر کرێچی خەڵکیش بێ.. هەبووە وتویەتی ئەگەر لەگەڵ فلاَن کەسدا بژیم، لە خێمەو کەپریشدا بژیم هەر پێم خۆشە، ئەو کەسەش**

هاوسەری ژیانە. ئەم کوڕە هەست دەکات دەرونی ماندوەو پێویستی بە ئامێزی کەسێك هەیە کە کچێکە بەحەلاڵی، کچێکیش هەر بەهەمان شێوە، ئەمەش مافی ڕەوای خۆیانەو کارێکی خوا کردە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾﴾ الروم.

واتە: لە نیشانەکانی بون و دەسەلاتی خوای گەورە ئەوەیە کەلە جنسی خۆتان واتە: لەڕەگەزی ئادەمیزاد هاوسەری بۆ دروست کردون، تا لە پالیاندا بحەسێنەوە، وە خۆشەویستیشی و میهرەبانیشی خستۆتە نێوانتان، بۆ ئەوەی بتوانن پێکەوە باری گرانی ژیان هەلگرن و درێژە بە ژیان بدەن، بێگومان ئا لەوەدا گەلێ بەلگەو نیشانە هەیە بۆ کەسانێ بە وردی تێبفکرن و بەجوانی بیری لێبکەنەوە، چونکە خوا لەلەش و جەستەی هەردوکیاندا ئەوەندەی دروست کردوە کەهەردوو بەیەکتر ڕازی بن و وەلامی داخوازیەکانی یەکتر بدەنەوە بەو پەڕی سۆزو میهرەبانیەوە.

بەلێ ئەم ئارەزوی هاوسەر گیریەو پێکهێنانی ژیانی خێزانیە، مافی هەموو کوڕو کچێکە بیری لێبکاتەوەو ئاواتی بۆ بخوازێ و هەولی بۆ بدات. خوای گەورەش وەکوو غەریزەکەی دروست

کردووە، ڕێگای بەدەست هێنانیشی بەحەلاڵی دیاری کردووە، کە هاوسەری شەرعیە.

بەلأم: ئەگەر کەسێك لە کوڕ یان کچ بۆی نەگونجا ئەم ژیانی هاوسەرگیریە پێك بهێنێت، وەکوو لەم ڕۆژگارەدا دەبینین کەم نین ئەو خوشکانەمان، کەم نین ئەم برایانەمان، کەوا تەمەنیان هەڵکشاوە بەرەو سەرەوە، بەلأم هەلی هاوسەرگیریان بۆ نەرەخساوە، هێشتا هەر لەگەڵ ماڵی باوکیاندا دەژین.

ئێمە لەم وانەیەدا لە زنجیرە باسی (لەخوا غافڵ مەبە)، ڕو دەکەینە ئەو گەنج و لاوانەی کە هێشتا نەچونەتە خانەی هاوسەرییەوە و ئەم ئاواتەیان نەهاتوەتە دی، ئێمە پێیان دەڵێین: نا ئومێد مەبەو ڕەش بین مەبەو خۆت توشی قەلەقی و ڕاڕای مەکە، ئاگادار بە بەبیر کردنەوەی سلبیو نەرێنی لەم مەسەلەیە توشی گریێ نەرێنی نەبی، مادام ئەم ئاواتەی تۆ شەرعیەو ڕەوایەو، خوای گەورە خۆی دروستی کردووە و خۆیشی ڕێگای گەیشتن پێی داناوە، تۆیش ڕوت لەو خوایە بێ هەرگیز نائومێد مەبە..



چەند پەیامێك بۆ ئەوانەی هاوسەرگیریان دواکەوتوە:

## پەیامی یەکەم: بزانە دوا کەوتنی هاوسەر گیریەکەت بە ویستی خوا، خێری گەورەی تێدایە:

ئەگەر بتزانیایە چ حیکمەتێکی گەورە کەلە قازانجی تۆیە لەدوا کەوتنی هاوسەر گیریەکەتدا هەیە، ئەوا لەجیاتی دڵ تەنگی زۆر خۆشحاڵ دەبووی، چونکە مەرج نیە هەر مرۆڤ هاوسەرگیری بکات و تەواو، بەڵکو ئەوەی گرنگە ئەوەیە: ئامانجی زەواجەکە بێتە دی کە بریتیە لە(**یتَسكُنُوا إِلَيها**)، حەسانەوەو ئارامی و بەختەوەری و ژیانی ئاسودەو پڕە لەئەڤین و خۆشەویستی. ئەی ڕۆژانە بە چاوی خۆمان، لەدەورەبەری خۆمان کەسانێك نابینین هاوسەرگیریان کردووە، کەچی ئێستا لەدەرگای دادگاو مەحکەمەت و خەریکی جیا بونەوەن لەیەکتری..

چەند ئافرەت دەبینی کەبەئاواتی ئەوەوە بوو هاوسەرگیری بکات و ماڵ و حاڵی خۆی هەبێ، ئێستا وا هەیەتی، بەڵام ڕۆژی سەد جار خۆزگە دەخوازێ بەو کاتەی کە کچ بووە و لەماڵی باوکی بووە، خۆزگە دەخوازێ کە بەدرێژای ژیانی هەر کچ بوایەو شوی نەکردایە لەبەر ئەوەی ئەوەندەی ناسۆرو خەم و ئازار چەشتووە بەدەست مێردێکی زمان شیری، خراپی، دڵپیسی، ڕەزیلی، فێڵ بازی، بێوەفاوە.. کەهەتا خواستویەتی بەقوربان و بەساقەی بووە،

کەچی ئێستا چاوی لەسەر ئافرەتی ترەو ئەمی پشت گوێ خستووە ئەم ژنە داماوەش نازانێت چی بکات؟! بڕواتەوە ماڵی باوکی، ئەوانیش توشی دڵناڕەحەتی و خەم و خەفەت بکات، کە کچیان بەشوودا بۆئەوەی بەختەوەر بێت، نەك بە بێوەژنی و بە منداڵەوە بێتەوە بۆلایان... یان لەلای ئەم مێردەی دانیشێ بە خەم و ئازار و سوکایەتی قبولێ کردنەوە.

کەواتە: شوکردنەکەی لێی بوو بە بەلاّ و تەوق و چووە گەردنیەوە. چەند ژن هەیە نازی، بەڵکو لە ژاندایە. پیاوی واهەیە ئارەزووی ئەوەیە کە ئازاری ژنەکەی بدات، لێی بدات، بەوە پیاوەتی و شەهامەتی خۆی بچەسپێنێ و دەربخات! بینراوە پیاو هەبووە جگەرەی بەلاشەی ژنەکەی کوژاندۆتەوە! یان پیاوی واهەبووە ژنەکەی بە پێوە ڕاگرتووە و تەلاّقی لێ خواردووە کە ئەگەر دانیشێ تەلاّقی دەکەوێ!.

یان بینیومانە کچی واهەبووە لە تەمەنی زۆر منالّیدا شووی کردووە و هەبوە حەوت منداڵی هەبووە، هێشتا گەنج و جوانە،مێردەکەی کتوپڕ یان بە نەخۆشی، یان ڕووداوی هاتوچۆ یان لەجەنگدا مردوەو ئەم ئافرەتە بەم گەنجیە بێوەژن کەوتووە و، کۆمەڵێ منداڵی سەروپێچکەی بەسەردا کەوتووە، ڕاستە پاداشتی قیامەتی هەیە، بەلاّم هەموو ژیانی بەخەم و خەفەت و مەراقەوە

بەسەر برد، بەلاّم لە لەزەتی شوکردن و حەسانەوەی لای مێرد بێبەش بوو.

کەواتە: ئەو کچەی کە ئێستا شووی نەکردووە و هەر لە ماڵی باوکی بەکچی ماوەتەوە، کێ دەڵێ چارەنوسی ئەمیش وانەدەبوو ئەگەر شووی بکردایە، مێردێکی خراپ یان هەتیوباری بەشی نەدەبوو، ئێستا هەر یەك خەمی هەیە زۆر قازانجیەتی لەوەی کە دوای شوکردن سەد خەمی بێ چارەسەری هەبوایە.. لەم لاشەوە کوڕی واهەیە تا ئێستا هەلی زەواجی بۆ نەڕەخساوە، چەندین جار هەوڵی داوە و کارەکەی سەری نەگرتووە، بائەمیش گەشبین بێ بەوەی کە دواکەوتنی زەواجەکەی خێری تێدایە.

باسەیری ژیانی ئەو کوڕانە بکات کە هاوتەمەنی ئەم بوون و هاوسەرگیریان کردووە، بەلاّم توشیان بوە بە ژنێکی دەمەوەری دەم شڕی گفت و لفت ناخۆش. کە هیچ کات قسەیەکی خۆشی لەدەم نایەتەدەر کە ئەم مێردەی خۆشیەك و حەسانەوەیەك بەدڵیدا بێت.

یان ژنێکی ناڕازی و ناشکور کە بەهیچ ڕازی نیە و هەمیشە ژیانی خۆی هەڵدەسەنگێنێ و بەراورد دەکات بە ژیانی فلاّن کەسی دەوڵەمەند و، مێردەکەی بەراورد دەکات بە پیاوی خەڵك کە چۆن خانووی ئاوا و ئوتومبێلی گرانبەها و پارەی زۆریان هەیە.. بۆ ئەم نیەتی و ناتوانێ وەکو ئەوان هەر لە سەیران و سەفابن!!

بەم شێوەیە بەم ترتە و بۆڵە و ناشکوری و ناڕازی یە،ماڵەکەی لەم مێردەی کردوە بە دۆزەخ و لەجیاتی لە ماڵەکەیدا بحەسێتەوە، سەد خۆزگەی بەو کاتانەی کە کوڕ بووە و بێ ماڵ و بێ حاڵ بووە، یان لە ماڵی باوکی بوە! دەی کێ دەڵێ تۆش ئەگەر هاوسەرگیریت لەگەڵ ئەو کچانە بکردایە کە تا ئێستا هەوڵت بۆ داون و بەنسیب نەبوون، ژیانت ئاوا تاڵ نەدەبوو؟!

کەواتە: ئەم دواکەوتنە خێری تێدایە و خوای گەورە کەسێکت پێ دەبەخشێ کە قەرەبوی ڕابردوت بۆ بکاتەوە، بۆیە زانایان زۆر جوانیان فەرمووە: (لَو اطَّلَعْتُمْ عَلى الغَيْبِ لَأَخْتَرْتُمُ الواقِعَ).

ئەگەر بتان زانیایە لەپشتی پەردەی غەیبەوە چی بڕیاردراوە و کۆتایی شتەکان چی دەبێ، ئەوە ئێستاتان هەڵدەبژارد، چونکە لە ئەنجامدا هەر بۆئێوە ئەوەی ئێستا باشە.



## پەیامی دووەم: ئەی کچ و کوڕەکان لە خەیاڵدا مەژین لە بارەی هاوسەرگیریەوە:

لەبەرئەوەی زۆربەی کوڕ و کچ کە ماوەتەوە و هاوسەرگیری بۆ نەکراوە، بەشێکی زۆری بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە داوای هاوسەری نمونەیی دەکات، ئەوەندە شتی نایاب و جوان ڕیزدەکات کە لە

هاوسەرەکەیدا هەبێت، لەڕووی دینداری و ئەخلاق و ڕەوشتی بەرز و هەڵسوکەوتی جوان و قەدر و حورمەت و خوێندەواری و ڕۆشنبیری و دەوڵەمەندی و بڕوانامە و بنەماڵە و کەسوکار و شوێنی نیشتەجێبوونەوە.. کە زۆر بە دەگمەن لە مرۆڤدا هەمووی بەیەکەوە کۆدەبێتەوە، لەبەرئەوە ئەگەر کوڕێ یان کچ، ئەو کەسە میسالی و خەیاڵیەی دەست ناکەوێ و سەرەنجام لە هاوسەرگیری زۆر کەسی چاك و شیاو بێبەش دەبێت.. بۆیە پێویستە لەم لایەنەوە کچ و کوڕ کە بەتەمای هاوسەرگیریە ئەم چەند خاڵە بەرچاو بگرێت:

١) دین و ئەخلاق سەرەکیە:

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێنمایی داوەتە کچان و بنەماڵەی کچەکان، کە لەکاتی هاوسەرگیریدا دوای بەدڵبوونی جەستە و لەش و لاری کوڕەکە لەلایەن کچەکەوە، کەلەبەرچاو و دڵی جوان و پەسەندبێ. تەنها تەماشای دووشت بکەن، خوای گەورە دوو چاوی داویتێ، تۆش دوو شتی پێ ببینە: یەکەم: دین و ئاین و خواناسی، دووەم: ئەخلاق و ڕەوشت بەرزی.

ئەگەر کوڕێك ئەم دوانەی هەبوو، بالەڕووی ماددی و پارەوە کەمێك کەموکورتی هەبێ یان بڕوانامەی بالآنەبێ یان بنەماڵەی زۆر

ناسراو نەبیٚ. بە کەڵکی هاوسەرگیری دێت و دەتوانی متمانەی پیٚ بکەی و ناوی خوای لێبێنە و شووی پیٚ بکە..

بۆ کوڕانیش پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەوەی کردووە کە دوای ئەوەی سیما و ڕوخساری کچەکەی بەدڵبوو، بەتەماشاکردنی دڵی ئاسودە دەبوو، پێی تێردەبوو، ئیتر تەنها با تەماشای دینداری و خواناسی بکات.

کە لەناو دینداری و خواناسیدا، ڕەوشتە بەرزەکانی وەکو: پاکی و پاک داوێنی و وەفاداری و ڕێز و حورمەت لە مێرد و داپۆشراوی و دەرون و زمان پاکی تێدایە، ئیتر جوانیەکەی زۆر بەرز نی یە. یان کچی بنەماڵەیەکی ناودار و زۆر ناسراونیە، یان شەهادە و موچەی نی یە، ئەوانە گرنگ نین. تۆ دیندارەکە هەڵبژێرە و سەرفرازبوی و پەشیمان نابی.

٢) بە مەرجی زۆر، دەستکەوتنی هاوسەر دەگمەنە:

بزانە ئەوەی تۆ داوای دەکەی یان لە فەرموودە گەوهەرین و گران قەدرەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ خوێندوتەتەوە، کەباسی ڕەوشتی پیاوی چاك کە شیاوی ئەوەبیٚ ئافرەت شووی پیٚ بکات. یان ئافرەتی چاك کە شایەنی ئەوەبیٚ پیاو بیهێنیٚ، یاخود لە وتەی زانایان و دانایان دەربارەی هاوسەری چاك و شیاو، یان ئەوەی بیستوتە کە کوڕی چاك چۆن بیٚ و کچی چاك کە بۆ ماڵ و مێرد

دەشێ چۆن بێ، ئەگەر بتەوێ تەواوی ئەو سیفەتە چاك و باشانە لەو مرۆڤەدا هەبێ کە دەبێتە هاوسەری تۆ ڕەنگە زەحمەت بێ و زۆریش دەگمەن بێ، کە دەست تۆ بکەوێ.

بەڵام بزانە: مەرج نی یە ئەو فەرمودانە بۆ ئەوەبن کە دەبێ تەواوی هەموو سیفەتە جوانەکان لەیەك کەسدا هەبن، بەڵکو ئەگەر هەمووی تێدابوون ئەوە (نُورٌ عَلى نور) خۆئەگەر چەند دانەیەکی کەمبوو، ئەوە هەر (نورٌ) خۆئەگەر نیوەشی تێدابوو. ئەوە هەر گونجاوە و دەکرێ ڕەفزی پێ نەدرێ و چاوپۆشی لە کەم و کورتیەکانی بکرێ. بۆ زیاتر بەرچاو ڕۆشنی گەنج و لاوەکانمان (کوڕ و کچەکانمان) کە بەتەمای هاوسەرگیرین ئەم نمونە دەخەینە بەر دیدەتان:

قوتابی و خوێندکارێك ئەگەر هەموو نمرەکانی سەد بێ، زۆر زۆر باشە و ئەوانە دەگمەنن. خۆئەگەر لە (٨٠ – ٩٠)ی هێنا هەر زۆر باشە، وە بە خوێندکاری سەرکەوتوو و زیرەك ناودەبرێ. ئەگەر لە (٦٠ – ٧) بوو نمرەکانی، هەر باشە و گونجاوە، ئەگەر (٥٠) بوو نمرەکانی هەر دەرچووە و قۆناغێ دەبڕێ و بە قوتابی بێ کەڵك نایەتە ژمار و ڕاسب نابێ!

یاخود ئەگەر ئاڵتون عەیارەی (٢٤) بێ زۆر چاکە و ئاڵتونی تێزابە و گرانبەهاترین و دەگمەنە، بەڵام خۆ ئەگەر عەیارە (٢١)یش

بێت هەر زۆر نایابە، خۆئەگەر ئاڵتونەکە عەیارە (١٨)ش بێت هەر زۆر گونجاوە، ئەگەر عەیارە (١٢)ش بێت هەر لە ڕیزی ئاڵتوندایە و لە دوکانی زەڕەنگەریدا شایانی هەڵواسینە و نرخ و بەهای خۆی هەیە.

هەر بەم شێوازە، ئەگەر هاوسەری ژیانی داهاتوت، لە ڕیزی یەکەمەکانیشدا بێ و کەموکورتی هەبێ، مانای ئەوە نی یە کە بەکەڵکی هاوسەرگیری نایەت و دەبێ ڕەفزی بدرێتێ. گرنگ ئەوەیە نیوەی ئەو ڕەوشتە باش و باڵایانەی کە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ وە زانایان و دانایان فەرموویانە، لەو کەسەدا هەبێ کە داوای هاوسەرگیریت لێ دەکات، یان بەتەمای بیکەی بە هاوسەری خۆت. مرۆڤیش قابیلی گۆڕانە و بە ئومێدی خوا سیفاتە باشەکانی تریشی تێدا دروست دەبێ و نمرەکانی جار بۆ جار بەرزتر دەبنەوە.

**٣) ئەو مەرجانەی داوای دەکەی لە خۆتدا هەیە؛**

**ئەو ڕەوشتانەی کە تۆ داوای دەکەی لە هاوسەری ژیانتدا هەبێ، بیربکەوە ئایا لە خۆتدا هەیە؟!**

**بەسەرهاتێك:** کوڕێك چوە خوازبێنی کچێك و لە ڕێگەی باوك و کەسوکاریەوە داوای ژیانی هاوسەری لێکرد، کچەکە زۆر ژیر و عاقڵبوو، وتی: حەزدەکەم لەگەڵ کوڕەکە دانیشم و بەیەکەوە هەندێ قسەبەکەین و بزانم ئەو چ جۆرە کچێکی بەدڵە و ئەوەی ئەو

ئاواتی دەخوازێ لە مندا هەیە؟ یان من ئەوەی چاوەڕێم لە کوڕێکی باشدا هەبێت ئایا لەودا هەیە؟ با لە نزیکەوە یەکتری ببینین و گفتوگۆبکەین و لەبەر دوا ڕۆژی هەردووکمان کەسی سێهەمیشمان لەگەڵ بێت.

(بەڵێ جێگای خۆیەتی هەموو کوڕ و کچێك کە بڕیاری هاوسەرگیری دەدەن، پێش ئەوەی دەنگ و باسی خوازبێنیەکە بڵاوبێتەوە بەناو خەڵکیدا و مەجلیسی مارەکردن بگیرێ، ئەم کوڕ و کچە بەیەکەوە دابنیشن و قسەی دڵی خۆیان بکەن بەڵام واچاکە کەسی سێهەم ـ خزمێکی کوڕەکە یان کچەکە ـ لەگەڵیان بێ، ئەگەر لە دوریشەوە بوەستێ، بۆئەوەی ئەگەر بۆ یەکتر نەبوون کەس بوختانیان بۆ دروست نەکات و پێی لەکەدار نەبن).

بەڵێ ئەم کوڕ و کچە بەیەکەوە دانیشتن و کچەکە وتی: مەرجی تۆ چیە و چیت لە من دەوێت وەك هاوسەرێك؟!

کوڕەکە وتی: دەمەوێت هاوسەرەکەم.. ڕاستگۆ بێت، قسەخۆش و ڕووخۆش بێت لەگەڵم، هەمیشە زەردەخەنەی لەسەر دەم بێت، کە لەلای دەبم دڵم ڕاگرێت، کە لەلای نابم خیانەتم لێ نەکات، ڕێز لە کەسوکار و میوان و هاوڕێ و دۆستانم بگرێت، ڕەزیل نەبێ، زۆر دەستبڵاو نەبێ، دیندار و خواناس بێ، لەناخی دڵەوە خۆشی بوێم، وەفاداربێ و...).

ئینجا کوڕەکە وتی: ئێستا تۆ مەرجەکانی منت زانی، ئەی تۆ چاوەڕێی چی لە من دەکەیت؟! کچەکە وتی: من تەنها یەك مەرجم هەیە، کوڕەکە وتی: هەر تەنها یەك مەرج؟! وتی: بەڵێ هی من ئاسانە، تەنها یەك مەرجە و تەواو، کوڕەکە بە خۆشحاڵیەوە وتی: دەی تۆ مەرجەکەت بڵێ: مادام تەنها یەك داواکاریە، زۆر ئاسانە، فەرموو!

کچەکە وتی: بائەو شتانە لەخۆتدا هەبێ کە لەمنی داوا دەکەیت!!

(بەڕاستی قسەیەکی زۆر جوان و بەواتایە، ئەوەی لەمنی داوا دەکەی لە ڕەوشتی جوان و بەرز، بەڵێن بدە با لەخۆشتدا هەبێ، ئیتر کەواتە ئێمە بۆیەکتر دەبین وبەیەکەوە دەگونجێین).

## بە مەرجی زۆر، هاوسەرت دەست ناکەوێت..

بەسەرهات

شێخ أحمد القطان دەفەرمووێ: کوڕێك زۆر بەسەر تەمەنیدا تێپەڕی بوو، کە زۆر دەمێك بوو هاوەڵەکانی ژنیان هێنابوو، وە یەکی چەند منداڵیان هەبوو، ئەم هێشتا هەر مابۆوە، ڕۆژێکیان برادەرێکی دڵسۆزی پێی وت: فلان کەس تۆ تاکەی بەم حاڵەوە دەمێنیتەوە، ئەگەر وابڕوات دوای چەند ساڵێکی تر ئافرەتێك پێت ڕازی نابێ کە بەکەڵکی ماڵ و منداڵبوون بێت..

کوڕەکە وتی: ئاخر من بۆیە ئەو هەموو ساڵە خۆم دواخستوە، دەمەوێت هاوسەرێکی گونجاو و باشم دەستبکەوێ و وەکو فلان و فیسارم لێنەیەت کە ژنەکانیان تەڵاقدا، بەڵام هەرچەند دەکەم کچێکی ئاوام دەست ناکەوێ کە دڵم داوای دەکات!

هاوڕێکەی وتی: وەرە کچی فلان کەست بۆ داوابکەین، بەڕاستی نمونەی ئافرەتی چاکە.

کوڕەکە وتی: کوڕە چۆن ئەوەم دەوێ، ئەوە تەڵاق دراوە!

هاوڕێکەی وتی: براکەم، با تەڵاقیش درابێ، بەڵام بەخوا تا بڵێی ئافرەتێکی دیندار و بەڕێزە، هۆکاری تەڵاقدانەکەشی ئەم نەبووە، مێردەکەی بەداخەوە بەهۆی هاوڕێی خراپەوە تووشی عەرەق خواردنەوە بوە و نوێژی تەرك کردووە، هەرچەندە لەسەرەتادا وەعد و بەڵێنی بەم ئافرەتە باشە داوە کە نوێژ بکا و واز لە عەرەق خۆری بێنێ، بەڵام وازی نەهێناوە و ئەم ژنە چەندە هەوڵی لەگەڵ داوە کە باش بێ و سودی نەبووە، بۆیە وتوویەتی تا منداڵ لە نێوانماندا پەیدا نەبووە، ئێستا لەیەکتری جیاببینەوە باشترە، ئیتر بەم شێوە تەڵاق دراوە، بەڵام هەرچی پیاو بیەوێ لەم ئافرەتەدا هەیە، ئیتر لە دەست خۆتی مەدە.

کوڕەکە وتی: کاکە من هەرگیز ئافرەتی تەڵاقدرا و بێوەژن و مارەکراوم ناوێ، ئەگەر بەسەر هاوسەرگیریەکەی و مارەکردنەکەیدا

یەك هەفتەش ڕۆیشتبێ، من دەمەوێ کچێك بخوازم، گەنج و جوان، دەستی هیچ کوڕێکی بە حەلاڵیش بەرنەکەوتبێ، یاری و گەمەم لەگەڵ بکات و یاری و دەستبازی لەگەڵ بکەم!

هاوڕێکەی پێی وت: ئایا ژیانی هاوسەری تەنها یاری و گاڵتەوگەپ و دەست بازیە و تەواو؟!! خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دابونەریت و داواکاریە کوێرانەی نەشکاندایە و تەواوی هاوسەرە بەڕێزەکانی ـ دایکی ئێمە و هەموو ئیمانداران ـ بێوەژن نەبونایە، تەنها خاتوو عائیشە نەبێ کە کچ بووە، ئەو کاتە دەبوایە هەزاران بێوەژن بەبێ ئەوەی هیچ سوچ و تاوانیان هەبێ، نەتوانن جارێکی تر هاوسەرگیری بکەنەوە!

خۆ شتێکی ڕوون و ئاشکرایە و هەموو ئیمانداران ئەوە دەزانن کە ژیانی هاوسەری خۆشەویستمان ﷺ لەگەڵ خاتوو خەدیجەدا کە بێوەژن بوە و لە خۆیشی گەورەتر بووە، نمونەی بێ وێنەی ژیانی خۆشی هاوسەرایەتی بوە و پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز ئەم هاوسەرە چاك و بەوەفایەی خۆی لەیاد نەکردووە.

ئەمجا هاوڕێکەی بەم کوڕەی گوت کە بەدوای کچێکی باشدا دەگەڕا بۆ هاوسەرگیری: ئایا مەرجەکانی تۆ چین کە دەبێ لەم کچەدا هەبێ کە دەبێتە هاوسەرت؟!.

وتی: مەرجەکانم ئاسان و سادەن، ئەمانەن:

دەمەویٚ هاوسەرەکەم کچیٚ بیٚ، سپی پیٚستێکی بالآبەرز بیٚ، ناوقەدی وەکو ئاسك باریك بیٚ، وەکو تاووس ڕەنگین و بەلەنجە و لاربیٚ، ئەگەر بیٚدەنگ بوو سەیری دەمت کرد وابزانی زەردەخەنە لەسەر دەمیەتی، هیٚندە دەم و لیٚوی جوانبیٚ!، ئەگەر زەردەخەنەی کرد و ددانی بەحالیٚ دەرکەوت وابزانی بانگت دەکات! دەنگی زۆر ناسك و سەرنج ڕاکیٚشبیٚ، وەکو دەنگی بولبول وابیٚ، چاوەکانی ئەوەندە سەرنج ڕاکیٚشبن، کە سەیری کردی وابزانی سیحرت لیٚ کراوە و عەقلٚت لای خۆی نەمیٚنیٚ!!

چاوی ڕەش و گەورەبیٚ وەکو چاوی حۆریەکانی بەهەشت، لە دورەوە جوانبیٚ! کە لە نزیکەوە سەیرت کرد ئەمجا جوانتر بیٚ، (دوور جوانی نزیك خەسار نەبیٚ). ئەوەندە بالآی بەرز و ڕیٚك بیٚ ئەگەر دانیشت وابزانی بەپیٚوەیە، ئەگەر بە پیٚوە بوو وابزانی سواری پشتی وولآخە بەرزەیە!

پیٚشتر دەوڵەمەند بوبیٚ و پاشان هەژار کەوتبیٚ. بۆئەوەی عیزەتی دەوڵەمەندی و زەلیلی هەژاری تیٚدابیٚ. حیلم و لەسەرخۆیی لەگەلٚ عیلم و زانستەکەیدا بەیەکەوە شیٚلدرابیٚ، لە قسەکردندا حیکمەت لە قسەیدابیٚ! جار بۆ جار جوانتربیٚ، قژی سەری بە شەو ڕەنگیٚك بە ڕۆژ ڕەنگیٚك بنویٚنیٚ، بە ویژدان بیٚ، دلٚ نەرم و بەبەزەیی بیٚ، زۆر بەڕیٚز بیٚ، بۆ گەوران خزمەتکار و بۆ مندالآن بەسۆزبیٚ، دراوسیٚ ئازار نەدات.وە هەروەها...)

هاوڕێکەی قسەکەی پێ بڕی و وتی: بەسە، بەسە، براکەم. ئەمەی تۆ دەیڵێی ئەگەر هەبوایە دەمێکبوو کڕدرابوو، بۆ تۆ نەدەمایەوە!! براکەم، لە مەرجەکانتدا بۆ هاوسەری داهاتوت تۆزێ تەوازوع بنوێنە و هەندێ خاکی بە، هەموو ئەوانەی کە تۆ بەدڵت نەبوون، تەنها مەرجی دینداری و ئەمانەتپارێزی کچەکەیان لەتۆی بەڕێز ویستووە و هیچی تر، دەی تۆ ئەو هەموو پەڵپ و بیانوە چی یە دەیگری...

پاشان برای بەڕێزم: بێگومان ئاوێنە لەماڵتاندا هەیە، تو خوا بڕۆ بە دیاریەوە بوەستە و تەماشایەکی خۆت بکە ئەگەر هیچ کام لەو سیفەتە دەگمەنانەت لە جەستەی خۆتدا بینی کە لە هاوسەرەکەتدا داوای دەکەی هەبێت، ئەوە دڵنیابە بە ئێمەش بە هەموومان هەوڵی ئەوە دەدەین کە هاوسەرێکت بۆ پەیدا بکەین کە ئەو مەرجانەی تێدابێ کە تۆ دەتەوێ، دڵنیاشین کە لەسەر زەوی دەستمان ناکەوێ.

بەڵام دەڕۆین بۆ هەسارەی مەریخ بۆئەوەی بەڵکو لەوێ کچێکی ئاوامان دەست بکەوێ کە تۆ داوای دەکەی!! {مَواقِف إيمانِيَّة، محمود المصري، ص٤٨٩}

هەروەها لەم بارەیەوە بە هۆنراوە (شیعر) گەنجێك نامەیەك بۆ پیاوێکی ژیر و ناسراوی ناو خەڵك بەناوی (ئەبو عەزیزە)ناردوە، کچێکی هەبووە ناوی (عەزیزە) بوە، پێیان وتوە (باوکی عەزیزە)،

ئەم گەنجە نامەیەکی بۆ نوسیوە و داوای ئەوەی لێکردووە کە بەڵکو ئافرەتێکی بۆ بدۆزێتەوە کە ئەم سیفەتانەی تێدابێت..

ئەویش کە نامەکە دەخوێنێتەوە، لە وەڵامدا بۆی دەنوسێ: بەخوا ئەگەر ئەو ئافرەتەی تۆ باسی دەکەی و سیفاتەکانت لە نامەکەتدا نوسیوە، ئەگەر دەست من بکەوێ، ئەوا دایکی عەزیزە. (أُمُّ عَزیزە)ی بۆ تەڵاق دەدەم کە لای من لە هەموو ئافرەتێ جوانتر و چاکترە، ئەم تەڵاق دەدەم و ئەو دێنم، ئەمەش دەقی شعرەکەیە بە عەرەبی:

(بعث امروٌ لِأَبي َعزيزَةٍ مَرَّةً
بِرسالَةٍ يبكي وَ يضحك مابِها
فيها يقول أُسيدُ مِنْكَ صَبِيَّةً
حَسْناءَ معرُوفٌ لَديكُمْ أَصلُها
و عفيفةً و حَليمَةً و أَديبَةً
وَ رَشيدة ورزينَة في عَقْلِها
قَدْ أَحْرَزَتْ في العِلْمِ غَيْرَ شَهادَةٍ
وَعَلى النسا تُرى تفوق بِفَضْلِها
وَ تكون ذات مالٍ وافِرٍ
تعطيهِ مِنْ بَعْدِ الزَّواجِ لِبَعْلِها)

ئەبو عەزیزەش ئاوا وەڵامی نامەکەی دەداتەوە:

وافَى كِتابُكَ سيدي فَقَرَأْتُهُ
وَ عرفتُ هاتيكَ المطالب كُلُها
وَلَوْ كُنْتُ أقدر أَنْ أرى مَنْ تَشْتَهي
طلقت أم عزيزةٍ وَ أَخَذْتُها



**پەیامی سێهەم: ئاگاداربن خەڵکی دەست وەرنەداتە ژیانتان:**

هۆکارێکی تر کە کچان و کوڕانمان لە پڕۆسەی هاوسەرگیری دوابکەون ئەوەیە کە: دەست تێوەردانی خزم و کەسوکار لە بەشودانی کچەکاندا. کچی واهەیە حەزدەکات بە دڵی خۆی شوو بە کوڕێکی گەنجی جوانی ڕێکوپێك بکات.

بەڵام لەملاوە باوکی حەزی بە بنەماڵەی کوڕەکە نی یە. لەبەرئەوە کاتی خۆی ناکۆکیەکی عەشایەریان لەسەر زەوی و زار، یان فلاُن مەسەلە هەبووە هەندێ دڵ عاجزی ڕوویداوە، ئەمە لە کاتێکدا کە لەو کاتەدا ئەو کوڕ و کچە هەر لە دایك نەبوون، ئیتر چ پەیوەندیەکی بە ژیانی ئەمانەوە هەیە؟ بەم شێوەیە ئەم باوکە ناهێڵێ لە هەلی زێڕین و کاتی گونجاوی خۆیدا کچەکەی شوبکات.

ئیتر چەند ساڵی تری پێ دەچێ، تا هەلێکی گونجاوی تر و کەسێکی شیاوی تر لە دەرگایان دەدات. ئەمجارەیان مامی ناهێڵێ، یان دایکی دەڵێ بۆ برازای خۆمم داناوە. بۆ خوشکەزای خۆمم داناوە، کچەکەش حەزناکات شوو بەمانە بکات.

ئیتر دەرفەتی شووکردنی لەبەردەم دادەخرێ و وەختێ بەئاگادێنەوە، تەمەنی تێپەڕیوە و ئەمجا هەموو کوڕێك گەنج و جوان نایەوێ ئەمیش شوو بە پیرەمێردێ ناکات. بەمشێوەیە دەست تێوەردانی بنەماڵە بوە هۆکاری دواخستنی ئەم شوکردن و ژنهێنانە. کە بەڕاستی کارێکی نەگونجا و نەشیاوە !.



## پەیامی چوارەم: داوێن پاکی خۆتان بپارێزن:

ئەی ئەو کوڕ و کچانەی کە تا ئێستا هەلی هاوسەرگیریتان بۆ نەگونجاوە، ئاگاتان لەخۆتان بێ و لەخوا غافڵ مەبن، داوێن پاکی خۆتان بپارێزن، خۆتان دوربگرن لە هەموو ئەو شتانەی کە داوێن پاکیتان لەکەدار دەکات. چەند خۆشە گەنج لە کچ و لە کوڕ، کاتێ کە هاوسەرگیریەکەی دوادەکەوێ، ئارام دەگرێ و مەردانە و پاڵەوانانە خۆی ڕادەگرێ و وەختێ چوە پرۆسەی هاوسەرگیریەوە، لەکەیەك و هەڵەیەکی پێوە نی یە کە پێوەی شەرمەزار بێت. وە خوا خوای ئەوەی بێت کەکەس پێی نەزانێ..

ئەمجا بۆلای خوای گەورەش چی بە ئەندازەی ئەوە نازدارە، کە خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا، باسی لاوێك دەکات لەبەر خاتری ڕەزامەندی خوا وازی لە ئارەزووی خۆی هێناوە کە بە حەرام تێری بکات. بەو گەنجانە دەفەرمووێت: (**أَنْتَ عِنْدي كَبَعْضِ مَلائِكَتي**). ئەی گەنج تۆ لەبەر خاتری ڕەزامەندی من و بە ئیمانت بەوەی کە من چاودێرتم بەسەرتەوە، خۆت پاراست لە داوێن پیسی و پێشەکیەکانی، ئەوە بەڕاستی تۆ لەلای من لە هەندێ لە فریشتەکانم ـ کە فریشتە هەرگیز گوناه و بێ شەرعی ناکات ـ بەڕێزتری و وەکو هەندێ لە فریشتەکانم وای! !

بەڵێ سوپاس بۆ خوا زۆر گەنجمان هەیە فریشتە ئاسایە. لە فەرموودەیەکی حەسەندا، پێغەمبەری خوا ص دەفەرمووێت: (**عرض عَلَيَّ أَوَّلَ ثلاثة يدخلونَ الجَنَّةَ: شَهيدٌ، وَ عَفيفٌ مُستعففٌ، وَ عَبْدٌ أَحْسَنَ عِبادَةَ اللهِ**).

واتە: نیشانم درا، یەکەمین سێ کەس و دەستەیەك کە دەچنە بەهەشتەوە: شەهیدێك و کەسێکە کە داوێن پاکی خۆی پاراستوە، وە بەندەیەك کە بەجوانی بەندایەتی خوای خۆی دەکات.

چەند خۆشە ڕۆژی عەرەق ڕشتن و ڕۆژی پاداشت و سزا ـ قیامەت ـ کاتێ خۆر نزیك دەکرێتەوە تۆ لەو ڕۆژەدا لە ژێر سێبەری عەرشی پەروەردگاردا بیت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەوت پۆل لە ڕۆژی قیامەتدا، لەکاتی ناڕەحەتی و مەینەتیەکاندا،

ئەوان لە ژێر سێبەری خوای گەورەدان. یەکێك لەو پۆلانە پیاوێکە کە ژنێکی جوان و خاوەن پلە و پایە داوای لێبکات و بانگی بکات بۆ پڕکردنی حەز و ئارەزووی، ئەو لە وەڵامدا بڵێت: من لە خوا دەترسم!

ئەی ئەو گەنج و لاوە چی دەکات و حاڵی چی دەبێت کە تەنها سەرقاڵە بە پڕکردنی حەز و ئارەزووەکانی، هیچ سنورێك لە سنورەکانی خوای گەورە ناپارێزێت، ڕێگە تاریکەکانی گرتوە و ڕێگەی نور و ڕووناکی نابینێ و چاوی خۆی لێ دادەپۆشێت؟!

ئەی گەنج و لاوی کوڕ و کچ پێویستە خاوەن بڕیار بیت، قبوڵ نەکەیت جێگەی خۆت لە زبڵدان ببینیت، دەرونی پاك و پوختت بەکاری حەرام و ناپەسەندەوە پیس مەکە، (هیندی کچی عوتبە) پێش موسڵمان بونی پێیان وت: پێغەمبەر ﷺ بەیعەت وەردەگرێت لەسە زینا نەکردن.

سەرسامبوو وتی: ئایا ئازادەکان داوێن پیسی دەکەن؟!! ئەو هەرگیز نەهاتۆتە بیری کەکەسی ئازاد و خاوەن بڕیاری کاری وای لێ بوەشێتەوە!!

پیاوێکی وەکو (ئیمام شافیعی) لێرەوە بۆ دروست کردنی کەسایەتی خۆی فەرموویەتی: (ئەگەر بزانم خواردنەوەی ئاوی سارد بۆ کەسایەتم خراپە، نەمدەخواردەوە)!! جێگەی سەرسامیە مرۆڤ کارێك بکات کەسایەتی پێ لەکەداربێ! {ئایندە سازی، ژ: ٩، ل١٩}

## وانەی حەڤدەیەم:

# ئەی کوڕو کچێ هاوسەرگیریت بۆ نەکراوە..

# پەنا بۆ بێشەرعی مەبە

## وانەی حەڤدەیەم

## بابەت: ئەی ئەو کوڕ و کچانەی تا ئێستا هاوسەرگیریت بۆ نەکراوە. نائومێد مەبە و پشت بەخوا ببەستە و، پەنا بۆ بێ شەرعی مەبە

- بەشی دووەم -

۞ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَذُرِّيَّةٗۚ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأۡتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ لِكُلِّ أَجَلٖ كِتَابٞ ﴿٣٨﴾ يَمۡحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثۡبِتُۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾﴾ الرَّعد.

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (النِّكاحُ مِنْ سُنَّتي، فَمَنْ لَمْ يَعْمَلْ بِسُنَّتي فَلَيْسَ مِنِّي) - رَواهُ إبنُ ماجَّة: (١٨٤٦) و حَسَّنَهُ الألباني في صَحيح الجامِع: (٦٨٠٧).

## سەرچاوەکان:


١) الزَّواج في القرآن الكريم و السُّنَة الصَّحيحَة، محمد ملا فائق الشهرزوری.

٢) رياضُ الصّالحينَ، الإِمام النَّووي، و: نوری فارس، ب١، ل١١٨.

٣) گۆڤاری داهێنان، ژ: ٢٩٣، ل١٩.

٤) ئافرەت و خێزان له سایەی شەریعەتدا، م. عەلی باپیر، ل٢٢٥، ل٢٣٢.

٥) التّاج الجامِع لِلأصُول، منصور علي ناصِف، و: م. نوری فارس ب٢، ل٤٩٢.

٦) مَواقِف إيمانِيَّة لِلْمَرْأة المُسْلِمَة، محمود المصري، ص٤٨٥.

٧) ڕۆژنامەی باسك، ژ: ٥٠٩.

٨) مِنْ أنْباءِ القُرى. د. أحمد الكُبَيسي، ص٣٩٩، ص٤٠٣.

٩) لا تَحزن وَابْتَسم لِلْحَياة، محمود المصري، ص٥١.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين، و الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ أجْمَعينَ:

له وانەی پێشودا باسی ئەوەمان کرد کە هاوسەرگیری یەکێکە لە بنەما سەرەکیەکانی ژیانی مرۆڤ و سوننەتی ژیانە، وە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەمیشە و بەردەوام هانی ڕەگەزی نێر و مێی داوە، کە بەحەلاڵی بەیەك بگەن و لەتەمەنی گونجاودا هاوسەرگیری بکەن.

وە ئەم هاوسەرگیریە ڕێبازی هەموو پێغەمبەرانی خوایە ـ سەلامی خوا لە هەموو پێغەمبەران بێت ـ وەکو خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت:

﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَذُرِّيَّةٗۚ﴾ الرّعد: ٣٨ . واتە: بێگومان ئێمە پێش تۆ ئەی محمد ﷺ پێغەمبەرانی ترمان ڕەوانە کردووە، بەوانیش هاوسەر و نەوەمان بەخشیوە..

هەروەها پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ هانی گەنج و لاوەکانی داوە بۆ هاوسەرگیری و فەرموویەتی: **(النِّكاحُ مِنْ سُنَّتي، فَمَنْ لَمْ يَعْمَلْ بِسُنَّتي فَلَيْسَ مِنِّي)** ـ رَواهُ إبنُ ماجَّة: (١٨٤٦) و حَسَّنَهُ الألباني في صَحيح الجامِع: (٦٨٠٧).

واتە: هاوسەرگیری لە سوننەت و ڕێبازی منە، هەر کەسێ کار بە ڕێباز و سوننەتی من نەکات، ئەوە لەمن نیە !! بۆیە هیچ کەس

بەناوی دینداری و خۆیەکلاکردنەوە بۆ خواپەرستی، مافی ئەوەی نیە کە بلێ ژن ناهێنم یان شوو ناکەم. گۆشەگیری و ڕەبەنی لە ئیسلامدا نیە. لە فەرموودەیەکی تردا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

**(إذا تَزَوَّجَ العَبْدُ فَقَدْ إسْتَكْمَلَ نِصْفَ الدِّينِ، فَلْيَتَّقِ اللهَ في النِّصْفِ الباقي)** ـ رَواهُ الحاكم، وَ حَسَّنَهُ الألباني في: (صَحيح الجامع: ٤٣٠). واتە: هەر کاتێ کەسێك (کوڕ یان کچ) هاوسەرگیری کرد، ئەوا نیوەی ئاینەکەی تەواو دەبێت، ئیتر بائاگای لەخۆی بێت و لەخوای پەروەردگار بترسێ لەبارەی نیوەکەی تریەوە.

لە ئیسلامدا ئەو ئارەزووە جنسیەی کە لە مرۆڤدا خوای گەورە دروستی کردووە، جێبەجێ کردن و تێرکردنی بە حەلاڵی پاداشتی بۆ دانراوە، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **(وَفي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، قالُوا: يارَسُولَ اللهِ أَيَأْتي أَحَدُنا شَهْوَتَهُ، وَيَكُونُ لَهُ فيها أَجْرٌ؟! قالَ: أرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَها في حَرامٍ أكانَ عَلَيْهِ وِزْرٌ؟ فَكَذالِكَ وَضَعَها في الحَلالِ كانَ لَهُ أَجْرٌ)** ـ رَواهُ مُسْلِم: (١٠٠٦).

واتە: دروستبوون و جیماع کردن لەگەڵ حەلاڵی خۆتاندا خێرێکە، صەحابەکان عەرزیان کرد قوربان وەکو تۆ دەفەرمووی ئەگەر ئارەزووی خۆمان بشکێنین و، کەیف لەگەڵ حەلاڵی خۆماندا

بکەین، ئەوەیش خێر و پاداشتی هەیە؟! فەرمووی: باشە بە من بڵێن، ئەگەر کەسێ لە ئێوە ئەو ئارەزووە جنسیەی خۆی لە حەرامدا بەکاربێنێ، ئایا تاوانی لەسەرە یان نا؟ کەواتە: هەر لەسەر ئەم بنیاتە ئەگەر لە حەڵاڵدا بەکاری بێنی، ئایا تاوانی لەسەرە یان نا؟ کەواتە: هەر لەسەر ئەم بنیاتە ئەگەر لە حەڵاڵدا بەکاری بێنێ پاداشتی بۆ هەیە. {رياضُ الصّالحين، ب١، ل١١٨}.

بەڵام هەندێ جار ئەم هاوسەرگیریە کە مافێکی ڕەوای مرۆڤە، دواکەوتنی تێدا ئەنجام دەدرێ کە لە وانەی ڕابردوو هەندێکمان لەو بارەیەوە باسکرد، وە ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی دواخستنی هاوسەرگیری هەندێکیان پەیوەندیان هەیە بە بڕیاری بەجێ و پڕحیکمەتی خوای پەروەردگارەوە، کە خێری ئەم کوڕ و کچەی دەوێت و دوای تەواوبوونی هەموو کارەکان تەگەرەیەك، گرفتێك، دێتە پێشەوە و ناگاتە مارەکردن و گواستنەوە..

کە لە زانستی بێ سنوری خوای پەروەردگاردایە کە ئەگەر ئەم هاوسەرگیریە بکرایە سەرکەوتوو نەدەبوو، وە عاقیبەتی بەخێر نەدەبوو، دەی هاوسەرگیریش هەر ئەنجامدانی شەرت نیە، بەڵکو بەختەوەر بوون و حەسانەوە لەو هاوسەرگیریە گرنگە، ﴿لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا﴾. هاوسەرگیری کاتێ باشە کە ئەو کوڕ و کچە لەپاڵ یەکدا ئارام بگرن، دووگیان بن و لەناو یەك جەستەدا کۆببنەوە.. هاوژین

و هاودەمی یەکتری نەبن، نەك هاوشەڕ و دوژمنی یەکتری بن. خۆ هەموو ئەوانەی لە دادگاکاندا دەیبینین کە لەیەکتری جیادەبنەوە و تەلاق وەردەگرن، لەسەدا نەوەت و هەشتی زیاتر بەخۆشەویستی و بەئاواتی دڵی خۆیان بۆیەکتربوون. کەچی ئێستا پارێزەر دەگرن بۆئەوەی کە لەیەکتری ڕزگاریان ببێ و یەکتری نەبینن، هەر بۆیە ئەو کچەی کە چەند جار هەوڵی داوە هاوسەرگیری بکات، بەڵام بۆی سەرناگرێ..

یان ئەو کوڕەی کە چەندین کچی دەستنیشان کردووە، بەڵام ناگاتە مارە کردن هێشتا بە تەنها ماوەتەوە، بە ئەوانە دەڵێین: (لەخوا غافڵ مەبە و توشی ڕەش بینی مەبە و دڵت بەوە خۆشکە کە بە ئیزنی خوا ئەمە خێری تێدابووە و، خوای گەورە تۆی خۆشویستووە، کە بۆ کاتێکی کەم و چەند ڕۆژ و هەفتەو مانگ دڵخۆشی نەکردووی، بۆئەوەی دوربی لەوەی بە شوێنەواری تاڵی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریەکەت، چەندینساڵ بناڵی و تاڵی ژیان بنۆشی.. لەلایەن کەسانی تێنەگەشتوو لە ئاین و ڕۆشنبیری گشتی تانە لە کەسایەتیت بدرێ و بەچاوی نامۆ لە کۆمەڵگادا تەماشا بکرێ !

هەر بۆیە سەرنەگرتنی ئەم هاوسەرگیریەت و دواکەوتنی بە ویستی خوا خێرێکی گەورەی تێدایە، هەروەکو خوای گەورە

فەرموویەتی: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ﴾ البقرة: ٢١٦.

## ماڵی دنیا مەکەنە مەرج بۆ هاوسەرگیری:

بەڵام: هەندێکی تر لەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی دوا کەوتنی هاوسەرگیری کوڕ و کچەکان لەکاتی خۆی، دەستکردی کەسەکان خۆیان، یان کەسانی دەوروبەریانە، کەلە وانەی ڕابردوودا هەندێکمان لەوانە باسکرد و ئەوەی ماوە کە بیلێین ئەوەیە: بەشێك لە هۆکاری دواکەوتنی هاوسەرگیری گەنجەکان و دواکەوتنی بریتیە لە چاو برینە ماڵی دونیا و، زۆرتر ڕوانینە لایەنە ماددیەکان. بەڕاستی ئەوەی بۆتە ڕەخنە و کارێکی ناشایستە، بریتیە لەوەی: بەشێوەیەکی گشتی لەم سەردەمەدا کوڕ و کچەکان، بەتایبەت دەرچووی پەیمانگا و زانکۆکان، پێوەرەکانیان لەکاتی هاوسەرگیریدا بەرەو ماددی بوون ڕۆشتووە.

هێندەی جەخت لەسەر بابەتە ماددیەکانی وەکو ئاڵتون و ئەساسی ماڵ و ئاهەنگی هۆڵ و مارەیی زۆر و خانووی ئامادە و سەفرەی مانگی هەنگوینی دەکەنەوە، نیو هێندە جەخت لەسەر بابەتە مەعنەوی و پەروەردەیی و ڕەفتاریەکان ناکەنەوە.

بەشێکی زۆری کچان گەورەیی خۆیان لەوەدا دەبیننەوە کەشوو بە ئوتومبێلێکی گرانبەها و (٥٠ – ١٠٠) مسقاڵ ئاڵتون و شەکراو

خواردنەوە و ئاهەنگی قەرەباڵغ دەکەنەوە، زۆر کەمتر بیر لەوە دەکەنەوە کە ئەو کەسەی دێتە خوازبێنیان چ جۆرە بیرکردنەوەیەکی هەیە و، چۆن ڕەفتار دەکات و لەگەڵ چ جۆرە هاوڕێیەکدا ژیان بەسەر دەبات و، کاروپیشەی چی یە؟ ڕابردووی چۆن بووە؟!

ئەمەیان بەلاوە گرنگ نیە و بەشێکی بچوکی سەیردەکەن، ئیتر سەرەنجام زۆرێك لە کچان یان دوور لە شوکردن دەمێنێتەوە و ئەو کوڕە دەوڵەمەند و خاوەن ئیمکانیاتە ماددییەیان دەست ناکەوێت کە شووی پیّ بکەن. یاخود شوو بە کەسێکی لەو جۆرە دەکەن و پاش چەند هەفتەیەك لە تێپەڕبوونی هاوسەرگیریەکەیان دەکەونە دنیایەك لە کێشەی قوڵ و سەختەوە کە ناتوانن چارەسەریان بکەن، یان خۆیانی لیّ دەرباز بکەن، چونکە بنەمای هاوسەرگیریەکەیان لەسەر بنەما و ئەساسی ئاڵتون و حەفلە و سەیارە و خانوو بوو، نەك عەقڵ و ڕەوشت و شیاوی و شەخصیەت.

ئەم ڕەفتارەی کچان گرفتی گەورەی بۆ کوڕانیش دروست کردووە، وای لە زۆرێکیان کردووە کە نەتوانن هەنگاو بنێن بۆ هاوسەرگیری، بەهۆی ئەو داخوازیە ماددیە زۆرانەی کچانەوە، زۆرێکی تریشیان ترسێکی گەورەیان لە هاوسەرگیری بۆ دروست بووە و، وادەزانن تەواوی کچان ماددی و ڕووکەشین و ئەمەش ژیانی

هاوسەرداری کوڕان دەخاتە مەترسیەوە، هەندێکی تریشیان کە کچێکی باشی بیرفراوانی، ئاسانکاری، ڕەوشت بەرزیان دەست دەکەوێت، هەست بە ئیحراجی دەکەن کە وەك هاوتەمەنەکانی ناتوانن پێداویستیەکانی بۆ دابین بکەن. لە هەموو بارەکاندا بیانووە ماددیەکانی کچان و ئەو تێڕوانینە ڕوکەشی و مادییەی بۆ ژیان و هاوسەر و هاوسەرگیری هەیانە، بەلایەکی گەورەیە بۆ سەر کچان خۆیانەوە، دواتر بەسەر کوڕان و سەرجەم کۆمەڵگاوە. کەواتە: باشترە بۆ کچان ژیرانە بیربکەنەوە و بەدوای ژیانێکی ئاسودە و کامەراندا بگەڕێن، نەك هەموو عەقڵ و ئاسودەیی و ژیانیان ببەستن بە ئاڵتون و ماددە و ڕوکەشیەکانی تری ژیانەوە. خۆ ئەگەر وانەکەن زۆربەیان بێ هاوسەر دەمێننەوە. {داهێنان، ژ: ٢٣٩، ل١٩}.

## لە حیکمەتی مارەیی تێبگەن:

واچاکە کچانی بەڕێز لە حیکمەتی مارەیی ئافرەت تێبگەن، کە مارەیی ئافرەت و حیکمەتی پێویست بوونی بۆ ئافرەت، تەنها ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستی و حەقیقەتەیە کە ئەو مارەکردنە (عقد)ە، شتێکی گەورەیە و بەڵێنێکی گرنگە، ئەگەر نامارەیی وەك نرخ بۆ فرۆشراو (كَالثَّمَنِ لِلْمَبيعِ) و وەك کرێ بۆ کرێ (كَالأجر لِلْمَأْجُور) نیە، چونکە ئەگەر وابوایە، دەبوو حەتمەن چۆنیەتی و

ئەندازەکەی پێش مارەبڕینەکە بخرانایە ڕوو، وە دەبوایە نیکاح بێ ناوبردنی مارەیی دانەمەزرایە، کە بێگومان وانیە و ناونەهێنانی مارەیی لە کاتی مارە بڕیندا زیانی نیە، بەڵام دوای مارەیی هاو وێنە (مَهْرُ المِثْل) لەسەر پیاوەکە فەرز دەبێت. هەربۆیەش زانایان ناوبردن و دیاریکردنی مارەیی (مَهر) یان لەکاتی مارەکردندا تەنها بەسوننەت داناوە، بەڵێ مەسەلەی مارەیی ئافرەت پڕە لە حیکمەت و بەرژەوەندی زۆری تێدایە بۆ ئافرەت.

سەرباری ئەوەش پشتیوان (سَنَد) و دەستەبەرکەر (ضامن)ێکی زۆر باشیشە بۆ بەردەوام بوونی ماڵ و خێزان. جا نازانم ناحەزانی ئیسلام و شەریعەتی بێ هەڵە و پەڵەی خوای کاربەجێ، ئەو تێڕوانین و بۆچونە هەڵەی خۆیانیان لە کوێوە هێناوە و لەچی هەڵهێنجاوە؟ کە گوایە مارەیی ئافرەت بەکەم سەیرکردن و سوکایەتی پێکردنیەتی؟!

ئایا ئەو جۆرە کەسانە دەیانەوێ شەریعەتیش ئافرەتانی موسڵمان، بەدەردی ئافرەتە کلۆڵ و ژین تاڵەکانی ڕۆژئاوای نەفامی ببردایە، کە گەلێك جار بە پارەیەکی زۆر ئەوجا مێردیان دەست دەکەوێ!

لەو بارەیەوە ئەم قوڵە نەزیلەیە دەگێڕینەوە کە نوسەر و زانای گەورەی ئیسلامی کورد ـ خوای گەورە لێی خۆشبێت و بەشەهید قبوڵی بکات. لە سوریا بە تەقینەوە تیرۆریان کرد ـ (د. محمد

سعيد رمضان البوطي) لە کتێبەکەیدا بەناوی (المَرْأَة بَيْنَ طُغيان النِّظام الغربي و لطائف التَشريع الرَّباني، ص١٣٩) هێناویەتی و دەفەرمووێ: (خزمێکم هەیە لە ئەمریکا نیشتەجێیە و ئافرەتێکی ئەمریکی ئەو خزمەمی بە ئەندازەیەك پارە خواستبوو، کە ئەگەر لە کۆمەڵگای ئێمەدا بوایە ـ بەپێی دینەکەمان ـ دەبوایە خزمەکەمان وەك مارەیی بەوی ببەخشیایە، جا لە سەردانێکدا بۆ وولآت و شارەکەی خۆی (دیمەشق) کە چەند ڕۆژێکیان پێچوو، لەگەڵ خۆیدا ژنەکەشی هێنابوو، کاتێك ژنە ئەمریکاییەکەی بەو عادەتەی لای ئێمەی زانی کە دەبێ پیاو مەمنونی بۆ ژن دەربڕێ و مارەیی پێ بدات.. بەچپەوە داوای لە مێردەکەی کرد، کە با هیچ کەس لە خزم و کەسوکاری بەو جۆرە ژن و مێردایەتیە دروستکردنەی ئەوان نەزانێ! بۆئەوەی لە کۆمەڵگایەکدا کە ـ بەپێی قسەی ـ خۆی ئافرەتی هێندە تێدا بەڕێز و حورمەتە، هەست بە سوکایەتی و کەمی نەکات !).



## پێویستە لە مەسەلەی مارەییدا ئاگاداری ئەم خاڵانە بین:

**یەکەم:** هەرچەندە شەریعەتی ئیسلامی لە مەسەلەی مارەییدا نە بەلای زۆریی (كَثْرَة) دا و نەبەلای کەمی (قِلّة)دا، سنوری بۆ

مارەیی دانەناوە، بێگومان ئەمەش حیکمەتی زۆری تێدا هەیە، کە یەکیان ئەوەیە موسڵمان بە گوێرەی هەل و مەرجی ژیان و گوزەرانیان، وە بەپێی حاڵ و باڵی ماددیی زاوا، بوارێکی فراوانیان هەبێ بۆ هەڵسوکەوت تێدا کردنی ئەو مەسەلەیە، بەڵام پێویستە بزاندرێ کە شەریعەت بەگشتی حەز لە ئاسانکاری دەکات و لەوبارەیەوە و فەرمایشتی پێغەمبەری خواش ﷺ زۆرن ، بۆ نمونە:

١) (**إنَّ أَعظم النِّكاحِ بَرَكَةً أَيْسَرهُنَّ صَداقاً**) رَواهُ البَيهَقي وَ أحمد. واتە: هەر ژنهێنانێك مارەیی ئاسانتربێت بەرەکەتی گەورەترە...

٢) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**مِنْ يُمْنِ المَرْأَةِ أَنْ تَتَيَسَّرَ خِطْبَتُها، وَ أَنْ يَتَيَسَّرَ صَداقُها**) رَواهُ البيهقي.

واتە: لە فەڕ و بەرەکەتی ئافرەت، ئاسانی خوازبێنی و ئاسانی مارەیی یەکەیەتی.

٣) ئیمامی عومەر فەرموویەتی: (**ألا لاتُغالوا صَداقة النِّساءِ**) رَواهُ الترمذي. واتە: ئاگاداربن لە مارەیی ژناندا زیادە ڕۆیی مەکەن.

**دووەم:** بۆیە شەریعەت ڕێگاشی داوە کە ئافرەتان مارەیی زۆر وەربگرن، چونکە بێگومان پیاوانیش هەموویان لەیەك ئاستی ئیمانی و ئەخلاقی و جوامێریدا نین و، جێی خۆیەتی کە ئافرەتی

موسڵمان لەکاتی دڵنیا و مسۆگەر نەبوونیدا، لە کەسایەتی ئەو پیاوەی کە داخوازی دەکات لەبواری ئەندازەیی مارەییدا، دوربینی (إحتیاط)ی خۆی بکات. وەك چۆن جێی خۆیەتی کە لەکاتی قەناعەت هاتنی و دڵنیابوونی لەکەسایەتی دیندارانە و، ڕەوشت بەرزانە و جوامێرانەی ئەو پیاوەی کە دەیەوێ بیخوازێ، مەسەلەی نەداری کابرا و پێ هەڵنەسوڕانی مەصرەف و مارەیی زۆر و قورس لەبەردەم خۆیدا نەکاتە کۆسپ و لەمپەڕ، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**إذا خَطَبَ إلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دينَهُ وَ خُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ**...) رَواهُ الترمذي. واتە: هەر کات کەسێك کە لە ئاین و ڕەوشتی ڕازین داخوازیی ئافرەتی لێکردن، ئافرەتی پێبدەن.

**سێهەم:** گومانی تێدا نیە کە مارەیی: تەنها و تەنها موڵك و مافی ئافرەت خۆیەتی و بێجگە لە خۆی، هیچ کەس بۆی نیە بەهیچ جۆرێك هەڵسوکەوت (تصرف)ی تێدا بکات. نە مێرد، نە باوك، نە دایك، نەبرا، نە هیچ کەس. خوای دادگەر لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ نِحْلَةً ۚ فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَىْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا ﴿٤﴾﴾ النِّساء.

واتە: وەك دیاریەك مارەییەکان بدەنە ئافرەت، جائەگەر خۆیان بەدڵخۆشیەوە شتێکیان لێ بەخشی بە ئێوە، ئەوە بیخۆن بە

دڵنیاییەوە نۆشی گیانتان بێ). {ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا، ل٢٢٥ وە ل٢٣٢}.

روونکردنەوەیەك: ئاینی ئیسلام و شەریعەتە پڕ خێر و بەرەکەتەکەی هەروەکو لەبواری بنەماکانی بواری هاوسەرگیریدا داوای ئەوەی کردووە کە ئاسانکاری بۆ هاوسەرگیری گەنجان بکرێ، بۆئەوەی لەتەمەنی زێڕینی لاوێتی نەچینە سەرەوە و، لەکاتی خۆیدا بەهاوسەری حەلاڵی خۆیان بگەن. لەبواری کرداریشدا لەسەر دەستی هەڵگرانی زۆر وێنەی جوانی نیشان داوین و، نمونەی زۆر باڵای پێشکەش کردوین، لەسەر ئاسانکاری لەبواری هاوسەرگیریدا.. بەتایبەت بۆ ئەوانەی کێشەی بواری دارایی و ماڵیان هەیە..

ئاسانکاریەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوسەرگیری:

ئەوە پێغەمبەری پێشەوا و سەروەر ﷺ کە ئامادەی هاوسەرگیری کوڕ و کچێکە، کە کوڕەکە هەژار و نەدارە، وە مارەییەکەی هیچ ماڵی دونیا و پارە و ئاڵتون نی یە، بەڵکو تەنها لەسەر قورئانی پڕ بەرەکەت و بەخشش شووی پێدەکات. ئەم بەسەرهاتەش پێشەوای فەرمووده (ئیمامی بوخاری) لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی، وە ناونیشانی تایبەتی بۆ ئەم بەشە داناوە بەناوی: (بەشی هاوسەرگیری و ژن و مارە بڕین لەسەر قورئان و بەبێ بوونی مارەیی ـ باب التزويج على القرآن وَ بِغَيْرِ

صِداق). ئەمەش دەقی بەسەرهاتەکەیە کە فەرموودەکە: (متفق علیة: بُخاري ٥١٤٩، وَ مُسْلِم: (١٤٢٥):

سەهلی کوڕی مەعدی ساعیدی فەرمووی: ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هاتووم تاخۆم ببەخشم بەتۆ..

پێغەمبەری خوایش ﷺ سەرتاپا تەماشای کرد و ئینجا سەری دانەواند و هیچ قسەی نەکرد، ژنەکەش کەڕوانی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی لەوبارەیەوە نەگوت، لە شوێنێك دانیشت. جاپیاوێك ـ کە لەیارانی حەزرەت بوو ـ هەڵسا و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ناتەوێ لە منی مارە بکە..

فەرمووی: ئایا هیچت هەیە بیکەی بە مارەیی؟!

فەرمووی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ..

فەرمووی: دەبڕۆ بۆماڵەوە بۆلای کەسوکارت بزانە هیچت دەست دەکەوێ، پیاوەکە ڕۆیشت و هاتەوە و وتی: بەخوا هیچم دەست نەکەوت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شتێك هەر پەیدا بکە ئەگەر ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێ، پیاوەکە دیسان ڕۆشتەوە و هاتەوە و فەرمووی: بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەی ئاسنیشم دەست نەکەوت، بەلاّم ئەم لۆجلکەم (پارچە جلو بەرگەم هەیە ـ وەکو عابایەك ـ نیوەی بۆ من و نیوەی بۆ ئەو !!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە بەو چی، جلەکەت خۆی یەك پارچەیە، ئەگەر لەبەر تۆدا بێ هیچی بەر ئەو ناکەوێ، ئەگەر لەبەر ئەودا بێ هیچی بەر تۆ ناکەوێ. جا پیاوەکە تاوێکی باش دانیشت، لەپاشا هەڵسا ڕۆشت، پێغەمبەر ﷺ چاوی لێبوو، ناردی بەشوێنیدا بانگی کردەوە..

کەهات پێی فەرموو: چیت لە قورئان لەبەرە؟

فەرمووی: ئەو سورەتە و ئەو سورەتەم لەبەرە، وە سورەتەکانی ژمارد..

فەرمووی: ئایا هەموویان بەباشی دەخوێنی؟ فەرمووی: بەڵێ.

فەرمووی: (**إذهَبْ فَقَدْ أنْكَحْتُكَها بِما مَعَكَ مِنَ القُرْآن**). واتە: دەبڕۆ ئەوا لەسەر ئەو قورئانەی کەلەبەرتە ئەم ژنەم کرد بە هی تۆ. لە ڕیوایەتێکدا: (**زَوَّجْتُكَها بِما مَعَكَ مِنَ القُرْآن**). ئەوا لەسەر ئەوەی کەفێری ئەو قورئانەی بکەی کە خۆت ئێستا لەبەرتە ئەم ژنەم مارەکرد لەتۆ. {تاج الأُصول ب٢ ل٤٩٢ } {مَواقِف إِيمانِيَّة ص٤٨٥}

لەم فەرموودەیەوە دوو شتی گرنگ بەرچاو دەکەون:

١) ئازادی و سەربەستی و ڕوکرانەوەی ئافرەتی موسڵمان کە زۆر ئازایانە، بەحەیاوحورمەتەوە هاتووە داوای ئەوەی کردووە کە ژیانی هاوسەرگیری بکات، لە جیاتی ئەوەی پەنا ببات بۆ کاری ناشەرعی و خراپەکاری بۆ ئارەزووەکانی، هاتووە بە ئاشکرا

لەبەرچاوی جەماوەردا داوای خۆی پێشکەش دەکات، کە پێویستی بە هاوسەرگیریە، داوا لە گەورەی هەموو مرۆڤایەتی پێغەمبەری ئیسلام ـ محمد ـ ﷺ دەکات بۆ ئەم بابەتە. ئەویش کە پێویستی بە هاوسەرگیری نەبووە، بەقسە ڕەتی نەکردۆتەوە ـ ئەمە ڕێزی پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆ ئافرەت ـ بەڵکو بەبێ دەنگ بونی وەڵامی داوەتەوە. لێرەدا کوڕێکیش هەیە کە زۆر پێویستی بە هاوسەرگیریە. ئەو داوای مافی خۆی دەکات و، پێغەمبەری خوا ﷺ بەیەکیان دەگەیەنێت.

کە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، دڵ پیسی و بەدگومانی لەناو صەحابەکاندا یان هەر نەبووە، یان زۆر دەگمەن بووە، ئەوەتا ئەم کوڕە ناڵێ، تازە ئەو ئافرەتە ویستی شوو بە پێغەمبەری خوا بکات. تازە من چۆن دەمەوێت، نەخێر، ئەگەر ئەو پێویستی نەبوو، من هاوسەرگیری لەگەڵ دەکەم!

وە لێرەدا ڕۆشنبیری جەماوەری موسڵمانمان بۆ دەردەکەوێ کە لەو زەمەنەدا، کەس ڕەخنەی لەم هاوسەرگیریە نەگرت و کەس بەو ژنەی نەوت: چۆن حەیای لێ هەڵگیراوە. نەخێر زۆر بە مافێکی ئاسایی کەسی ئەو تەماشایان کرد و پیرۆزباییان لێکردن ئەم هاوسەرگیریە، نەك بە مایەی نەنگ و عەیبە تەماشا نەکراو پەردەپۆش نەکرا، بەڵکو بووە جێگەی ئەوەی کە خەڵکانی تر چاوی لێ بکەن و کەدەرفەتی هاوسەرگیری هاتە پێشەوە لە

دەستی نەدەن.. ئیمامی بوخاری و موسلیم لەبابی (نکاح)دا، بەشی تایبەتیان بۆ داناوە!

٢) لەم فەرموودەیەوە تێدەگەین کە دەکرێ، مارەیی ئافرەت و بنەمای هاوسەرگیری داهێنانی نوێی تێدا بکرێ... بۆ نمونە ئەمڕۆ کوڕێك لەگەڵ کچێکدا هاوسەرگیری بکات، کە کچەکە بەهۆی بارودۆخی هەژاری یان شتێکی تر خوێندنی زانکۆ یان پەیمانگای بۆ تەواو نەکراوە، ئەم کوڕە بڕیاری ئەوە بدات کە هاوکار و یارمەتی دەری بێت، لە ڕووی ماددی و مەعنەویەوە کە خوێندنەکەی تەواو بکات و لەسەر ئەو بنەمایە هاوسەرگیری بکەن.. ئەمەش هەمووی گەورەیی ئیسلام و کرانەوەی و بڕوای بە ئازادی مرۆڤ دەردەخات، کە ئەو پەڕی خۆشبەختی و سەرفرازی و پێشکەوتن لەئیسلام و شەریعەتەکەیدایە و بۆ هەموو سەردەم و بارودۆخێکی نوێ، حوکمی تازەی لێ وەردەگیرێ و مرۆڤ بە گشتی و کوڕ و کچە گەنجەکان بە تایبەتی پێی بەختەوەردەبن.

بەڵێ ئەوەی باسمانکرد یەکێ بوو لەو هۆکارانەی کە هاوسەرگیری گەنجانمانی پێداوا دەکەوێ، وە خەتای خۆیانی تێدایە و چارەسەری بەدەست خۆیان و بڕیاری ئازایانەی خۆیانە.

ئەمجا دەچینەوە سەر بنچینەی وانەکەمان و بەگەنجان دەڵێین بە تایبەتی ئەو کوڕ و کچانەی کە کەمێ هاوسەرگیریان دوا

کەوتووە، یان چەند جارێ نزیکی پێکهاتن هاتووە و هەڵوەشاوەتەوە. پێیان دەڵێین: لەخوا غافڵ مەبە و خۆت ڕەشبین مەکە، نەکەی قسەی کەسانێکی ناحاڵی وات لێبکەن کە وابزانی گوایە بەخت و شانست بکەیتەوە، نەخێر، نەچی پەنا بۆ ئەم ناشەرعیانە ببەی، لەبەرئەوەی دڵنیابە کەس بێ بەخت و چارە ڕەش نیە. وەکەس ناتوانێ بەختی کەس ببەستێ و دەرگای ژنهێنانی یان شوکردنی لێ دابخات، یان بۆی بکاتەوە، تۆ وەرە تەنها و تەنها ڕوو لەو ـ الله ـ یە بکە، کە هەموو بڕیارێك لەلای ئەوە و هەرچی ئەو بڕیاری لێ دابێ بەکەس ڕەت ناکرێتەوە و هەرچی ئەویش بڕیاری لەسەر نەدابێ ـ بە حیکمەت و کاربەجێی خۆی و بۆ بەرژەوەندی داهاتووی تۆ کەس ناتوانێ جێبەجێی بکات. لەبەرئەوە تەنها پشت بەخوا ببەستە و دڵنیابە ﴿ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ﴾ الطلاق:٣.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرموویەتی: **(وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَو اجْتَمَعَتْ عَلى أَنْ يَنْفَعوكَ بِشَيءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إلاّ بِشَيءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ، وَ إِنْ اجْتَمَعوا عَلى أَنْ يَضُرُّكَ بِشَيءٍ لَمْ يَضرُوكَ إلاّ بِشَيءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ). رَواهُ الترمذي وَقالَ: حَديثٌ حَسَنٌ صَحيحٌ.**

واتە: بزانە و دڵنیابە، ئەگەر تەواوی ئوممەت کۆببنەوە و هەموویان پشتی یەکتری بگرن و لە هەوڵی ئەوەدابن سودێکت پێ بگەیەنن، ناتوانن هیچ سود و کەڵکێکت پێ بگەیەنن تەنها ئەوە نەبێ کە پێشتر خوای پەروەردگار بۆی بڕیار داوی، وە ئەگەر هەمووشیان کۆببنەوە و کۆمەکی و هاوکاری یەکتری بکەن بۆئەوەی تووشی زەرەر و زیانێکت بکەن، ناتوانن هیچ زەرەر و زیانێکت پێ بگەیەنن ئەوە نەبێ کە پێشتر خوای پەروەردگار لەسەری نوسیوی.

بەڵێ، ئەمە بیروباوەڕی مرۆڤی موسڵمانە و ئیتر نابێ بڕوای بەبەخت بەستن و بەخت کردنەوە هەبێ و بەمانە خۆی توشی گرێی دەرونی بکات و، هەمیشە لەکاتی بڕیاردان لە هاوسەرگیری ترس و قەلەقی و دڵەڕاوکێی هەبێ و، ئەگەر نەگونجا و سەری نەگرت خۆی بەبێ بەخت بزانێ، کە ئەمە وادەکات توشی ڕەشبینی دەکات و هەر کارێکیش بە دوو دڵی و ترسەوە ویستت ئەنجامی بدەی، زۆر بە زەحمەت ئەنجام دەدرێ و لەمپەڕ و کۆسپی تێدەکەوێ. چونکە خۆت چاوەڕێی ئەوەبووی.

**بەسەرهاتێك:**

بانگخواز (د. محمد عبدالرَّحمن العریفی) دەفەرمووێت: جارێکیان کچێك پێی وتم کەوا سیحر و جادوی لێکراوە، لەسەر ئەوەی کە

قەت دەروی شوکردنی لیّ نەکرێتەوە. منیش پێم وت: ئەتوانم چارەسەری کێشەکەت بکەم. بەڵام ئایا ئەتوانی صەبر و ئارام بگریت؟! وتی: بەڵیّ ئەتوانم صەبر و ئارام بگرم.

وتم: سوێند بەخوا ئەگەر ئەو چارەسەرەی پێت ئەڵێم بەباشی بیکەیت، ئەوا پشت بەخوا دەرگای هاوسەرگیریت لیّ دەکرێتەوە هەرچەندە ئەگەر ئەو جادوەشت لێکرابێت.

وتی: کامەیە چارەسەرەکەی.

وتم: بڵیّ: (**حَسْبِيَ اللهُ وَ نِعْمَ الوَكيل**). هەموو کات دووبارەی بکەوە بەیەقین و بڕواوە. شێخ عورەیفی فەرمووی: سوێند بەخوا پاش مانگێك کچەکە پێی وتم: موژدە بێت خوای گەورە دەروی لێکردمەوە و بەم نزیکانە هاوسەرگیری دەکەم. سوێند بەخوا ئێستاش هەر ئەو ویردە دووبارە دەکەمەوە.. بەڵیّ (**حَسْبِيَ اللهُ وَ نِعْمَ الوَكيل**) ئەم ویردە نامەیەکە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دەروی خێری لیّ داخراوە: (خەفەتبار، لێقەوماو، ستەملێکراو، نەخۆش، نەزۆك، دیل). {ڕۆژنامەی باسك، ژ: ٥٠٩}.



**ئەی ئەو کوڕ و کچەی کە هاوسەرگیریت دواکەوتووە، هەمیشە گەشبینبە و بزانە ڕەحمی خوا یەگجار فراوانە، لەخوا غافڵ مەبە و دووشت بکە:**

یەکەم: داوێن پاکیت بپارێزە، نیازی داوێن پیسی و خراپە نەکەی.

دووەم: یارمەتی هەژار و داماوان بدە، حەرام مەخۆ، پەنا بۆ کارێك مەبە کە خوا پێی ڕازی نیە. جا دڵنیابە لەو کاتەدا کە دنیا و دەرگاکانی بەسەرتا دادەخرێ، ئالەو کاتەدا دەرگات لێ دەکرێتەوە. چونکە لە ئەو پەڕی تاریکی شەودا، ڕۆژ هەڵدێ. بۆ ڕاستی ئەم قسەیەش، تەماشای قورئانی پیرۆز و پڕ بەرەکەت بکەن. لەباسی پێغەمبەر (موسا)دا، سەلامی خوای لێبێت.

## هاوسەرگیری حەزرەتی موسا، هیوابەخشە بۆ هەژاران!

تەماشاکەن: موسا گەنجێکە، لە بنەماڵەیەکی هەژارە، بێ پارەیە، بێ پشت و پەنا و قەوم و هۆزە، کەسێکی بەقەدەری خوا، بەناویست لەدەست کوژراوە، فەرمانی لەلایەن پیسترین و دڵڕەقترین دیکتاتۆر و ستەمکارەوە کە فیرعەونی میصرە بۆ دەرچووە کە بگیرێ و بکوژرێتەوە.

لەترسان، لەبەر بێ پشتی و بێ پەنایی بەدزیەوە، بەترسەوە، شاری خۆی، وڵاتی خۆی، دایك و برا و خوشکی خۆی، بەجێهێشتووە و تەواوی هێزە ئەمنیەکانی فیرعەون بەشوێنیدا دەگەڕێن. هەموو هاوتەمەنەکانی موسا ژنیان هەیە و ئەم هێشتا هاوسەرگیری بۆ نەکراوە. بە عەقڵی مرۆڤ بێ، ئەگەر واقیع بینانە

بڕوانێتە ژیان و بارودۆخی موسای لاو لەم ساتە وەختەدا کە گیانی لە ژێر هەڕەشە و مەترسی کوشتندایە، دەبێ ماوەیەکی زۆری تر بێ هاوسەر و ماڵ و حاڵ بمێنێتەوە.

بەڵام موسای گەنجی مەردی خۆڕاگر، هیچ کات بیری لەخراپە نەکردوە و نەگەڕا لەدوای ئەوەی کە حەزەکانی بە حەرام تێربکات. بەتایبەتی لەو کاتەدا کە لە وڵاتی غەریبی (مەدیەن)ە، و کەس نایناسێ و دەرفەتی بۆ هەڵدەکەوێ و دوو کچی جوانی گەنج پێویستیان بە هاوکاری ئەم هەیە، وە باوك و برا و کەسوکاریان لەگەڵ نیە و تەنها خۆیان و مەڕ و ماڵاتەکەیانن. بەڵام موسای گەنج و لاو تەماشای نەکردن. نەزەری لێ نەکردن، داوای پەیوەندی لێ نەکردن، بەڵکو بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەڵسا و مەڕەکانی بۆ ئاودان و بەڕێی کردن و داوای هاوکاری و پاداشت و ڕێنمایی لێ نەکردن، خۆی پێ نەناساندن..

پەنای خۆی بردە بەر خوا و بەکوڵ و بەدڵ لەخوا پاڕایەوە کە لەم مەینەتیەی تێیدایە لە: هەژاری، دەربەدەری، بێ کەسی، غەریبی، بێ ماڵ و حاڵی، ترس و لەرزی دوژمن، دەرگای ڕەحمەتی لێ بکاتەوە و ڕزگاری بکات و فەرمووی: ﴿رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ ﴿٢٤﴾﴾ القصص.

واتە: دوای ئەوەی موسا ئازایانە ماڵاتەکەیانی برد و تێرئاوی کردن و بەڕێی کردن، ئەمجا چوە بن سێبەری درەختێکەوە و هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەستەکانی بەرزکردەوە و فەرمووی: پەروەردگارا تۆ خێر و بێری زۆرت پێبەخشیوم، بەڵام ئاتاجی زیاترم، هێشتا هەژارم..

**لەم بەسەرهاتەدا تا ئێرە، دوو شتی جێگەی تێڕامان هەیە:**

یەکەم: موسا پێغەمبەر ـ سەلامی خوای لەسەر بێت ـ لەگەڵ ئەو هەموو مەینەتیەی بەسەری هاتووە لەم تەنگانە گەورەدا، ناشکوری ناکات و شکوای حاڵی خۆی بە شێوازێك دەرنابڕێ کە لە مرۆڤی ئیماندار نەوەشێتەوە ـ هێشتا موسا ئاشنا نەبووە بە وەحی خوایی ـ بەڵکو لەجیاتی ئەوەی بڵێ:

خوایە ئەوە چی بوو من لێم بەسەرهات؟!، خوا قەت خۆشیم نەدی، خوایە دەبێ تاکەی ئاوارە و بێ لانەبم..

نەخێر، ئەمانەی هیچی نەوت. بەڵکو سەرەتا ستایشی خوای کرد و فەرمووی: خوایە تۆ خێر و بێری زۆرت پێ بەخشیوم. بەڵام هێشتا موحتاجی زیاترم، هێشتا هەژارم بۆ ڕەحمەتی تۆ.. بەڵێ مرۆڤی ئیماندار دەبێ بەم شێوەیە لەخوای خۆی بپاڕێتەوە و بەئەدەبەوە داوا لەخوا بکات..

دووەم: موسا ـ سەلامی خوای لێبێت ـ کاتێ کە قسەی لەگەڵ دوو کچەکە کرد، ووشەیەکی زۆر بەجێ و جوانی بەکارهێنا، کە بەڕاستی ووشەکانی قورئان هەمووی لە شوێنی تایبەتی خۆیاندان و هەر ووشەیەکی قورئان مانا و مەبەستێکی تایبەتی ئاشکرا و نهێنی لەناو خۆیدا هەڵگرتووە. مانایەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ دەبەخشێ. بە شێوەیەك ئەگەر ئەم ووشەیە لا ببرێ و ووشەیەکی هاو مانای دابنرێ.. ناتوانێ ئەو مەبەستە بگەیەنێ کە ووشە قورئانیەکە گەیاندویەتی. هەروەکو موسا بە دوو کچەکەی فەرموو: ﴿خَطْبُكُمَا﴾.

سەرنج بدەن موسا نەیفەرموو: (**ما شَأْنُكُما**) وە نەیفەرموو: (**مابالُكُما**) کە نزیکن لە مانای ﴿خَطْبُكُمَا﴾ بەڵکو فەرمووی: ﴿خَطْبُكُمَا﴾. واتە: کێشەتان چیە و بۆچی ئاوا دورە پەرێز وەستاون و ناهێڵن ئاژەڵەکانتان بچنە سەر ئاوەکە؟!

لێرەدا (د. محمد الكُبيسي) دەفەرمووێ: (**الخَطبُ: لِلْمَأزَق، المُسْتَعْلِن، أي المشكلة أَوْ الواقِعَة السلْبِيَّة الَّتي لا تَخْفى، وَلا مانِعَ لَدى صاحِبِها مِنْ تَقْديم إيضاحٍ لِلْسّائِلِ عَنْها، فَموسى يَسْألُ الفتاتَين عَنِ السّبَبِ الّذي مِنْ أَجْلِهِ تذودانِ قطيعَهُما عَنِ الماءِ ولا تسقيانِهِ، وَهذا ظاهر مُستعلِن مِنْ حالِهِما، وَلا**

**يَسْألُهُما عَنْ سَبَبِ خُروُجِهِما لِلْسَقي، وَ هُوَ مالَوْ شاءَ تا لَأخفَتاهُ)** {مِنْ أنْباءِ القُرى، ص٣٩٩}.

بەڵێ ئەمە ڕەوشتی گەنجی ئیمانداره، چاکەی لەگەڵ کردن و درێژەی نەدا بە قسەکردن لەگەڵیان و نەیگوت: ئەرێ ئەوە بۆچی باوکێ، برایەکتان لەگەڵ نیە، ئەرێ هەموو ڕۆژێ هەر ئاوا ئاویان دەدەن؟ نەخێر موسا بەم چاکە و پیاوەتی و مەردایەتیەی مەبەستی چێژ وەرگرتن نەبوو لە کچان، کە لە کەسایەتی موسڵمان ناوەشێتەوە. بەڵکو تەنها هۆکاری ئەوەی لێ پرسین: کە بۆچی مەڕەکەیان ئاو نادەن و دووری دەخەنەوە لەم خەڵکە؟

کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە گرفتێك هەیە. وە ئەم لاوە بە هەستە، مەردە، کە موسایە هەستی پێ کردووە و نابێ لە ئاستی دا خۆی بێ خەبەر بکات. وە کە گرفتەکەش بۆ دوو کچەکە چاك دەکات. ئیتر هیچیان لەگەڵ ناڵێ و ئەگەر خۆیان حەزیان نەکردایە بۆی باسبکەن کە باوکیان پیر و بێ توانایە، موسا لێی نەدەپرسین. بەڵام ئەگەر بیفەرموایە: **(ما شَأْنُكما)** یان **(مابالُكُما)**، ئەوە دەبوایە کچەکان تەواوی بەسەرهاتی خۆیان بۆ بگێڕایەوە.

بەڵێ موسای داوێن پاکی ڕەوشت بەرز، لە وڵاتی غەریبەدا توشی بوو بە دوو کچی داوێن پاکی بە ئەخلاقی ڕەوشت بەرز، کە

ئەوەندە بە حەیاو حورمەتن نایانەوێ تێکەڵاوی پیاوانی شوان ببن و، کەسایەتیان بکەوێتە ژێر پرسیارەوە! کچێکیان ئەو گەنجەی دۆزیەوە کە ساڵانێك بوو ببێ بە هاوسەری ﴿ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ﴾، بۆیە بە ناواخنی قسە بەباوکی گوت کوڕێکی ئاوا هەیە و ئەویش ناردی بە شوێنیا و، بەسەرهاتەکە لە قورئاندا لە سورەتی (القصص) ئایەتی: (٢٣ — ٢٨)، بە درێژی و بەڕوونی باسکراوە..

ئەوەی ئێمە مەبەستمانە و بابەتی وانەکەمانە، ئەوەیەکە: موسای لاو، کە لەڕواڵەتدا هەموو دەرگاکانی لێ داخرابوون، کەچی لەیەك کاتدا چەندین دەرگای بەختەوەری بەڕوودا کرایەوە، کچێکی بەحەیا و شەرم و ماڵدار و کابان و دڵسۆز، لەناو ئەو هەموو کوڕە گەنجە، دەوڵەمەندە، هاوشاری و هاوزمان و هاوولاتیەی خۆیدا، دڵی دەچێتە سەر ئەم کوڕە، غەریبە، ئاوارە، بێ کەسە، هەژارە، بێ ماڵە، بێ حاڵە..

خوای گەورە دڵی باوکی کچەکەی بۆ نەرم دەکا و یەکسەر ڕازی دەبێ... خۆ خانووی نیە، باوکی کچەکە خۆی داوای لێ دەکات لە ماڵی ئەواندا بمێنێتەوە و شوانیان بێ. ئەمجا کاسپی و ئیشی نیە. یەکسەر عەقدی ئیشکردنی دێتە بەردەست و بۆماوەی (هەشت) ساڵ، ئیشی بەردەوامی دەبێت، باوکی کچەکە کە دەبێتە خەزوری خۆی داوای لێدەکات کە ماوەی هەشت بۆ دەساڵ لەلای بمێنێتەوە

و شوانی بۆ بکات. نەك وەکو شوانی خەڵکی بەڵکو وەکو خاوەن ماڵ و کوڕی ماڵ و خاوەن مەڕ و ماڵات شوانی بکات. {رِحلَةٌ لِلسَّعادَة، عمرو خالد}.

مامۆستای بانگخواز (د. محمد الكُبَيسي) زۆر بە جوانی ئەمە تۆمار دەکات و دەفەرمووێ: (**وَهكذَا دَخَلَ موسَى بَيْتَ شَيْخَ مَدْيَن، خائِفاً فَآمَنَ، وَ جائِعاً فَشَبِعَ، وَ ضائِعاً فَوَجَدَ المَأوى، وَفَرْداً فَتَزَوَّجَ، وَفَقيراً فاغْتَنى**).{مِنْ أنباءِ القُرى. د. محمد الكُبيسى، ص:٤٠٠}.

**بەڕاستی قورئان کورت و پڕ مانایە! هەرگیز مرۆڤ ناتوانێ شتی ئاوا بڵێ!!**

لێرەدا بابەتێکی زۆر گرنگ و جوان هەیە، کە پێویستە بوترێ ئەویش ئەوەیە: لەم باسەی هاوسەرگیری موسادا ـ سەلامی خوای لێبێ ـ کە خوای پەروەردگار لە سورەتی(القصص) دا بۆی باسکردوین، بەتایبەتی کە دەفەرمووێ: ﴿قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ﴾ القصص: ٢٧.

لەم ئایەتەدا چەند حوکمی شەرعی زۆر گرنگ وەردەگیرێن کە تایبەتن بە بواری هاوسەرگیری وەکو:

١) هەر کات باوك زانی کچەکەی کەسێکی شیاوی بۆ هاتۆتە پێش، پەلە بکات لە بەشودانی و ڕەتی نەکاتەوە.

٢) باوك، یان برا، یان سەرپەرشتیاری کچ، بەلایەوە ئاسایی بێ کە کچەکەی، یان خوشکەکەی خۆی دەست نیشانی کەسێکی کردووە و بەدڵیەتی و دەیەوێ شووی پێ بکات. مادام ئەم کوڕە، بە ئەخلاقە، کاسبە، بەتوانایە، ئەمینە (وەکو کچەکە لە موسادا ئەمەی بینی)، وەرگێڕی لێ نەکات و خۆی کار ئاسانی بۆ بکات. تەنانەت هیچ عەیب و کەم و کورتی نیە، باوکەکە خۆی کچەکەی پێشکەش بە کوڕەکە بکات و هاوسەرگیریەکەیان بۆ ڕێکبخات وماڵیان بۆ ئامادەبکات و، کاروپیشە بۆ کوڕەکەی بدۆزێتەوە و بیهێنێتە لای خۆی کاری پێبکات، وەکو کوڕی ماڵی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکات نەك وەکو زاوا. خوای گەورە هەڵوێستی ئەم باوکەی ڕێز لێگرتووە و لە قورئاندا تۆماری کردووە، ئیتر بەهانەی پێ نەگرێ بڵێ ئاخر ئەم کوڕە غەریبە و لە شارێکی ترە و خۆ خزممان نی یە و باوکی ناناسم و شەهادەی نی یە..!!

٣) هەر کات کچ وەختی بەشودانی هات و خۆی کەسێکی بەدڵ بوو، یان کەسێکی شیاو هاتە خوازبێنی، نابێ ئەم هاوسەرگیریە داوبخرێ و بەناوی ئەوەی کە ماڵی باوکی کچەکە ئیشیان بە کچەکەیانە و بێ کابان دەبن، یان جارێ دەخوێنێ ـ بەتایبەتی

ئەگەر لە قۆناغی زانکۆ بوو، وە لە ساڵی سێهەم و چوارەمدا بوو ـ، بەڵکو هاوسەرگیری کچەکەیان لەپێش هەموو شتێکەوەیە و نابێ بکرێ بە قوربانی شتی تر، کەدواتر هەلی هاوسەرگیری ئاوا باشی بۆ نەڕەخسێتەوە.

٤) وە لەم بەسەرهاتەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە دەبێ ڕێگە بدرێ کوڕی داخوازیکار، کچی داخوازی کراو ببینێ و بەیەکەوە دابنیشن و قسە لەسەر ژیانی داهاتوویان بکەن و ڕەچاوی ئادابی شەرع و دابونەریتی ڕەسەنی کۆمەڵایەتیان بکەن.

٥) ئاسانکاری لەبواری مارەییدا بکرێ، ئەوەتا (موسا) هیچ پارە و ئاڵتونی نیە. باوکی کچەکە لە جیاتی ئەوە شوانی پێدەکات. کە لەمڕۆدا وەکو پارەیەك وایە کە بەقەرز بدرێ بە کەسێك و پاشان بەمانگانە بە قیست لێی وەربگرێتەوە. کە مانای هاوکاری و ئاسانکاری دەگەیەنێ.

٦) مارەیی مەرج نیە هەر پارە و ئاڵتون و شتی ماددی بێ. بەڵکو دەتوانرێ کارێك بێ، لەمڕۆدا دەتوانرێ باوکێك بە زاواکەی بڵێ: وا کچەکەی خۆمم لێ مارە کردی لەسەرئەوەی کە فێری قورئانی بکەی. یان فێری زانستی کۆمپیوتەری بکەی، یان فێری فلان زانستی نوێی بکەی. ئەمانە هەمووی دەکرێنە مارەیی و ڕاستگۆیی کوڕەکەیان بەرامبەر کچەکە تێیدا دەردەکەوێ.

٧) سەرەڕای هەموو ئەمانەی کە باسمان کردن لە ئەو ئەحکامانەی تایبەتمەندبوون بە بواری هاوسەرگیری. لەم بەسەرهاتەدا ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێ کە خاڵێکی گەوهەری و گرنگە لەبواری پەیوەندی نێوان پیاو و ژن لە ئیسلامدا، ئەویش ئەوەیە:

نابێ کاتێك کوڕێکی دینداری بە تەقوای ڕەوشت بەرز کچێك دەبینێ لە تەنگانەیەکدایە و، پێویستی بە هاوکاری هەیە وە ئەم هاوکاری کردن و ڕزگارکردنی کچە لەتوانای ئەمدایە، نابێ بڵێ من لێی نزیك نابمەوە و حەقم نیە بەسەریەوە، چونکە ئەو ئافرەتە گەنجە بەمن نامەحرەمە و حەیا و حورمەت و دینداری و خۆپارێزیم ڕێگەم نادات لێی نزیك ببمەوە، بەڵکو واجبە ئاوڕی لێ بداتەوە و هاوکاری بکات و لەو تەنگانە ڕزگاری بکات، هەروەکو گەورەمان (موسا) بەرامبەر دوو کچەکە کردی کە زانی یارمەتیان پێویستە، وە دەبێ چاو لە موسا بکات لەوەدا کە پاداشتی تەنها لە خوا بوێ و لە حەددی پێویست زیاتر قسەیان لەگەڵ نەکات و، کام ووشەی کورتتر و پڕماناتر و گونجاوترە بۆ ئەو شوێنە و کاتە ئەوە هەڵبژێرێ. هەروەکو لە باسی ﴿خَطْبُكُمَا﴾ لەپێشتردا ڕونمانکردەوە. {مِنْ أنباءِ القُرى. د. محمد الكُبيسى ص٤٠٣}.



## باخەوانێکی هەژارو هاوسەرێکی دەوڵەمەند <بەسەرهات>

کۆتایی وانەکەمان بەم بابەتە سەرنج ڕاکێش و موژدە بەخشە دێنین کە بەسەرهاتی هاوسەرگیری لاوێکی ڕەوشت بەرزی واریعی حەلاڵ خۆرە:

لە زەمانی زوودا کە دەوڵەمەندەکان بۆ کاروبارەکانیان خزمەتکاریان دەگرت. یەکێ لە خاوەن باخەکان، کە سەرمایەدارێکی گەورەبوو، بۆ خزمەتی باخەکەی کە باخی ڕەز و ترێ و هەنار و میوەکان بوو، چەند خزمەتکاری ڕاگرتبوون. یەکێ لە خزمەتکارەکان ناوی (موبارەك) بوو. کوڕێکی هەژاری بێ کەسوکار بوو.

کاتی خۆی لە جەنگدا بەسەر هۆزەکەیاندا درابوو، بەدیل گیرابوو، کرابووە عەبد و کۆیلە و فرۆشرابوو، دوای ماوەیەکی زۆر خۆی کڕیەوە و ئازاد بوو. ئەمجا بە خزمەتکاری کەوتە لای ئەم پیاوە دەوڵەمەندە، خاوەنی ئەم باخە، ڕۆژێکیان خاوەن باخ چەند میوانی هەبوون لە پیاوە گەورەکان و سەرمایەدارەکان.

لەکاتی قسە و باسیاندا باسی ئەوە کرا کە هەریەکەیان نەخۆشیەکی هەیە، بەڵێ دەوڵەمەند بەوە نی یە کە پارەی هەیە، بەڵام لەبەر نەخۆشی زۆر دەگمەن نەبێ سودی لێ نابینێ، لەبەرئەوە ئاواتی پێ مەخوازە!!

لەکاتی قسەکردنی ئەمانەدا باسی سودی هەناری شیرین و توێکڵەکەی ناوی کرا کە بۆ نەخۆشی بە گشتی و نەخۆشی گەدە بە تایبەتی بەسوودە، بۆیە هەر خێرا خاوەن باخ بانگی موبارەکی خزمەتکاری کرد و وتی: ئادەی ڕۆڵە برۆ چەند هەنارێکی شیرینمان بۆ بێنە. موبارەك چوو چەند هەنارێکی هێنا.. کاتێ شکاندیان سەیریان کرد ئەمانە هەناری ترشن.

خاوەن باخ بە تورەبونەوە وتی: ئەوە ڕۆڵە گەیشتویتە ئەم تەمەنە ترش و شیرین لەیەکتر جیاناکەیتەوە؟!

موبارەك وتی: ئاخر قوربان من تا ئێستا لەم هەنارانەم نەخواردووە تا بزانم کامیان شیرینە و کامیان ترشە، توێکڵەکەشیان هەروەکو یەکە!!

خاوەن باخ وتی: بۆچی تۆ هەر قەت هەنار ناخۆی و حەزی پێ ناکەی، یان بە (معیدەت)گەدەت ناکەوێ؟!

موبارەك وتی: قوربان هیچ کێشەم لەگەڵ خواردنی هەناردا نیە. وە پێشتر زۆرم خواردووە، بەڵام لەوەتی لەم باخەی جەنابتدا کاردەکەم هەنارم نەخواردووە!!

خاوەن باخ ئەمجارەیان بە سەرسوڕمانەوە پرسی: ئاخر بۆچی؟! موبارەك فەرمووی: قوربان من کە هاتمە لای جەنابت و بومە خزمەتکاری باخەکەت، تۆ پێت وتم: باخەکە بکێڵە و ئاوی بدە و بژاری بکە و میوەکان برنە و بۆ فرۆشتن و، هەندێ کاری تری

باخەوانی لەگەڵ برا خزمەتکارەکانی ترمدا لەناو ئەم باخەدا. ئیتر تۆ نەتفەرموو: لە هەنار و میوەکانیش بخۆ، منیش شەرمم کرد بڵێم قوربان ئەی میوە بخۆم؟!

لەبەر ئەوە سوێند بە خوا تا ئێستا نازانم تامی میوە و هەناری ترش و شیرنی ئەم باخە چیە!!

خاوەن باخ کە لەسەرسوڕماویدا چاوەکانی کردبونەوە و دەمی کردبۆوە، ئەمجارەیان وتی: یەعنی تۆ چەند ساڵە لەم باخەدا کاردەکەی و میوە دەڕنی هەنارێکت نەخواردووە؟!

وە خاوەن باخ وای زانی دەیەوێ بەم قسانەی خۆی خۆشەویست بکات. بۆیە بڕوای پێ نەکرد و پێی وت: باشە کوڕم بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە.

ئەمجا لەو لاوە کرێکار و خزمەتکارەکانی تری بانگ کرد و باسی موبارەکی بۆ گێڕانەوە کە شتێکی ئاوای وتووە، ئێوە شەو و ڕۆژ لەگەڵیدان، ئایا شتی واهەیە و ڕاست دەکات؟!

وتیان: بەڵێ قوربان زۆر ڕاست دەکات و بەخوا تا ئێستا تامی میوە و هەناری ئەم باخەی نەکردووە!!

باخەوان لە دڵەوە زۆر شادمان بوو، سوپاسی خوای کرد کە گەنجێکی ئاوا واریع و بەدین و نەفس بەرز لە باخەکەیدا کاردەکات، لەدڵی خۆیدا وتی: بەڕاستی حەیفە گەنجێکی ئاوا خزمەتکاربێ،

بەڕاستی من کچەکەم وەختی شوو کردنیەتی و، لەگەلێ پیاوی دەوڵەمەند و سەرمایەداری گەورە بەبن گوێیاندا خوێندوم کە کچەکەم بدەمە کوڕەکەیان..

بەلأم ئەوانە تەنها پارەیان هەیە، بەلأم نازانن شتێك ناوی حەلأڵ و حەرامە. بۆ ماددەیەکی کەمی دونیا دەیان تەنەزول دەکەن. ئەم کوڕە هەرچەندە پارەی نیە. کەسی نیە، بەلأم کەسایەتی هەیە. بەلأم ویژدانی هەیە، بەلأم بڕوای بە چاودێری خوا هەیە بەسەریەوە، بۆیە ئەگەر کچەکەی خۆمی بدەمێ. کچەکەم لەدەست نادەم. وەدەزانم ستەمی لێ ناکات. بەنانی حەلأڵ بەخێوی دەکات.

بۆیە چووەماڵەوە و پرسی بە کچەکەی کرد و ئەویش پێشتر هەڵی سەنگاندبوو، چەندە خاوەن ڕێزە و چەند گەنجێکی بەشەرمە و چاوەکانی لە ئاستیدا هەڵنەبڕیوە. بۆیە مەردانە بڕیاریدا شووی پێ بکات.

ئەمجا خاوەن باخ گەڕایەوە بۆ باخەکەی و موبارەکی بانگ کرد بۆ ژووری دانیشتنی خۆی لە باخەکەیدا و پێی وت: کوڕی خۆم. من تەنها یەك کچم هەیە، باشە بەڕەئی تۆ بیدەم بەکێ باشە، کە کچەکەم پاشە ڕۆشی ئاوەدان بێ و ڕەنجم بەفیڕۆ نەچێ و پەنجەی پەشیمانی نەگەزم لە پاشە ڕۆژدا؟!

موبارەك وتی: قوربان سوپاست دەکەم کە جەنابت متمانەت بەمن کرد و ڕێزی ڕاوێژکردنت پێدام. منیش ئەوەی لەدنیا تێگەشتووم و سەیری خەڵکی دەکەم ئەوەیە کە:

جولەکەکان حەزدەکەن کچەکەیان بدەن بە کەسی دەوڵەمەند و پارەدار چونکە زۆر حەزیان لە پارەیە!

گاورەکانیش بەدوای کوڕی جوان و باڵابەرز و دەم و چاو جواندا دەگەڕێن.

عەرەبەکانیش حەزیان لە بنەماڵەی ناودارە کە کچیان بدەنێ، بۆئەوەی کە بەهۆی ژن و ژن خوازیەوە پشت و پەنا بۆ خۆیان پەیدا بکەن و هێزی زیاتریان هەبێ..

موسڵمانی بەحەق و تێگەشتوش، لەکاتی بە شودانی کچەکەیدا، تەنها چاوی لە دینداری و خواناسی و ڕەوشت بەرزی ئەو کوڕەیە کە کچەکەی دەداتێ. ئەوی تر لە جوانی و دەوڵەمەندی و بنەماڵەی چاك، بەلایەوە شتی لاوەکی یە.

کابرای خاوەن باخ وتی: جا من لە تۆ بە تەقواتر و واریعتر و ڕەوشت بەرزترم دەستدەکەوێ و بینیوە؟! ئەگەر کچەکەی منت بەدڵ بێ پێشکەشت بێ! موبارەك کە شارەزای ڕەوشت بەرزی کچەکەبوو خێرا دەستی باوکی کچەکەی ماچ کرد و لێی مارەکرا و هەر لە ماڵی خەزوریدا ماڵی بۆ ئامادەکرا و بوە خاوەن ژن و ماڵ، بوو بە خاوەنی پارە و کار..

سبحان الله، موبارەکی خزمەتکار خۆی پاراست لە خواردنی هەنارێکی باخەکە، چونکە ڕاستەوخۆ مۆڵەتی خواردنی لە خاوەنەکەی وەرنەگرتبوو، ئێستا بۆتە خاوەنی باخەکە و سەرپەرشتی دەکات.

ئێستا لە ڕێگەی خێزانە بەڕێزەکەیەوە خاوەنی بەشە لەو باخەدا، ئێستا خزمەتکار نی یە و خاوەن کارە، بەڵێ پاداشت لە هەمان شتی کردارە (**الجَزاءُ مِنْ جِنْسِ العَمَل**). وە هەرکەسێ شتێ لەبەر خوا وازلێبێنێ، خوای گەورە بە حەلاڵی، بە سەربەرزی زۆر لەوەی باشتر قەرەبوو دەکاتەوە، (**مَنْ تَرَكَ شَيْئاً للَّه، عَوَّضَهُ اللهُ خَيْراً مِنْهُ**).

بەڵێ لەمماڵەدا، کەلەسەر خواناسی، خۆپارێزی لە حەرام و ڕێز و خۆشەویستی دروست بوو، دوور لە بەرژەوەندی ماددی و دونیایی، عبدالله ی کوڕی موبارەك لەدایك بوو، کە زانا و ناودار و خواناس و بانگخوازی بەناوبانگ و ناوداری ئیسلامە و، تا قیامەت ناوی لەسەر زمانی موسڵمانانە و نمونەی جوان بە قسە و ڕەفتارەکانی دەهێنرێتەوە، ئەو عبدالله یەی کە ئەوەندە حەلاڵ خۆر بوو، دەیفەرموو:

**(لأن أَردُّ دِرْهَماً مِنْ شُبْهَةٍ، خَيْرٌ لي مِنْ أَنْ أَتَصَدَّقُ بمائة ألْف دِرْهَمٍ، وَمائة ألف درهَمٍ حَتى عَدَّ ستمائة ألف درهَمْ).**

واتە: ئەگەر واز لە درهەمێکی گوماناوی بهێنم لەبەرخوا، مادام گومانی حەرامی لێدەکەم لەبەرخوا نەیخۆم، بۆ من چاکترە لەوەی کەوا لە ماڵی حەلاڵی خۆم سەد هەزار دیرهەم بکەم بەخێر، وە سەد هەزاری تر بکەم بەخێر، تاشەش سەد هەزار دیرهەم بکەم بەخێر!!

بەڵێ کوڕی باوکی خۆیەتی. باوکی واریع و کوڕی خۆپارێز و واریعی لێ دروست دەبێت. ﴿وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ۚ﴾ الأعراف:٥٨.

زانایان و دڵڕوناکان و خواناسان جوانیان فەرمووە:

**(مَنْ كانَ لِلّهِ كَما يُريدُ، كانَ اللهُ لَهُ كَما يُريد).**

واتە:هەرکەسێ وا کاربکات کە خوای گەورە پێی ڕازیە و پێی خۆشە، خوای گەورەش بۆئەو دەبێت و کاروباری بۆ ئاسان دەکات کە ئەم پێی خۆشە و دەیەوێت. {لاتَحْزَن وَابتَسِم لِلْحَياة، محمود المصري ص٥١}.

بەهیوای ئەوەی خوای گەورە کارئاسانی بۆ هەموو ئەوکچ و کوڕانەی کە تائێستا هەلی هاوسەرگیریان بۆ نەڕەخساوە، خوای گەورە هاوسەری چاك و دڵسۆز و وەفاداریان بە نسیب بکات و هەموان عاقیبەت خێر و سەرفرازبن.

## وانەی هەژدەیەم

## بابەت: ئاگاداری زمانت بە.

۞ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَتَعالى: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾﴾ الإِسْراء.

۞ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ:(إنَّ اللهَ يُبْغِضُ البَليغَ مِنَ الرِّجالِ الَّذي يَتَخَلَّلُ بِلِسانِهِ كَما تَتَخَلَّلُ البَقَرَةُ).** رَواهُ أَبُو داود:(٥٠٠٥) وَ الترمذي:(٢٨٥٧) وَقالَ حَديثٌ حَسَنٌ.

### سەرچاوەکان:

١) تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین.

٢) ریاضُ الصّالحین. الإمام النَّووي، و: نوری فارس حمەخان، ب٣، ل٢٧٢. وەب٢، ل٢٦٦. وەب٤، ل١١٦.

٣) لە سەرگوزشتەکانی ژیان، شێخ محمدی خاڵ، ل١٩.

٤) مێژووی شێوێنراومان، د.یوسف القرضاوي، و: ئیکرام کریم، ل٢١٨.

٥) تەفسیری ڕامان، أحمد کاکە محمود.

٦) فَنُّ الحِوار، فيصل بن عبده الحاشِدي، ص١٢٤.

٧) ئاو و ئاور، هێمن خورشید،ل١٨٣.

٨) البيان وَ التَّبين، الجاحظ، ج٢، ص١٢١.

٩) شَرحُ الصّالِحين، إبنُ عُثَيمن، ج٢،ص٦٤١.

١٠) گۆڤاری (برەو) ژ: (صفر)ی ئەزمونی، حوزەیرانی ٢٠١١، ل٣٤، وە: ژمارە:١١، ل٢و ل٩.

١١) مرۆسازی، وەرگێڕانی لە فارسیەوە: ڕزگار حمە سەلیم، ل٤٩و ل١١١.

١٢) الحياة حلوة. محمود المصري، ص٤٣٨.

١٣) بەرەو بەهەشت. ئەندازیار عُثمان ل١٠٠.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ لله رَبِّ العالَمين. وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدنا محمد وَ عَلى آلهِ وَ صَحْبِهِ أجْمَعينَ:

بە ویست و پشتیوانی خوای پەروەردگار، باسی زمان دەکەین، کە بەڕاستی زۆربەمان ئەگەر خوای گەورە بە ڕەحمی خۆی ڕەحممان پێنەکات و نەمان بەخشێ، لەگەڵ ئەوەدا سوپاس بۆ خوای گەورە لە زۆربەی گوناهە گەورەکانی وەکو: کوشتن و زینا و دزی و سیحر و ڕیبا و خواردنی ماڵی هەتیوو بەدورین، بەڵام لە بەڵای گەورەی زمان بەدورنین، کە هەروەکو پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ، لە فەرموودەدا باسی ئەوەی کردووە کە زۆربەی خەڵکی کە دەچنە دۆزەخەوە بەهۆی بەکارهێنانی زمانیانەوەیە بە خراپە.

(موعاذی کوڕی جەبەل ـ فەرمووی: لە سەفەرێکا لە خزمەت پێغەمبەری خوادابووم ﷺ ڕۆژێ بەدەم ڕۆشتنەوە لێی نزیك بوومەوە و عەرزم کرد، ئەی نێردراوی خودا، کارێکم پێ بفەرموو کە بمباتە بەهەشت و لە ئاگری دۆزەخ دورم بخاتەوە، فەرمووی ـ ﷺ ـ بەڕاستی لە شتێکی گەلێك گەورە و مەزنت پرسی، بەڵام ئاسانە بۆ کەسێ کە خوا ئاسانی بکات بۆی: هەر بە تاك و تەنها (الله) دەپەرستیت و هیچ هاوبەشی بۆ پەیدا ناکەیت وە نوێژەکانت

دەکەیت و زەکات دەدەیت، ڕۆژووی ڕەمەزان دەگریت و حەجی خانەی خوا دەکەیت..

ئینجا فەرمووی: با دەرگاکانی جۆرەها خێر و چاکەی تریشت نیشان بدەم، ڕۆژوو قەڵغان و سوپەرە و وەك سەنگەرێکی قایمی پۆلایین ڕۆژوەوان دەپارێزێ لە گوناه و تاوان، خێر و بەخشش و چاکەیش گوناه دەکوژێنێتەوە وەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە ئاوا، وەشەو نوێژی پیاوی خودا پێداویش لە جەرگەی شەودا کە خەڵك خەوتووە، نیشانە و دروشمی پیاوچاکانە. موعاذ فەرمووی: ئەمجا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرمووێ: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ﴾ تاکەیشتە ﴿يَعۡمَلُونَ﴾ السجدة:١٦،١٧.

واتە: بەشەو دورە پەرێز لە نوێن و نوستن دەگرن و، هەر خەریکی شەو نوێژ و شەو تاعەتن و هەر لە خودا دەپاڕێنەوە و، لاڵە و پاڵە و سکاڵا لە دەرگای پەروەردگاری خۆیان دەکەن، هەم لە ترسی سزا و تۆڵەی سەختی و هەم بە تەمای ڕێژنەی ڕەحمەتی. وە لەو ڕزق و ڕۆزیە پاکەی کە خودا پێی داون خێر و خێراتی باشی لێ دەکەن، ئەمانە مەگەر هەر خودای گەورە خۆی بزانێ، کە لەباتی ئەم کردەوە باشانەیان، لە پەنامەکی یەوە، لە ژێر پەردەی غەیبەوە چی خێر و خۆشی و خەڵات و بەهرەیەکی بۆ ئامادەکردوون.)

موعاذ ئەفەرمووێ: ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بالەسەر ڕشتەی هەموو کارێکی باش و کۆڵەکە و چڵە پۆپەی هەستونەکەیت پێ بڵێم، عەرزم کرد:

بفەرموو ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: سەر ڕشتەی هەموو کارێکی باش ئیسلامەتیە. وە کۆڵەکەکەی نوێژە، وە چڵە پۆپەی هەستونەکەی خەبات و تێکۆشانە لە ڕێگەی خودادا، ئینجا فەرمووی: با شیرازەی ئەمانەیشت هەمووی پێ بڵێم.

عەرزم کرد: بفەرموو قوربان، جا پێغەمبەر ﷺ، سەری زمانی خۆی گرت و فەرمووی: (**كُفَّ عَلَيْكَ هذا**). زمانی خۆت بگرە، منیش وتم: (**يانَبِيَّ اللهِ وَ إنّا لَمُؤاخَذونَ بِمانَتَكَلَّمُ بِهِ؟!**)

بۆچی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، لەسەر ئەو قسانەش کە دەیانکەین، تاوانبار دەبین و توشی تۆڵە و سزا دەبین؟!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يا مُعاذ، وَهَلْ يَكُبُّ النّاسَ فِي النّارِ عَلى وُجُوهِهِمْ أَوْ عَلى مَناخِرِهِمْ إلّا حَصائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ**). واتە: ئەی موعاذ دایك ڕۆڵە ڕۆت بۆ نەکات، ئەی چی ئەو خەڵکە لەسەر دەم و لەپەو ڕوو لەناو ئاگری دۆزەخدا دەگەوزێنی، جگە لە دروێنەی داسی زمانیان؟!

{رياضُ الصّالِحين ب٣، ل٢٧٢}.



## زمان دەرگای خێر و بەڵا!

بێگومان زمان یەکێکە لە بەخشش و خەڵاتە هەرە گەورەکانی خوای پەروەردگار بۆ مرۆڤەکان، زمان ڕەنگدانەوەی ناوەڕۆکی دڵە و دەربڕی ویست و خواستەکانمانە، هەروەها چەکێکی بەهێزە بۆ وتنی قسەی حەق و سەرکوتکردنی ناحەق، زمان ئامڕازی قسەکردنە، ئاشکرایشە بایەخی قسەکردن چەند گەورەیە!

مەگەر هەر بە زمان مرۆڤ شایەتمان ناهێنێ و، بەم شایەتمانە دێتە ڕیزی موسڵمانانەوە و خوێن و ماڵی حەرام دەبێ و، کەس بۆی نیە بە کافر و بێ بڕوا تەماشای بکات، بالە دڵیشەوە بڕوای نەبێ کە پێی دەوترێ دووڕوو (مُنافق). هەروەها هەر بە زمان و قسەکردنە کە مرۆڤ کوفر دەکات و لە بازنەی ئیسلامەتی دەچێتە دەرەوە..

هەر بە زمانە دوو کەسی نامەحرەم بە نیکاحی شەرعی دەبنە حەڵاڵی یەکتری. هەر بە زمانیشە کە تەڵاق و جیابوونەوە ڕوودەدات. بەڵێ جاری واهەیە بەیەك ووشە کارەساتێکی گەورەی دڵتەزێن دەکەوێتەوە، جاری واش هەیە بە چەند ووشەیەك برین سارێژ دەبێت و دڵ و دەرونەکان ئاسودە دەبن..

بەڵێ زمان ئەندامێکی بچوکە، بەڵام لە چاکە و خراپەشدا کاریگەری گەورەی هەیە، گۆڕەپانی کارکردنی زمان گۆڕەپانێکی پان و بەرینە، بەڵکو بێ سنورە، لە چاکەدا دەتوانێت ببێتە مایەی

ڕەزامەندی خوای گەورە، بە قورئان خوێندن و زیکر و قسەی چاك و بانگەوازکردن بۆ ئیسلام و، فەرمان بەچاکە و ڕێگرتن لە خراپە و ئاشتەوایی لە نێوان خەڵکی و سەدان جۆری تر لە کاری چاکە. لە خراپەشدا بەهەمان شێوە ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕێت و ئەوەی بەو ئەندامە بچوکە دەکرێت، جاری واهەیە بەتۆپ و فرۆکە و هێز و بازوو ناکرێت!

چونکە زمان ئەگەر خاوەنەکەی لە خراپەدا بەکاری بهێنێ، دەبێتە ئامرازی درۆکردن و بوختان و ئاژاوەنانەوە و هەڵگیرساندنی شەڕ و گومڕاکردن و خەڵکی دورخستنەوە لە بەهەشت. بە کورتی زمان چەکێکی دوو سەرە، سەرفرازیش ئەو کەسەیە لە گوێڕایەڵی خوای پەروەردگاردا بەکاری بهێنێ.

ئینجا زمان یەکێکە لەو ئەندامانەی لە خاوەنەکەی یاخی دەبێت و دووچاری هەڵە و کاری ناشەرعی دەکات. بەڵکو ئەگەر زۆر گوێڕایەڵی بکرێت سەرەنجامی ئادەمیزاد لە دۆزەخەوە سەر دەردەکات. کەسیش نیە لە خراپەکانی زمان ڕزگاری ببێت مەگەر کەسێك کە بە شەرعی خوا و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بیبەستێتەوە و سنوری بۆ دیاری بکات و ڕێگەشی نەدات قسەبکات لە ڕەزامەندی خوای گەورەدا نەبێت.

شاعیر لەبارەی زمانەوە فەرموویەتی، ئەو شاعیرە گەورەش (پیرەمێرد)ە:

زمان ڕابێنە لەسەر قسەی حەق

بەئەدەب نەوەك بەشێوازی ڕەق.

ئەو پارچە گۆشتەی لەناو دەمایە

کلیلی دەرگای خێر و بەڵایە.

هەروەکو دەرگای خێر دەکاتەوە

سەری زۆر بەڵاش هەڵدەداتەوە.



## قسەکردن.. بۆچی؟ لەکوێ؟ لەگەڵ کێ؟ کەی؟

بەڵێ زمان یەکێکە لەو ئامرازانەی پەیوەندی کردن، کە چۆنیەتی بەکارهێنانی دەکەوێتە ئەستۆی خاوەنەکەی، دەکرێ بیکاتە مایەی ئاشتەوایی و ڕێز و خۆشەویستی و پتەوکردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، یاخود بە پێچەوانەوە بیکاتە سەرچاوەی دووبەرەکی و ئازار و دڕك و تێکدانی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان. وەك چۆن چەقۆ ئامرازێکە، دایك خواردنی پێ ئامادە دەکات بۆ منداڵەکانی، کەچی بەدەست مرۆڤی خراپەکارەوە بۆ ئازار و تاڵانکردن بەکاردەهێنرێت.

کەواتە بۆ دووکاری پێچەوانەی یەکتر بەکاردەهێنرێن، بۆیە پێویستە بەرلەوەی قسە بکەین، ئەمانەی خوارەوە لەبەرچاو

بگرین: بۆ قسە دەکەین؟ لە کوێ قسە دەکەین؟ لەگەڵ کێ قسە دەکەین؟ کەی قسە دەکەین؟

## یەکەم: بۆچی قسە دەکەین؟

ئێمە ڕۆژانە بۆ ڕاپی کردنی کارەکانی خۆمان و دەرچونمان لە بازنەی تاك، پێویستمان بە دەوروبەر دەبێت و لە ڕێگەی زمانەوە ئەم پەیوەندیە دروست دەکەین. ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە: کاتێك کە قسە دەکەین بیر لە ئامانجی قسەکردنەکەمان بکەینەوە، لەبەرئەوەی هەر قسەیەك کە لە دەممان دێتە دەرەوە، لەسەرمان حیسابە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾﴾ ق.

واتە: بەردەوام دوو فریشتە چاودێرەکەی کە دانیشتون لەسەر شانی ڕاست و چەپی (بێ ئەوەی هەستی پێبکات) گوفتار و کرداری بە دەزگای زۆر پێشڕەفتە تۆمار دەکەن.

هەر قسەیەك لە دەمی ئادەمیزاد دەرچێت، خێرا یەکێ لە فریشتە چاودێرەکان تۆماری دەکات. ئەوەی لای ڕاست چاکەکان و ئەوەی لای چەپیش گوناهو خراپەکان تۆمار دەکات.

نمونەیەك: كەسێك لە بەرامبەر ئاوێنەدا وەستابوو، بە گوێزانێكی تیژ خەریكی تاشینی ڕیشی بوو، هاوڕێكەی كە لە تەنیشتیەوە بوو ئاگای لێبوو، وتی: بۆچی ئەوەندە خەریكی خۆت دەبیت؟ ئەویش بە گوێ پێنەدانێكەوە وەڵامێكی دایەوە، ئەمجا بە منی وت: تۆش قسەیەك بكە (دەردی دنیامان بخوات، نەك دەرد بێ و دونیامان بخوات)!!

بەڵێ بەڕاستی قسەیەكی جوانە. بەخوا قسە هەیە هێندە خۆشە، هێندە شیرینە كاتێ گوێت لێ دەبێ، هەرچەندە خەفەتباربی غەم و پەژارە دایگرتبی، چەند موصیبەت و ناڕەحەتی دەوری دابی، بەبیستنی ئەم ووشە ناسك و جوانانە، وەكو برینێك چۆن مەلحەمێكی نەرم ساڕێژ دەبێت، ئاوا غەم و پەژارەت لەسەر دەڕەوێتەوە، بەڵێ زۆرجار بووە، دڵت زۆر توند بووە، لەو كاتەدا كەسێك دوو قسەی خۆشت بۆ دەكات. یەكسەر دەڵێی ئاو بە ئاگردا دەكەن، ئاوا دەرونت فێنك دەبێتەوە..

ئەو دڵە تەنگەت، گەشە و خۆشی پێدا دێت، فرمێسكەكانت دەبن بە زەردەخەنە. بەڕاستی ئەم قسە جوانە(دەرمانە و دەردی دونیامان دەخوات). بە پێچەوانەشەوە، قسەی زبر، قسەی خراپ، قسەی فیتنە و ئاشوب هەڵگیسێنەر، دەرد و ڤایرۆس و میكرۆب و نەخۆشیە و دین و دونیامان، وەكو خۆركە و سیل و سەرەتان دەخوات و لەناودەبات..

بۆیە زۆر گرنگە کاتێك قسە دەکەین بیر لە ئامانجی قسەکەمان بکەینەوە، تەنانەت ئەگەر بۆکات بەسەربردن و پێکەنینیش بێت، چونکە ئەویش ئامانجێکە و پێویستیەکی مرۆڤە و مافێکی تاکە کەسیە لە کۆمەڵگەدا.

ئێمە کە باسی قسە دەکەین، مەبەستمان ئەوەنیە کە مرۆڤ تەنها و تەنها خەریکی زیکر و ویرد خوێندن بێ، بەڵکو گرنگ ئەوەیە ئەو قسەیە خێرێکی تێدابێ و نەبێتە مایەی ئازار بۆ کەسی بەرامبەر (**الكلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ**). هەموو وشەیەکی پاك و جوان و ناسك و دڵخۆشکەر و خەملابەر و شادی هێنەر و ئاشتی هێن و شەڕلابەر، صەدەقە و خێرە بۆ خاوەنەکەی، بۆیە قسەی خۆش و نوکتەی جوان و گاڵتەو گەپی مەعقول، ئەویش هەر چاکە و خێرە لە سنوری خۆیدا.

بۆیە ئەوەی داوامان لێکراوە ئەوەیە: کە قسەکانمان (دەرمان بێ و دەردی دنیامان بخوات، نەك دەرد بێ و دین و دونیامان بخوات) ! بۆیە بالە خۆمانەوە قسە نەکەین، پێشتر ئاکامی وتنی ئەو ووشە و ڕستانە لەبەرچاو بگرین کە دەیڵێین، تاوەکو بزانین قسەکردنەکەمان پێویستە یاخود نا..

بەڵێ دەچینەوە لای ئەو دوو کەسەی کە یەکیان خەریکی ڕیش تاشین بوو، هاوڕێکەی پێی گوت:

بۆچی صابون (مەلحەمەی ڕیشت) لە موەکانی ڕیشت ناوە؟!
وتی: ئاخر موەکان بەو صابونە نەرم دەبن و ئاسانتر و بێ ئازارتر لادەچن، وتم: کەواتە ئەمە ئەو قسەیەیە کە دەردی دونیامان دەخوات و، هەمان قسەیە کە پەروەردگار بە حەزرەتی موسا و هارونی برای فەرموو: ﴿فَقُولَا لَهُۥ قَوْلاً لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾﴾ طه.

واتە: بە نەرمی و لەسەرخۆیی قسەی لەگەڵدا بکەن بەڵکو بیربکاتەوە و بگۆڕێت...

بەڵێ کە موسا و هارون بە قسەی نەرم و جوان و ناسك لەگەڵ فیرعەون دوان، فیرعەونیش حاڵەتی تووڕەییەکەی کەم بۆوە و بە نەرمی لە جێگەی بڕیاردانی کوشتنی موسای چەند ساڵ هەلاتوو، قەبوڵی کرد تا لەگەڵ ساحیرەکاندا و لە گۆڕەپانێك بە ئامادەبوونی جەماوەری شار ڕوو بەڕوو بێتەوە، ئەمیش پەیامەکەی ئاشکرا بکات. کەواتە: نەرم و نیانی ئەو دەرمانەیە لە قسەکردندا، کە هەمیشە بەرامبەرەکەت دەخاتە (داوی) خۆیەوە.

بۆیە کۆمەڵێك گیانداریش کە لەبیاباندا دەژین بۆ ڕاوکردنی نێچیرەکەیان لە خۆڵی نەرم و شیکراوە سود وەردەگرن و خانوەکانیان بەو خۆڵە دادەپۆشن تا بە ئاسانی بەرامبەرەکەیان

بکەوێتە داویانەوە، دەی تۆی مرۆڤیش سود لە قسەی نەرم و جوان و دور لە زبری و ڕوشاندن ببینە.

**نمونەیەك:** ئەگەر کەسێك جل و بەرگێکی تازە و جوانی لەبەر کردبێت و، بەلای دڕکێك یان تەلێکی دڕکاویدا گوزەری کردبێت و لە جل و بەرگەکەی گیربوبێت، ئەو کەسە هەڵوێستی چۆن بووە؟! ئایا بۆ لێکردنەوەی قاتەکەی و پاراستنی لە دڕان دەبینی چۆن دەچەمێتەوە و بە ئارامی و نەرمی بەرەو ئەو تەلە دڕکاویە، یان دڕکەدا دەڕوات و تۆزێ دەکشێتە دواوە و بە هێواشی لێی دەکاتەوە.. چونکە هەموو خۆ تورەکردن و مل نان و ڕاکێشان بە توندی و ڕێگەیەکی تر، جل و بەرگەکەت دەدڕێنێ و نوێ پۆشی لە دەست دەدات..

کەواتە خاڵی یەکەم، با بزانین ئامانج لە قسەکردنەکەمان چیە و بە چ مەبەستێك قسە دەکەین.

## دووەم: لەکوێ قسە دەکەین؟

مرۆڤ لە کاتی قسە کردندا دەبێ ژینگەی قسەکردن بەرچاو بگرێ و بزانێ لەکوێ قسە دەکات، چونکە جۆر و شێوازی قسەکردنمان دەبێ بگونجێ لەگەڵ ئەو شوێنەی کە قسەی تێدا دەکەین، بۆ نمونە: ئەگەر تۆ لە پرسەی کەسێکدا باسی ژنهێنان و کچ بە شودان و نانی شایی و گێڕانەوەی نوکتە و سوعبەت و قسەی خۆش بکەی،

بێگومان با قسەکان ڕاست و واقیعی و جوان بن و بەڵگەت بە قورئان و سوننەت هێنابێتەوە، بەڵام بۆئەم شوێنە نەگونجاون و خەڵکی بەچاوێکی نامۆ سەیرت دەکەن و، لای خاوەن پرسە بە جۆرێك لە سوکایەتی پێکردن حیساب دەکرێ.

هەروەکو ئەگەر لە هۆڵی شەکراو خواردنەوەدا باسی مردن و دوا ڕۆژی مرۆڤ بکەی، کە دنیا بەجێ دێڵێ و بەتەنها دەخرێتە قەبرەوە، ئەمەش ئەگەر لە خۆیدا حەقە و ڕاستە، بەڵام بۆ ئەم بۆنە و شوێنە بەڕاستی نەگونجاوە و دیسان بە ئازاردانی کەسانی پەیوەندیدار بەم ئاهەنگە و ئامادەبوان حیساب دەکرێ.

بۆیە لە کۆنەوە وتراوە (**لِكُلِّ مَقامٍ مَقال**). هەر جێگایە و قسەی خۆی هەیە.

ئەی دەم لە چیت کەمە، قسەی باش و گونجاو لە زەمان و زەمینی خۆیدا هەم بەرامبەر پێی خۆشە و هەم پاداشتی لەسەر وەردەگرێت.

بۆ نمونە: ماڵێك: مناڵێکیان بوو، دەرودراوسێ هاتن بۆ پێ و قەدەم خێری، یەکێکیان وتی: بەڕاستی خوا تەمەنی پڕ بەرەکەت بکات منداڵێکی جوانە و إن شاء الله دەبێتە کەسایەتیەکی دیار.. زۆر سوپاسیان کرد و بە قسەکانی دڵخۆشبوون، یەکێکی تریان وتی: بەڕاستی مناڵەکەتان جوانە و پشت بە خوا دەبێتە بازرگانێکی ناوداری سەرکەوتوو. ماڵەکە زۆر دڵخۆشبوون و

سوپاسیان کرد، یەکێکی تریان وتی: وەرە ئەم منداڵە بەو حاڵە بووە و ئەوەندە دڵتان پێی خۆشە، کەچی دەبێت بمرێت. ماڵەکە زۆر بە قسەکەی بێزاربوون، ئاخر لە کاتێکی وادا ئەوە کەی قسەیە، ئێ خۆ قسە نەبڕاوە، ڕاستە هەموو دەمرین، بەڵام خۆ هەرکات و شوێنێك قسەی خۆی هەیە، کە بەداخەوە هەندێ کەس نازانن لەکوێ قسە دەکەن، بۆیە ئەگەر قسەکەشیان ڕاست بێ، دەبێتە مایەی نیگەرانی و نەمانی خۆشەویستی و دڵسۆزی و برایەتی و دۆستایەتی لەگەڵ ئەو کەسەی قسەی لەگەڵ کردووە.

بەڕاستی ڕەچاوکردنی ئەو جێگاو شوێنەی کە قسەی تێدا دەکەین زۆر گرنگە، تەنانەت شێوازی قسەکردن و بەرز و نزمی دەنگمان دەبێت بەپێی شوێنەکە بگۆڕین.. بۆ نمونە:

ئەگەر لە گەشتێکدا لەگەڵ هاوڕێکانت بیت بە ئارەزووی خۆت دەنگ بەرزدەکەیتەوە، بە مەرجێ لە دەوروبەر و نزیکت گەشتیاری تری لێ نەبێت کە بەدەنگی بەرزی تۆ نارەحەت ببێ. بەڵام بەڕاستی شیاو نیە بۆت ئەگەر لە شوێنێکی وەك نەخۆشخانە یان قوتابخانە و مزگەوت و کتێبخانەدا ڕەچاوی بارودۆخ و جێگەکە نەکەیت و وابزانی لە دەشت و سەیراندای و، بە ئارەزووی خۆت دەنگی لێ هەڵبڕی. بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو مزگەوتەوە صەحابەکان و هەموو ئومەتەکەی فێری ئەوە کرد کە لەکاتی قسەکردندا، بزانن ئەو شوێنە کوێیە و لەکوێ قسە دەکەن.

بۆیە فەرمووی: (**مَنْ سَمِعَ رَجُلاً يَنْشُدُ ضالَّةً في المَسْجِدِ، فَلْيَقُلْ: لا رَدَّها اللهُ عَلَيْكَ، فَإِنَّ المَساجِدَ لَمْ تُبْنَ لِهذا**). رَواهُ مُسْلِم: ٥٦٩.

واتە: ئەگەر گوێتان لە کەسێك بوو، بانگەوازی بۆ شتێکی بزربووی دەکرد لەناو مزگەوتدا، ئەوە بڵێن: خوا بۆت نەگێڕێتەوە! چونکە بەڕاستی مزگەوت بۆ ئەم جۆرە قسە و بانگەوازە دروست نەکراوە.

وە جارێکی تریان دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ، نوێژی بەیانی بۆ صەحابەکان کرد، کابرایەکی ئەعرابی دەشتەکی سەری هێنایە ئەمدیوو دەرگای مزگەوتەکەوە و وتی: کێ حوشترە سورەکەی منی دۆزیوەتەوە ڕەحمەتی لێبێ پێم بڵێ، یان کە بینی ئاگادارم بکاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**لاوَجَدْتَ، إِنَّما بنيت المساجِدِ لِما بُنِيَتْ لَهُ**) **رَواهُ مُسْلِم: ٥٦٩.**

واتە: دەی هەر نەیدۆزیتەوە، بەڕاستی مزگەوت بۆ ئەوە دروستکراوە کە یادی خوا و نوێژی تێدا بکرێ. نەك بۆ بانگەوازبۆ شتی بزربوو.

وە دەیفەرموو: (**إذا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبيعُ أَوْ يبتاع في المَسْجِدِ، فَقُولوُا: لا أَرْبَحَ اللهُ تِجارَتَكَ**). صَحيحٌ رَواهُ الترمذي: (١٣٢١) صَحيح الجامِع: (٥٧٣).

واتە: ئەگەر کەسێکتان بینی شتی دەفرۆشت، یان مامەڵەی کڕین و فرۆشتنی لە مزگەوتدا دەکرد. ئەوە هەموتان لێی وەرنە دەنگ و بڵێن: خوا قازانج نەخاتە بازرگانیەکەتەوە.

ئەمە هەمووی ئەو وانە گرنگەمان فێردەکات کە دەبێ بۆ هەر قسە و باسێك کە دەیکەین، بابۆشمان زۆر گرنگ بێ و بەرژەوەندیمانی تێدابێ، ڕەچاوی ئەو شوێنە بکەین کە قسەکەی تێدا دەکەین.

جا هەروەکو مزگەوت بۆ ئەمە نەشیاوە، مەکتەب و خەستەخانە و کتێبخانەی گشتی و ناوفەرمانگەی حکومیش هەرئاوا نەشیاوە، کە قسەی لابەلای تێدا بکرێ و لەسەر حیسابی بەرژەوەندی تایبەتی خۆت، ئارامی و کاری خەڵکی تۆ بشێوێنی. پێویستە کەسانی پەیوەندیدار و چاودێر لە شوێنە گشتیەکان، ئەو کەسانە ئاگاداربکەنەوە و ئەگەر هەر سوربوون بیانگرن و بەیاسا سزایان بدەن. کە نازانن لەکوێ قسە دەکەن.

هەروەکو پێشەوا (عومەری کوڕی خَطّاب) وەکو لێپرسراوی حکومەت کە بینی دوو کەس لە مزگەوتی پێغەمبەردا دانیشتون و قسە و باسی دونیایی دەکەن، فەرمووی: ئەگەر غەریب نەبونایە و خەڵکی مەدینە بونایە، سزام دەدان. چۆن لەناو مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ، دەنگ بەرزدەکەنەوە؟!.

(رَواهُ البُخاريُّ: ٤٥٨).

## سێهەم: لەگەڵ کێ قسەدەکەین؟

دوای ئەوەی بڕیارماندا قسە بکەین، دەبێ بزانین لەگەڵ کێ قسە دەکەین، چونکە قسەکردنمان لەگەڵ کەسایەتی جیاوازدا بەیەك شێوە نابێت. بۆیە دەبێ ڕەچاوی بەرامبەر بکرێت. بە شێوەیەك هەر یەك لە تەمەن و پلە و پایەی کۆمەلأیەتی و زانستی و ڕەگەز.. دەبێ بکرێن بە پێوەر بۆ هەڵبژاردنی ووشە و ڕستەکانمان، تەنانەت شێوازی دەنگ و ڕادەی بەرز و نزمی و سەدای قسەکردنمان..

### دەبێ شێوازی قسەکردنمان بەپێی کەسەکان بگۆڕین:

### ١) کاتێ قسە لەگەڵ دایك و باوکت دەکەیت:

دەبێ قسەکانت هەڵبژاردەی قسەی جوانبن، وە بژارکرابن لە قسەی نابەجێ و ناشرین، تەنانەت خوای گەورە لە قورئاندا ڕێنمایمان دەکا بەوەی کە هەندێ ووشە هەیە دروستە بەرامبەر بە کەسانی تر بەکاربێن، بەلأم هەر هەمان ووشە بۆ دایك و باوك نەشیاوە و دروست نیە. بۆ نمونە: کەسێکی هاوڕێ و هاوپیشەت بێزارت دەکات بە پرسیاری دووبارەی زۆر، بە داواکاری زۆر، تۆش تەحەمولت بەرامبەری نامێنێ و دەڵێی ئۆف لە دەستت بێزاربووم. ئەمە بۆ ئەم هاوڕێ و هاوپیشەیەت مافی ڕەواتە، چونکە ئەو لە سنوری خۆی ترازاوە.

بەلاّم هەرچەندە باوکت یان دایکت داواکاری زۆری هەبێ لەسەرت. دەیان جار پرسیاری شتێکت لێ بکات و لەبەر پیری و نەخۆشی و بیرکۆڵی لەبیری بچێتەوە و دیسان لێت بپرسێتەوە، داوای خواردنێکت لێ بکات و کە بۆت هێنا نەیخوا و داوای شتێکی تر بکات، چونکە بە تەمەنەکان وەکو منداڵی بچوکیان لێ دێتەوە. ئالەم کاتەدا دروست نیە بۆ تۆ بەرامبەریان بڵێی: ئۆف، ئۆف لە دەستتان بێزار بووم!

تەماشاکە: ئەم ووشەیە، ئەم قسەیە بۆ دایك و باوکت نەشیاوە هەرچەندە بۆ خەڵکی تر مافی خۆتە. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾﴾ الإسراء.

واتە: ئەگەر یەکێك لە دایك و باوکتان، یان هەردووکیان لە تەمەنی پیریدا کەوتنە لای تۆ ئەوە نابێت تۆ ڕۆژێك لە ڕۆژان ئۆفیان لەدەست بکەیت. هەروەها نابێت لە هیچ حاڵەتێکدا پیایاندا هەڵشاخێیت، بەڵکو با هەمیشە و بەردەوام قسە و گوفتارت لەگەڵیاندا چاك و جوان و شیرین و سۆزداربێت..

٢) کاتێ قسە لەگەڵ هاوسەری ژیانت دەکەی:

بەتایبەتی کاتێ دایك و باوکی و منداڵتان هەیە. دەبێ زۆر ئاگاداری قسەکانت بی و دەستەواژەی جوان و واتا بەخش و ناسك بەکاربهێنن. وە خۆیان بەدوربگرن لە وشەی زبر و بریندارکەر و ناشیرین، ڕەچاوی ڕێز و هەست و سۆزی هاوسەرەکەیان بگرن و بەڕووخۆشی و ڕووگەشیەوە بەیەکەوە بدوێن. وە لەکاتی گفتوگۆی خێزانیدا دەشێت جیاوازی لەنێوان ژن و مێردا هەبێت لەسەر بابەتێك یان پرسێکی دیاریکراو.. بەڵام ئەمان بۆیە قسە و گفتوگۆ دەکەن دەیانەوێ بگەن بە چارەسەرێکی گونجاو وە تێڕوانینێکی هاوبەش، لە هەمان کاتدا مەبەستیانە پەیوەندی خێزانیان پتەو و بەهێز بکەن، وە بونی جیاوازی نەبێتە مایەی لاوازی پەیوەندیەکانیان و لێبوردەیی و سۆز و خۆشەویستی و ڕێز باڵ بکێشێت بەسەر ئەندامانی خێزانەکەدا.

بەڵێ دەبێ دایك و باوك زۆر ئاگاداری ئەو قسانەبن کە لەبەرچاوی منداڵەکانیان دەیکەن. چونکە بێگومان ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەریان و ئەوانیش بەهەمان شێوازی قسەکردن و ووشە بەکاردەهێنن و لە کۆنەوە وتراوە: منداڵ وەکو لاپەڕەیەکی سپی وایە چی لێ بنوسی ئەوە لەسەر دەخوێنرێتەوە.

### ٣) کاتێ قوتابی قسە لەگەڵ مامۆستاکەی دەکات:

ئەم کەسە دەبێ ئەوپەڕی ڕێز بنوێنێت، نابێت بەو شێوەیە قسە لەگەڵ مامۆستاکەی بکات، هەروەکو لەگەڵ قوتابیەکی هاوپۆلی قسە دەکات تەنانەت ئەگەر خوانەکردە مامۆستا وەکو هەر مرۆڤێك کە قابیلی هەڵە کردنە، قسەیەکی هەڵەی بەرامبەر بە قوتابیەکەی کرد، نابێ قوتابیەکە بە ڕەقی و توندی وەڵامی مامۆستا بداتەوە، دەبێ حورمەت و ڕێز و گەورە و بچوکی ڕەچاو بکرێ. ئەگەر وەڵامیشی دایەوە، بەوپەڕی ئەدەبەوە وەڵامی بداتەوە و هەڵەی مامۆستاکەی بە شێوازێکی زۆر ئەدەبی ڕاست بکاتەوە.

### بەسەرهاتێك:

ئیمام ئەبو حەنیفە ئەچێ بۆ حەج، لەو سەرەوە کە ئەگەڕێتەوە، ئەچێ بۆ مەدینە، ڕۆژێك بە تایبەتی ئەچێ بۆ خزمەتی ئیمامی مالیك، کە پێشتر یەکتریان نەدیووە، کە ئەچێتە ژورەکەی ئیمام تەماشا ئەکات پڕە لە زانایان و دانایان، وە جێگای دانیشتن نیە، بەردەمی قاپیەکە نەبێ، ئیمام سەلام ئەکا و هەر لەوێ دائەنیشێ، وە کەس نایناسێ، ئیمامی مالیك لێی ئەپرسێ: لە کوێوە دێن؟ ئەبو حەنیفە ئەفەرمووێ: لە عێراقەوە، ئیمام مالیك ئەم قسە مەشهورەی بە دەمدا دێت و بەبێ مەبەست دەفەرموێ:

**(أَهْلُ العِراق، أَهْلُ النِّفاق)!** واتە: ئەهلی عێراق ئەهلی ناپاکی و دوڕویین و متمانەیان پێ ناکرێ.

بێ گومان ئەم قسەیە هەرچەندە زۆر لە کۆنەوە وتراوە، ئیمام مالیك هیچ مەبەستێکی خراپی بەرامبەر بە ئیمام أبو حەنیفە نەبوو لەم قسەیەدا، بەڵام بێگومان ئازاری دڵی ئیمام ئەبوحەنیفەی دا و لە دڵەوە پێی ناخۆش بوو، بەڵام ڕەچاوی مامۆستایەتی و پایە بەرزی و تەمەن و خزمەتی ئیمام مالیکی کرد و، زۆر بە شێوازێکی جوان و ئەدەبی، ویستی بە ئیمام مالیك بڵێ: قوربان ئەو قسەیە لەم کاتەدا بەرامبەر منی غەریب و میوان لە جەنابت نەدەوەشایەوە..

بۆیە لە وەڵامی ئیمام مالیکدا دەفەرمووێ: قوربان ڕاست دەفەرموون، قورئانیش پشتیوانی فەرموودەکەی ئێوە دەکات کە دەفەرمووێ: **(وَ مِنْ أَهْلِ العِراقِ مَردوا عَلى النِّفاق)**.

ئیمام مالیك سەرەتا تێنەگەیشت، لەوەی کە ئەم میوانە ئەم ئایەتەی بۆچی وا بەهەڵە خوێندەوە و مەبەستی چی بوو؟! بۆیە فەرمووی: نا کوڕم، ئایەتەکە وانی یە وەکو وتت، ئیمام ئەبو حەنیفە فەرمووی: ئەی چۆنە؟! ئیمام مالیك فەرمووی: ﴿ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ مَرَدُواْ عَلَى ٱلنِّفَاقِ﴾ التوبة: ١٠١.

**واتە: هەندێ لە خەڵکی مەدینەش هەن کە زۆر زرنگ و لێهاتوون لە دوو ڕوویدا...**

ئیمام مالیك لەگەڵ وتنی ﴿أَهۡلِ ٱلۡمَدِینَةِ﴾ پەنجی خۆی گەست و خۆ ئەم خۆی ئەهلی مەدینەیە نەك عێراق! بەڵام ئیمام ئەبو حەنیفە خۆی لەبەردەمی ئیمام مالیك ئایەتەکەی بە هەڵە خوێندەوە، تا بە ئیمام مالیکی مامۆستای خۆی ئایەتەکە ڕاست بکاتەوە. وە هەر بەخۆی جوابەکەی بداتەوە. ئیمام مالیك کە تێگەیشت هەستا و چووە بەردەمی و فەرمووی: ئەبێ ئێوە ئیمام أبو حەنیفە بن، وتی: بەڵێ، ئیتر دەستی گرت و بردیە لای خۆیەوە. {لەسەر گوزشتەکانی ژیان، شێخ محمدی خاڵ، ل١٩}.

## ٤) کاتێ قسە لەگەڵ کەسێك دەکەی کە پێشتر چاکەیەکت لەگەڵ کردووە:

ئەم کەسە لە هەژاری و نەداریدا کۆمەك و دەستبار و هاوکاری بووی، ئاگاداربە لەکاتی قسەکردندا باسی ئەوە نەکەی کە خەڵکی بێ وەفان و، چاکەیان لەبەرچاو نیە و ئەوەی چاکەی لەگەڵ دەکەی لە شەڕی بترسە.. ڕەنگە تۆ مەبەستت کەسێکی دیاریکراو بێ، کە داخی کردووە بە دڵتا و پاداشتی چاکەی بە خراپە داویتەوە، وە ئەم کەسەت هەر لە یاد نەبێ کە ڕۆژێ چاکەت لەگەڵ کردووە، بەڵام چونکە ئەم لە بەرامبەرتدا دانیشتووە یەکسەر وا هەست دەکات کە تۆ مەبەستت لەوە..

ئیتر بەڕاستی لە ناخەوە دەسوتیّ و سەد جار خۆزگە دەخوازیّ کە تۆ ڕۆژیّ ئەو چاکەیەت لەگەڵ نەکردایە و، حەزدەکات بمریّ و ئەو چاو بەرە ژێریەی تۆی لەسەر نەبوایە و، ئاوا هەستی بە نەدامەتی خۆی نەکردایە.

بۆیە بەم قسەیەت ـ ئەگەر چی ئەویشت مەبەست نەبوو ـ وەکو ئەو خواردنی (چەرەس)ەی لیّ دیّ کە هەرچەندە تامی نایاب و خۆش و چێژ بەخشە، بەلاّم کاتیّ دانەیەکی بادەمی تالّ، یان گوڵە بەڕۆژە و فستقێکی بۆن خنك، چۆن هەموت لا تالّ و ناخۆش دەکات و، تام و خۆشیەکانی پێشوت لەبیر دەباتەوە، بەهەمان شێوە هەندیّ کەس کە سەدەها لوتف و میهرەبانی و چاکە دەکەن، بەلاّم بەیەك ووشەی تالّ و ناخۆش هەموو شتەکان تێك دەدەن. وە ئەو قسە ناخۆشە بۆ دلّی ئەو کەسە وەکو دلۆپیّ زەهر وایە کە بیکەیتە قاپیّ هەنگوینی پالّەفتەوە!

### ٥) کاتێك کە قسە لەگەڵ نەخۆش دەکەی:

دەبیّ ئاگاداری ووشەکانت بی و، ووشەی مەڵهەم ئاسا بەکار بهێنی، کە سارێژی برینەکانی بکات و ئاسودەیی دلّ و دەرونی پیّ ببەخشیّ.

لەلای نەخۆش باسی مردن مەکە و مەڵیّ بەخوا هەر دەبیّ بمرین و ئەوە چارەنوسمانە، نەخێر باسی شیفا بکە و بڵیّ إن شاء الله لە

زوترین کاتدا شیفات بۆ دێ و، چەند کەس دەناسم وەکو تۆ نەخۆشی ئاوایان هەبووە، ئێستا سوپاس بۆ خوا زۆر باشن و هەر زۆر زوو چاك بوونەوە، بەڕاستی دکتۆرەکەشت لە چاکترین دکتۆرەکانە و زۆر ناودارە و بە ئیزنی خوا لەلای ئەو شیفات بۆ دێ.
پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەچوو بۆلای نەخۆش دوعای شیفای بۆ دەکرد، ـ سەعدی کوڕی ئەبوو وەققاس ـ کە فەرموویەتی:

نەخۆش کەوتبووم، لە ماڵەوە کەوتبوم، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ سەردانم، لەلامەوە دانیشت و سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: **(اللّهُمَّ اشْفِ سَعْداً، اللّهُمَّ اشْفِ سَعْداً، اللّهُمَّ اشْفِ سَعْداً)**. رَواهُ مُسْلِم: (١٦٢٨). واتە: خوایە دەرمانی دەردی سەعد بدە و شیفای بفەرموو. {ریاض الصّالحین، ب٢، ل٢٦٦}.

بەڵێ، لە ڕووی دەرونیەوە قسەی خۆش و دڵدانەوەی نەخۆش کاریگەری گەورەی هەیە. هەروەکو قسەی ناخۆش و دەنگی ناساز و قسەی ڕوخێنەر، نەخۆش لەناودەبات و چاك بوونەوەی دوا دەخات. بۆیە لە ئیسلامدا وەقفی تایبەت هەبوە بۆ دڵدانەوەی نەخۆش و خەڵکی غەریبە. کەوەقفێك بوو تایبەت کرابوو بۆ سرودبێژ و بانگبێژ و دەنگ خۆشەکان، ئەمانە شەو تا بەیانی بەدیار کەسە نەخۆشەکانەوە ئێشکیان دەگرت و سرودی ئاینیان بۆ دەخوێند و، مەقامیان بۆ دەوتن و هەریەکەشیان کاتژمێرێك

خەفارەتی بەردەکەوت. ئامانجیش لەم سرود و مەقام وتنە ئاسودەکردنی کابرای نەخۆش بوو، بۆئەوەی ئازارەکەی لەبیر بچێتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی کەسیان نەبوو خەمیان هەڵبگرێت، یان ئەوانەی کە غەریبە بوون و هاودەمێکیان نەبوو سوکنایی پێوە بگرن.

**وەقفێك بۆ چاككردنەوەی نەخۆش بە (ئیبحائی دەرەکی):**

ئەمەش وەقفێکی تربوو، کە ئەرکەکەی بەشێك بوو لەکۆی ئەرکەکانی تری چارەسەرکردن لە نەخۆشخانەکاندا، کارەکەش ئەوەبوو کە دوو پەرستار دادەنران لە نزیکی کابرای نەخۆشەوە، بەڕادەیەك نەخۆشەکە گوێی لە دەنگیان بوو، بەڵام نەیدەبینین، یەکێکیان بەوی تریانی دەوت: ئەرێ ئەوە دکتۆر دەربارەی ئەم نەخۆشە چی دەڵێ و حاڵی چۆنە؟ پەرستارەکەی تر وەڵامی دایەوە و دەیگوت: دکتۆر دەڵێت حاڵی باشە و بەرەو چاك بوونەوەش دەڕوات و، نەخۆشیەکەی شتێکی وانیە کە جێگای دوو دڵی و بێتاقەتی بێت. ئەم چارەسەرە ئەوەندە کاریگەری هەبوو، جاری واهەبوو نەخۆشەکە دوای دوو سێ ڕۆژ هەڵدەستایەوە و چاك دەبۆوە. {مێژووی شێوێنراومان، ل٢١٨}.

### ٦) كاتێ قسە لەگەڵ قەرزارو هەژارێك دەكەی:

دەستكورت و نەدار و هەژارێك دەكەی، ئاگاداری زمانت بە و ئەو قسانە مەكە كە باسی مامەڵەی گەورە و چەند دەفتەر دۆلار و چیت خوارد و چیت كڕی. چونكە ئەوە ئازاری دڵی دەدات و ڕەنگە ڕق و قین لە دڵیدا بەرامبەرت دروست بكات.

### ٧) كاتێ قسە لەگەڵ غەمبارێك دەكەی:

قسەكردن لەگەڵ غەمبار و دڵ بەخەمێك دەكەی شێوازی خۆی هەیە، بۆیە ئاگاداری شێوازی قسەت بە، هاوسەنگی ڕاگرە لەنێوان ئەوەی قسەكانت لەسنور بچنە دەرەوە لەبارەی گاڵتە و گەپ و پێكەنین و سوعبەت، وە لە نێوان ئەوەی كە قسەیەكی خۆش و زەردەخەنەیەكت لێ نەبینێ و ئەوەندەی تر دڵی تەنگ بێت.

### ٨) كاتێ قسە لەگەڵ نەیارێكت دەكەیت:

كاتێ لەگەڵ نەیارێكت قسە دەكەی، كە پێشتر ساردیەك لە نێوانتاندا ڕوویداوە، یان قسە لەگەڵ كەسێك دەكەی كە لەبیروڕادا پێچەوانەی تۆ بیردەكاتەوە، یان نەیاری حیزب و لایەنەكەتە.. ئالەم كاتانەشدا هەوڵبدە جوانترین ووشە بەكاربهێنە، بەشێوەیەك ئامانجی خۆت بگەیەنی و بەرامبەرەكەشت بریندار نەكەی. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ

ﭐلشَّيۡطَٰنَ يَنزَغُ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٗا مُّبِينٗا ﴿٥٣﴾ الإسراء.

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بەبەندەکانم بڵێ: بەووشەیەك گۆبکەن باشتر و جوانتربێ بۆ ڕاگرتنی سۆزی خۆشەویستی نێوانیان، واتە: هەوڵبدەن چ قسە و کاروکردارێ باشترە ئەوە بکەن و ئەوە بڵێن، هەر شتێك دەبێتە هۆی پچڕانی خۆشەویستی، دووریی لێبگرن، چونکە شەیتان هەمیشە دەیەوێ فیتنە و ئاژاوە لەنێوانیاندا ساز بکات. جا ئەگەر ئێوەش زیرەك و هۆشیار نەبن ئەوا دەتوانێت بەشێکی بچکۆلەش بێت، نێوانتان تێکبدات. بێگومان شەیتان بۆ مرۆڤ هەمیشە دوژمنێکی ئاشکرایە و هەر لە مەڵاسدایە بۆیان. {تەفسیری ڕامان، م.أحمد کاکە محمود}.

بەڵێ مرۆڤی موسڵمان ئاگاداربە و لەخوا غافڵ مەبە و وریابە لەکاتی قسەکردندا شەیتان هانت نەدا، بڵێ ئەوەتا بەرامبەرەکەت ئەو قسەیەی لەدژی تۆ کرد، تۆ دوو قسەی لەدژ بکە، ئەو دوو ڕستەی وت تۆ توندتر بەسێ ڕستە دڵی بتەزێنە، لەجیاتی بەرد بەرقی تێبگرە، شەیتان هانت دەدا و دەڵێ: (تۆڵە بەصەبرە ئەمما بەزەبرە) بەڵێ شەیتان هەمیشە ئەو ووشە و مەسەلانەت دێنێتەوە یاد کە لەناوبردنی هێمنی و لێبوردنیان لێ دەخوێندرێتەوە، بۆیە زۆر جار دەبینی دووکەس هیچ کێشە و گرفتێکی پێشتریان لە

نێواندا نەبووە، کەچی کتوپڕ بەیەکتر دەکێشن، هەموو شەڕ و ئاژاوەکە لە ئەنجامی یەك قسەدا هەڵایساوە، لەو کاتەدا کە قسەیەك لەم و قسەیەك لەوەوە دەوترێ شەیتان ئامادەیە و هانیان دەدا و دەڵێ: تەحەمول مەکە، خێرا وەڵامی بدەوە، تەنەزولی بۆ مەکە، بیتەزێنە، با نەڵێن ترسنۆکی، تۆش بەو قسەیە ئابڕوی ببە، بەم شێوەیە ئەگەر بەقسەی بکەن فیتنەیەکی گەورە دروست دەبێ.

**گەوهەرێك لە پێشەوا شافیعی یەوە:**

ئیمام سەخاوی لە ئیمام موزەنیەوە گێڕاویەتیەوە کە: ڕۆژێکیان ئیمامی موزەنی لە خزمەتی مامۆستاکەی خۆی (ئیمامی شافیعی)دا دەبێ، لەکاتی گفتوگۆ و قسە و باسدا ئیمامی موزەنی دەفەرموێ: (**فُلانٌ كَذَّاب**). بەڕاستی فلاَن کەس یەگجار درۆزنە و تا درۆ وەستابێ ڕاستی ناڵێ، ئیمامی شافیعی فەرمووی: کوڕی خۆم، ئیبڕاهیم ـ ئیمامی موزەنی ناوی ئیبڕاهیمە، ووشەی جوان بەکاربهێنە: (**لا تَقُلْ كَذَّاب، وَلكِنْ قُلْ: حَديثُهُ لَيْسَ بِشَيءٍ**). مەڵێ فلاَن کەس درۆزنە، بەڵکو بڵێ: قسەکانی جێی بایەخ نین. با زمانت لەسەر ووشەی ناشیرین بە خەڵکی ڕانەیەت. ئەگەر قسەکەشت ڕاست بێ ووشەیەکی وا بەکاربهێنە کە کەمتر کەسی بەرامبەر پێی بشکێ. باخۆشی بەرەو ڕوت نەبێ. { فَنُّ الحِوار، فيصل بن عبده الحاشِدي، ص١٢٤.}.

### ٩) کاتێ قسە لەگەڵ کەمئەندامێك دەکەی:

دەبێ ئاگاداری ووشەکانت بی و، ڕەچاوی بارودۆخی ئەو خاوەن پێداویستیە تایبەتیە بکەیت. بۆ نمونە لە دانیشتنێکدا قسە دەکەی کە کەسێکی تێدایە لەناو خەڵکا بە (کەڕ) ناودەبرێ، چونکە گوێی باش نابیستێ، چەند جوانترە بڵێی: کەسانی نابیست لەجیاتی بڵێی کەڕەکان. یان لە جیاتی بڵێی: کوێر، بڵێی نابینا، یاخود لەجیاتی لاڵ، بڵێی ناگۆ، کە بەمە هەم مەبەستی قسەکەت دەگەیەنی، وەهەم هەستی ئەو کەسەش ئازار نادەی. وە حورمەت ڕێزێك لە قسە و وشەکاندا دەخوێندرێتەوە.

**بەسەرهاتێك:** یەکێ لەقازی و دادوەرەکان، هاوەڵێکی زۆر دڵسۆز و زانا و قسەخۆشی هەبوو، ئەو هاوەڵەی (نابینا)بوو، جا هەرکات ئەم هاوڕێ نابینایەی بڕۆشتایەوە بۆماڵی خۆی. ئەم قازی یە بە کوڕەکەی دەگوت: ڕۆڵەگیان: **(إذْهَبْ مَعَ أَبي محمد، وَلا يَقُلْ: خُذْ بِيَدِهِ)**.

واتە: ڕۆڵەگیان هەستە لە خزمەت باوکی محمددا بڕۆ، هەستە لەگەڵیا بڕۆ. هیچ کات نەیدەگوت: کوڕم هەستە دەستی بگرە، یان دەستی بکێشە!

بزانە و وردببەوە! ئەم دوو قسەیە کە هەر بۆیەك ئامانج دەوترێن چەندیان فەرقە؟ کاتێ کە دەڵێ: لە خزمەتیا بڕۆ تاماڵەوە، مانای ئەوەیە ئەم پیاوە زۆر پایە بەرز و بەنرخە و دەبێ

کەسێك وەکو حورمەت و ڕێز لە خزمەتیدا بێ، بەڵام کاتێ بڵێ: دەستی بگرە، مانای وایە ئەمە نابینایە و ناچارین کەسێ لەگەڵیا بنێرین تا نەکەوێ و بەسەلامەتی بگاتەوە ماڵ. باشە خۆ هەردوو قسەکە هەر گەیاندنەوەیەتی بەماڵ. ئیتر بۆچی جوانەکەیان و ناسکەکەیان نەکرێ؟!!

## ١٠) کاتێ قسە لەگەڵ ڕێبوارێك دەکەی:

پێویستە خۆت بپارێزی لە قسەیەك کە دڵی ئەو ڕێبوارە ئازار بدات، بەڵکو پێویستە هەست و سۆزی ڕابگری.

**بەسەرهات:** ئەمیری ئیمانداران (عُمری کوڕی خَطّاب) شەوێکیان وەکو ئێشککگری شەو لەناو شاری مەدینە و دەورووبەریدا دەسوڕایەوە، بۆ سەرپەرشتی شاروپاراستنی هاوڵاتیان لە خراپەکاران و بەهاناوەچوونی لێقەوماو و گرفتاران، لەو کاتەدا لەسەر گردۆڵەیەك ئاگرێکی بینی، وەستا و سەرنجی دا، کە ئەمانە دیارە خەڵکی مەدینە نین وا لەو شوێنە ماونەوە، بۆیە لێیان نزیك بۆوە تەماشای کرد خێزانێکن و لەدەوری ئاگرێك کە لەبەرسەرما و تاریکی شەو کردویانەتەوە دانیشتون، ئیمامی عومەر چوە نزیکیان و سەلامی لێکردن و فەرمووی: (**یا أَهْلَ الضَّوْءِ**) ئەی ئەهلی ڕووناکی، پێی ناخۆش بوو، پێی جوان نەبوو بڵێ: (**یا أَهْلَ النّار**) ئەی ئەهلی ئاگرەکە! چونکە یەکەمیان (ڕۆشنایی) خۆشی و

شادمانی بەدڵ دەبەخشێ. بە پێچەوانەشەوە (ئاگر) سزا و ئەشکەنجە و سوتان و مەینەتی بیری مرۆڤ دەخاتەوە.

## ١١) کاتێ قسە لەگەڵ چاوپیسێك دەکەی:

کەسێك کە بە حەسود و چاوپیس و دەرون نەخۆش ناسراوە، پێویست ناکات کە تەواوی ئەو خەلأت و خۆشیانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوی باسی بکەی. بۆ نمونە: بڵێی موچەم زۆر باشە و لێم زیادە و مانگانە پاشەکەوتم هەیە و، خانووی خۆم هەیە و، سەیارەکەم مۆدیل بەرزە و، منداڵەکانم زۆر گوێڕایەڵن و لە خوێندندا یەکەمن و لەشم زۆر ساغە.. ئەمانە لەلای ئەو جۆرە حەسود و دڵپیس و دەروون بۆگەنانە باس مەکە، کە بەشادمانی و خۆشی و خۆشگوزەرانی کەس خۆشحاڵ نین، نەوەکو چاوی پیس و ئاخ هەڵکێشانی حەسودانەیان لێت گیربێ و توشی زیان و ئازارت بکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**إِسْتَعِنُوا عَلَى إِنْجاحِ الحَوائِجِ بالْكِتْمانِ، فَإِنَّ كُلَّ ذي نِعْمَةٍ مَحْسُودٌ**).

واتە: یارمەتی وەرگرن بۆ سەرکەوتنی پێداویستی و ئیش و کارەکانی ژیانتان بەوەی کە هەموو شتێ لای هەموو کەس مەڵێن، وە نهێنی ژیان و ئیش و کاروکەسابەت و گوزەرانی خۆشی ژیانتان لای هەموو کەس باس مەکەن. لەبەرئەوەی هەموو خاوەن خۆشی و دەوڵەمەندی و پلەداری و خۆشگوزەرانی و، ماڵ و منداڵی

بەختەوەر و تەبا و لەش ساغی و بێوەیی یەك، ناحەز و دوژمن و حەسودی خۆی هەیە. کە چاوی بەو خۆشی و شادیە هەڵنایە و، هەوڵی تێکدانی دەدات و لەناخی بۆگەنیەوە خۆزگە بەلەناوچونی دەخوازێت.. {ئەم فەرموودەیە: (رَواهُ الطَّبَراني، وَذَكَرَهُ الألْباني في صَحيحِ الجامِعِ حَديثٌ رقم: (٩٤٣) وَصَحَّحَهُ} .

## ١٢) لەکاتی قسەکردندا، جوانترین هەڵبژێرە:

کاتێ شتێك بەدوو وشە مانای دەردەبڕێ، تۆ هەوڵبدە کامیان جوانتر و شیاوترە و مرۆڤ پێی ئاسودەترە ئەوەیان هەڵبژێرە، نەك ئەوەی دڵی پێی دەشێوێ.

پێشینان فەرموویانە: (قسە بی کێشە، بیبێژە، ئەمجا بیوێژە).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**لا يقُولَنَّ أحدُكُمْ خَبُثَتْ نَفْسي، وَلكِنْ لِيَقُلْ: لَقِسَتْ نَفْسي**) متفق عليه: (بُخاري: ٦١٧٩) (وَ مُسْلِم: ٢٢٥٠).

واتە: مەڵێن: دڵم تێك دەچێ، گەدەم گەنیوە، بەلاّم بڵێن: دڵم تێك هەڵدێ، دڵم دێ بەیەکا، دڵم هەڵدەشێوێ. پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی ئەوەیە کە موسڵمانان فێری قسەی شیرین و جوان بن و قسەی ناشیرین تەرك بکەن، لە گفتوگۆدا ناسك و بەنەزاکەت بن، دەنا (**خَبُثَتْ نَفْسي**) دەق بەمانا (**لَقِسَتْ نَفْسي**)یە، بەلاّم ووشەی (**خبث**) ووشەیەکی قێزەونە، بۆ نمونە:

بەپێی ئەم فەرموودەیە ئەم ڕستانەی دواوە لە کوردی دا ئەگەرچی ڕستەی یەکەم دەق بەواتای ڕستەی دووەمە، بەڵام یەکەمیان ناسکترە لە دووەم، بۆ نمونە:

چەند جوانترە بڵێی فلاَن کەس (سەرئاو دەکا) نەك بڵێی: پیسایی دەکا.

یان کەسێ لوتی پیسیەکی پێدا هاتۆتە خوار، جوانترە بڵێی: لوتت بسڕە، نەك بڵێی: چڵمەکەت بسڕە، یان کەسێ گەدەی بە خواردنی زۆر تێکچووە، جوانترە بڵێی: ئینتەلای کردووە، نەك بڵێی: ورگی، مەعیدەی بۆگەنی کردوە و ترشاوە بەسەریەکدا. {ریاض الصّالحین، ب٤، ل١١٦} .

بەڵێ میللەتی کورد لەم بارەیەوە زۆر پێشکەوتووە:

بە ئافرەتی حامیلە کە منداڵ لە سکیایەتی ناڵێ: ئاووس، دەڵێ: دووگیان. بەکەسێ زگی بچێ زوو زوو بچێ بۆ سەرئاو دەڵێ: ڕەوانە، ناڵێ: سك چونیەتی!



## باگفتوگۆکانمان وەك گوڵ وابن

پێشینان ڕاستیان فەرمووە: مرۆڤ سندوقی داخراوە کلیلەکەشی زمانیەتی. چونکە زمان ئامڕازی ئاخاوتن و گفتوگۆکردنە، کاتێك گفتوگۆدەکەین ئەوا دیدو بۆچون و، بەها و ڕەوشت و تێڕوانینێك کە لەناخماندایە دەری دەبڕین..

بەڵێ، هەرکەس کە دەیەوێت قسە و هەڵوێستی کاریگەری هەبێت، بابایەخی زۆر بە زمانی بدات و ئاستی خۆی لە زمان پاراویدا بەرزبکاتەوە، وشەی جوان و نەستەق بەکار بهێنێت و ڕێزمان بخوێنێت و، هۆنراوە لەبەربکات و لە پەخشاندا شارەزایی پەیدا بکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ، ئاخاوتنی لەگەڵ خەڵکی دەکرد و بەجوانترین دەستەواژە دەیدواندن. بە ووشەی کەم و پڕ لە واتا، ئاخاوتنەکانی هەڵدەبژاردوو، قسەکانی لە چڵەپۆپەی جوانیدا بوون، پڕبوون لە سۆز و نەرمی و بەزەیی و واتاکانی ڕێزگرتن لەبەرامبەر، ئێمەش وەکو لە هەموو شتێکدا داوامان لێکراوە شوێن کەوتووی پێغەمبەر بین ﷺ لە ڕاستکردنەوەی زمان و پاراو ڕاگرتنی و لە چاکە بەکارهێنانی، بەهەمان شێوە ئەوەمان لێ داوا کراوە، بەتایبەتی لەم سەردەمەی کە ژیانی ماددی باڵادەستە، ئەوا زیاتر پێویستمان بە گفتوگۆی ناسك و جوان و هێمن و ئارام هەیە لەسەر ئاستی خێزانی و کۆمەڵگادا، دور لە گفتوگۆی مادی کلاسیکی.

## هونەری دەربڕین

یەکێك لە پاشاکانی فەڕەنسا فەرمانیدا لەمەودوا قەدەغەیە ئافرەتان زێڕ و زیو و هەر جۆرە جوانکاریەك بەکاربهێنن! بڕیارەکە هەلایەکی گەورەی نایەوە و ژنان نارەزایەتیان دەربڕی و، شار شلەژا و دەنگی نارەزایی لە هەموو لایەکەوە بەرز بۆوە، خۆپیشاندان دەستی پێکرد و ئافرەتان وەك تەحەددا کردنێکی ئەو بڕیارە، زیاتر لە جاران خۆیان بە خشڵ و ئاڵتون دەڕازاندەوە.. پاشا دۆش داما، خوایە چی بکات؟

بەپەلە بانگهێشتی گشت ڕاوێژکارەکانی کرد و لەگەڵیاندا کۆبۆوە و ڕاوێژی پێ کردن، هەر ڕاوێژکارە و ڕایەکی خستەڕوو، یەکێکیان وتی: بۆ بەرژەوەندی گشتی وای بەباش دەزانم لەو بڕیارەت پەشیمان ببیتەوە، یەکێکی تریان وتی: نەخێر، پاشگەزبوونەوە لە بڕیار نیشانەی لاوازی و بەڵگەی ترسانە، پێویستە هێزی خۆمانیان نیشان بدەین، ڕاوێژکارەکان بوونە دوو بەرەوە. شا وتی: هێواش، هێواش، بەزوترین کات حەکیمی شار بانگ بکەنەلام.. زۆری پێنەچوو حەکیم و دانا هات و، پاشا کێشەکەی لە سیرەوە تا پیاز بۆ باسکرد. حەکیمی دانا وتی: جەنابی پاشا، وەختێ تۆ چۆن مەیلت لێبێت بیربکەیتەوە و گوێ بە مەیلی ئەوان نەدەیت، خەڵکی ئامادەنین بە گوێت بکەن..

پاشا وتی: ئەی چارەسەر؟! بڕیارەکە هەڵبوەشێنمەوە؟!

حەكیم وتی: نا، بەس كەمێك دەستكاری بكە و ڕونكردنەوەی زیاتری لەگەڵدا بلاَوبكەرەوە، بڕیارەكە بابەم شێوەیە بێت:

(لەدوای دەرچونی ئەم فەرمانەوە، خانمانی شۆخ و شەنگ و ڕوخسار جوان، بۆیان نیە زێڕ و زیوو هەر ئامڕازێكی جوانكاری بەكاربهێنن، چونكە كەسێك كە خۆی جوانە، پێویستی بەبەكارهێنانی ئاڵتون و خشڵی جوانكاری نی یە.)

تێبینی: ئافرەتانی ڕووخسار ناشیرین و ئاولاَوی و پیرەژنان و ئەوانەی چونەتە ناو ساڵەوە، ئەم فەرمانەی پاشای وولاَت نایانگرێتەوە و دەتوانن بە ئارەزووی دڵی خۆیان خشڵ و ئاڵتون بەكاربهێنن و خۆیان بڕازێننەوە، تا لەو ڕێگەیەوە ناشیرینی و لۆچ و پۆچی دەم و چاو و ڕوخساریان دابپۆشن!

پاشا بە قسەی حەكیمی كرد و فەرمان بەو شێوەیەی وترا دەرچوو، زۆری پێ نەچوو، ڕەنگە هەر چەند سەعاتێكی بەسەر دەرچوونی فەرماندا تێپەڕیبێت، هەرچی ئافرەتی شار هەیە، زێڕ و زیویان لەخۆیان كردەوە و كەلوپەلی جوانكاریان لەخۆیان لابرد و هاتنە بازاڕ و خۆیان نیشانی یەكتردەدا، هەریەكە لەلای خۆیەوە خۆی بە شاجوانی وولاَت دەزانی و وای دەبینی لەو كەسانەیە كە پێویستان بە جوانكاری نیە!!

حەکیم و دانا بە پاشای وت: بینینت؟ تەنها کاتێك لە گۆشە نیگای ئەوانەوە لە دونیا دەڕوانیت، دەتوانیت جڵەوی خەڵکی لە دەست بگریت.

کەواتە: داڕشتنی ڕستە و ڕێکخستنی جۆری دەربڕین، هونەرێکە دەبێت فێری ببین و زانستێکە پێویستە شارەزای بین.. ئەویش لە ڕێگەی بەستنەوەی ئەو شتەی لێیان دەخوازین بەو شتانەی حەزیان لێیەتی و، پێش خستنی ئەمەیان و وەلانانی ئەو شتانەی حەزی پێ ناکەن و، دورکەوتنەوە لە سەپاندنی ئەوەی خۆمان حەزمان پێیەتی، پێویستە نیشانیان بدەین لە حاڵەتێکدا بە گوێمان بکەن چ سودێکیان دەست دەکەوێت، لە هەمووشی گرنگتر هیچ شتێك وەك وتەی شیرین و بەشۆخیەوە قسەکردن و نەرم و نیانی و نیەت پاکی کاریگەر نیە. {ئاو و ئاور، هێمن خورشید، ل١٨٣}.



## چوارەم: کەی قسە دەکەین؟

دەوترێت: گوێگرتن زانستێکی قورسترە لە قسەکردن، هەندێکجار باشترین وەڵامە بۆ هەندێك پرسیار، بۆیە جوانترین شتە کاتێ: پابەند دەبین بە گوێگرتن لەو کاتانەی کە پێویستە. بۆیە لە قسەکردندا وەك چۆن ماف بە خۆمان دەدەین، دەبێ بۆ هەمان مەبەست پێشێلی مافی بەرامبەریش نەکەین، تەنانەت دروست وایە زیاتر گرنگی بە گوێگرتن بدەین، قسە بە بەرامبەر نەبڕین.. خودای

گەورە دوو گوێ و یەك دەمی پێ بەخشیوین، هەر بۆیەش لە هونەری قسەکردندا وا پەسەندە لەکاتی پەیوەندی کردندا گوێگرتنمان دوو ئەوەندەی قسەکردن بێت. هەر لەبەر ئەمەش دەوترێت: (گوێگری باش کەسێکی کارامەیە لە پەیوەندی کردندا). بۆیە گوێ گرتنی باش بەیەکێك لە خاسیە هەرە گرنگەکانی کارامەیی پەیوەندیکردن دادەنرێت، کەواتە دەبێ فێری ئەوە بین کەی قسە بکەین.

**چەند پەیڤێکی جوان لەبارەی کەم قسەکردن و خۆ دورگرتن لە زۆربڵێ یی:**

١) **(إعادَةُ الحَديثِ أَشَدُّ مِنْ نَقْلِ الصَّخَر)** زۆر دووبارەکردنەوەی قسە و هێنان و بردنی و، درێژدادڕی کە هەمووی لەچەند ووشەی کورت و پوختدا کۆدەبێتەوە لە بەرد کێشان گرانترە !

٢) **(مَنْ لَمْ ينشط لِحَدِيثِكَ فَارْفَعْ عَنْهُ مُؤنَةَ الإسْتِماعِ مِنْكَ).**

هەر کەسێك بە تامەزرۆییەوە گوێ بۆ قسەت نەگرێ، تۆش کۆڵی قورسی گوێگرتن بۆ قسەتی لەسەر لابەرە و قسەکەت ببڕە، با لێت نەیەتە وەلام.

٣) (**لا تطعم طعامك مَنْ لا يَشْتَهيه، وَلا تقبل بِحَديثك عَلى مَنْ لا يقبل عَلَيْكَ بِوَجْهِهِ**). خواردنەکەت مەدە بە کەسێك کە حەزی لێی نی یە، بابەلای خۆتەوە خۆشترین خۆراك بێت، وە ڕووی قسەشت مەکە کەسێك کە ئەو ڕووی دەم و چاوی ناکاتە تۆ!

٤) (**حَدِّثِ النّاسَ ما حَدَجُوكَ بِأَبْصارِهِمْ، وَ أذنُوا لَكَ بِأَسْماعِهِمْ، وَإِذا رَأَيْتَ مِنْهُمْ فترة فَأَمْسِك**). قسە بۆ خەڵكی بکە تا ئەو کاتەی کە بەچاویان لێت دەڕوانن و، بە دڵ گوێیان بۆ گرتوی و هەموو لاشەیان گوێ و چاوە بۆ قسەکانت. ئەگەر زانیت بێتاقەت بوون و باوێشك دەدەن و سەر بەرەو زەوی نەوی دەکەن و، خۆیان بەشتی ترەوە مەشغوڵ دەکەن. تۆش قسەکانت ببڕە و کۆتایی بە باسەکەت بێنە. {البَيان وَ التَّبين، الجاحظ، ج٢ ص١٢١}.

هاوەڵانی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ لە پێغەمبەری سالار و سەنگینەوە فێری ئەوە ببون، کە خۆیان بپارێزن لە درێژەدان بە قسە بە شێوەیەك بەرامبەر تاقەتی گوێ گرتنی نەمێنێ، وەکو ئەم فەرموودەیە باسی دەکات:

ئەبو وائیل فەرمووی: عبدالله ی کوڕی مەسعود، عادەت و دەستوری وابوو، هەموو ڕۆژی پێنج شەممەیەك، ئامۆژگاری دەکردین و وتاری بۆ دەخوێندینەوە، ڕۆژێکیان پیاوێك پێی وت: خۆزگە هەموو ڕۆژێك ئاوا ئەم وتارە خۆش و بەسودانەت بۆ دەگێڕاینەوە، بۆ تەنها هەر پێنج شەممە بێ، با هەموو ڕۆژێك بێت.

عبدالله ی کوڕی مەسعودی گەورە هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە وەڵامی ئەو پیاوە و پێشنیارەکەیدا فەرمووی: (**أَما إِنَّهُ يَمْنَعُني مِنْ ذالِكَ أَنِّي أَكْرَهُ أَنْ أَمِلَّكُمْ وَ إِنِّي أَتَخَوَّلُكُمْ بالْمَوْعِظَةِ كَما كانَ رَسُولُ اللهِ يتخَوَّلُنا بِها مَخافَةَ السّامَةِ عَلَيْنا**) متفق عليه، بُخاری: (٧٠) وَ مُسْلِم: (٢٨٢١).

واتە: من لەبەرئەوە هەموو ڕۆژێ وتارتان بۆ ناخوێنمەوە و کردومە بە هەفتەی ڕۆژێك؟ چونکە حەزناکەم وەرستان بکەم، منیش وەك جارانی پێغەمبەر ﷺ چۆن ئەو ناوبەناو پەندی دادەداین و ئامۆژگاری دەکردین، نەبادا ئەگەر هەموو ڕۆژێ وتارمان بۆ بدات، جارس و وەڕس ببین، منیش ئێستا لەگەڵ ئێوەدا ئاوا دەکەم و چاو لەو دەکەم.

لە فەرموودەیەکی تردا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**إِنَّ طولَ صَلاةِ الرَّجُلِ، وَ قِصَرَ خُطْبَتِهِ، مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ، فَأَطيلوا الصَّلاةَ، وَ أَقْصِروُا الخُطْبَةَ**) رَواهُ مُسْلِم: (٨٦٩).

واتە: نوێژی درێژ و وتاری کورت، نیشانەی ئەوەیە ئەو وتاربێژە کەسێکی زانا و شارەزایە، کەواتە درێژە بە نوێژبدەن و وتار کورت بکەنەوە.

بەڵێ ئەمە ئەگەر لە ڕواڵەتدا بۆ وتار و نوێژی هەینی یە، بەڵام هەموو جۆرە وتارێك دەگرێتەوە، لەبەرئەوەی وتاری کورت و پوخت لە دوو لاوە سود دەگەیەنێ:

١) خەڵکی وەرس نابن و بە تامەزرۆیی یەوە گوێ دەگرن.

٢) ئەوەی دەیبیستن وەری دەگرن و دەزانن دواتر بیگێڕنەوە بۆ کەسانی تر. وە خۆیان دەتوانن کاری پێ بکەن، چونکە بابەتەکە شتانێکی کەمی ئاماژە پێکردووە، لەبەرئەوەی قسەی دوور و درێژ هەندێکی لەناو دەبات و کەسی گوێگر کەمی لەبیر دەمێنێ و لەناو ئەو هەموو قسە و بەسەرهات و فەرمان و نەهیەدا، نازانێ چی بیستوە!

بەڵێ بۆ نوێژیش مرۆڤ ئەگەر بەتەنها نوێژی کرد، مافی خۆیەتی و ئارەزووی خۆیەتی ـ ئەگەر مافی کەسانی تری پێشێل نەدەکرد ـ چەندە درێژە بە نوێژەکەت بدات. بەڵام ئەگەر ئیمام و پێش نوێژی خەڵکی بوو، نابێ بڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی درێژ چاکە. نەخێر دەبێ لە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ درێژتر نەبێ و لەو سوڕەتە کورتانە زیاتر نەخوێنێ کە ئەو لە ئیمامەتدا خوێندونی.

لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەخنەی لە (مُعاذ) گرت، کە نوێژی عیشای زۆر درێژ کردبۆوە و خەڵکی وەڕس ببون. دواتر ڕەخنەی لە کەسە گرت کە نوێژی بەیانی بە ئیمامەت بۆ خەڵکی کردبوو، ئەوەندە نوێژەکەی درێژ کردبۆوە، خەڵکی لەکاروکەسابەت و چونە ناوبازاڕ بەزوویی دواکەوتبوون.

وە بەو جۆرە مەلا و پێش نوێژانەی فەرمووە: (أَيُّها النّاس، إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ). ئەی خەڵکینە، بەڕاستی لە ئێوە هی واهەیە خەڵکی لە دین دوردەخەنەوە. چەند کەس هەیە لە جەماعەتی مزگەوت خۆی دەپارێزێ لەبەر نوێژی لە ڕادەبەدەری درێژی ئیمامی مزگەوتەکە.

جائەگەر وتاری ئاینی و خوێندنەوەی قورئان و سوننەت بۆ خەڵکی، دروست نەبێ درێژەی پێ بدرێ و لە سنور بچێتە دەر، ئەی زۆر بلێی و دەم هەراشی و مەجال نەدان بەکەس کە قسەبکات. دەبێ چەند ناشیرین و قێزەون بێت و مرۆڤ سوک بکات لەبەرچاوی خەڵکی! لەبەرئەوە بالەکاتی قسەکردنماندا لەخوا غافڵ نەبین، بۆ کەسی تینو و ببین بە دڵۆپێك ئاو، ببین بە هاندەرێك بۆ کەسی ڕووخاو، وە خاوەنی قسەی هاندەرانە و گەشبینانەشبین بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دەیان ناسین.. خوای گەورە زمانێکی پاك و چاك بێژ و دڵێکی فراوان و سوپاسگوزارمان پێ ببەخشێ و لە ئاینەکەی خۆی زیاتر شارەزامان بکات. آمین.



## وانەی نۆزدەیەم:

# نەبی بە بەندەی پارەو سامان و لەخوا غافڵ نەبی!

## وانەی نۆزدەیەم:

## بابەت: لەخوا غافڵ مەبە و نەبی بە بەندەی پارەوسامان

❁ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ۝١ ٱلَّذِى جَمَعَ مَالاً وَعَدَّدَهُۥ ۝٢ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ۝٣ كَلَّا لَيُنۢبَذَنَّ فِى ٱلْحُطَمَةِ ۝٤﴾ الهمزة.

❁ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (تَعِسَ عَبْدُ الدِّينارِ وَالدِّرْهَمِ، والقَطيفَةِ وَ الخَميصَةِ، إنْ أُعْطِيَ رَضيَ، وَإنْ لَمْ يُعْطَ لَمْ يرْضَ). رَواهُ البُخاريُّ: (٦٤٣٥).

### سەرچاوەکان:


١) تەفسیری ڕامان، م.أحمد کاکە محمود.

٢) تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین.

٣) لا تَحْزَن، د.عائض القَرني، ص٦٠.

٤) بەرەو ئیسلام، ئەندازیار عثمان، ل٢٣٠.

٥) با لە بەسەرهاتەکان پەند وەرگرین، م.شێرزاد عبدالوهّاب، ل١٥١.

٦) گۆڤاری (پزیشك) ژمارە: ١٠، حوزەیرانی ٢٠١١، ل٤٤.

٧)

٨) ڕۆژنامەی (وەرچەرخان) ژ: ١٦٧، ٢٠١١/١٠/٢.

٩) تەفسیری کوردی، مەلای گەورەی کۆیە. ب١٠، ل٥٠٣.

١٠) گۆڤاری (دوانگە) ژمارە: ٤، ل٨ نوسینێکی (م.تحسین حمە غریب).

١١) موسوعة الخُطب المِنْبَرِيَّة، سَعد يوسف أبو عَزيز، ج١، ص٢١٨، ص٢١٣.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين. وَ الصَّلاةُ وَالسَّلام عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ أجْمَعِينَ:

یەکێك لەو شتانەی کە بۆتە باس و خواسی هەموو کۆڕ و مەجلیس و دانیشتنێك، وە بۆتە هیوا و هیوایەتی زۆربەی هەرە زۆری مرۆڤەکانی ئەمڕۆ بریتیە لە (پارە). پارە ئەو شتەی کەوەکو ئامێرێکی دووسەر وایە. هەم چاکە و خێری پێ ئەنجام دەدرێ، وە خزمەتی دین و ژینی مرۆڤەکانی پێ دەکرێ، بەڵام ئەگەر بەدەست کەسانێکەوە بوو کە لەخوا غافڵن، یان لە چاوێکەوە سەیری کرا کە لە خوا غافڵن، ئەوا دەبینین زۆربەی زۆری تاوانە گەورەکان هەر لەسەر (پارە) دەکرێ.

## ئەو تاوانانەی پارە هۆکارێکی سەرەکیە تیایدا:

١) **کوشتن:** ڕۆژانە دەبیستین و دەبینین و دەخوێنینەوە کە چەند مرۆڤ لەسەر پارە دەکوژرێن. ڕووداوی زۆر دڵتەزێنی چاوەڕوان نەکراوی بڕوا پێنەکراو ڕوودەدەن، کە بەهۆی پارەوە مرۆڤ دەکوژرێ. لەلایەن نزیکترین هاوڕێ و کەسی متمانە پێکراوی خۆیەوە، تەنها لەبەر پارەکەی!!

٢) **دەنگ دابڕین:** دەبینین دوو کەس هیچ کێشە و دوژمنیایەتیەکیان لە نێواندا نیە، بەڵام بەهۆی ئەوەی پارەیەك

دەکەوێتە نێوانیانەوە، ئەم دوو مرۆڤە تا مردن قسە لەگەڵ یەکتری ناکەن، وە چەندین کەس هەیە لە ئەهلی بازاڕ و کەسابەت کە تەنها پارە دەنگی پێ لەیەکتردا دابڕین.

٣) **ڕق و کینە:** کەسێکی هەژاری نەدار، زۆرجاری ڕقی لە کەسێکی دەوڵەمەندە، تەنها لەبەرئەوەی کە ئەم نیەتی و بە کوێرەوەری ژیان بەسەردەبات و، ئەویش زۆری هەیە و خۆش دەژی. تەنانەت شورشی چینایەتی و خەباتی کرێکاری دژی سەرمایەداری هەر لەسەر ئەو بنچینەیە دروست بووە..

ئیسلام بۆ لابردنی ئەم مەترسیە و لابردنی ترس لە دڵەکاندا و لابردنی ڕق وکینە لەدڵی هەژاردا بەرامبەر دەوڵەمەند و، لابردنی بە سوك تەماشاکردن لە چاوی دەوڵەمەندا بەرامبەر بە هەژار، هاتووە هانی دەوڵەمەندان دەدات کە جگە لە زەکاتی شەرعی واجب، خێر و بەخشندەیی زۆر ئەنجام بدەن بەرامبەر بە هەژار و نەدارەکان و، ئەو ماڵ و سامانە لە دەستی ئەماندا قەتیس نەبێ و هەژار هەر تەماشاکەری بێت. ﴿كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ﴾ الحشر:٧.

٤) **حەسودی:** ئەو تاوانە گەورەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەیەوە فەرموویەتی: **(لايَزالُ النّاسُ بِخَيْرٍ مالْمْ يَتَحاسَدُوا)** رَواهُ الطَّبَراني. واتە: خەڵکی بەردەوام لە خێر و چاکەدا دەژین

هەتا ئەو کاتەی کە حەسودی بەیەکتری دەبەن. کە حەسودیان بەیەکتر برد ئەو کاتە لە خێر دەترازێن و بەرەو شەڕ دەڕۆن.. بەڵێ هەر لەسەر پارەیە کە دەوڵەمەندێ کە خۆی لە هیچی کەم نی یە حەز بە لەناوچوونی دەوڵەمەندێکی تر دەکات و، لە ناخەوە بەشکست و زەرەرمەندبونی خۆشحاڵە. ئەمەش هەمووی سەرچاوەکەی حەسودی ناودڵە.

٥) **بەدڕەوشتی:** هەر بۆ پارەیە کە کەسانی خراپەکار توشی بەدڕەوشتی دەبن. ئافرەتان و پیاوانی زیناکار و فاحیشەچی خۆ لەزەت لە چێژ لەو گوناهە وەرناگرن. زۆریان بۆ بەدەست هێنانی پارە دەیکەن!

٦) **پێشێلکردنی ماف:** پێشێلکردنی مافی کەسانی تر و گوێ پێ نەدانیان بەهۆی سەرقاڵ بون بە کۆکردنەوەی پارەوە. چەند باوك هەیە ماڵ و منداڵی پشت گوێ خستوە و، لێیان بێ ئاگایە کە توشی چی دەبن؟! یان بێ بەشی کردون لە سۆز و خۆشەویستی باوك و وەکو هاوڕێیەك لەگەڵیان دانانیشێ دوو قسەی خۆشیان لەگەڵ بکات، هەر خەریکی پارە کۆکردنەوە و ژماردن و ناردن و وەرگرتنیەتی. وە چەند کەس هەیە سیلەی ڕەحمی پچڕاندووە و، لەبرا و لە خوشکی هەژاری ناپرسێ و سەردانیان ناکات و

پێداویستیەکانیان دابین ناکات، هەمووی بەهۆی هەوڵی زیاد لە پێویست بۆ پارە کۆکردنەوە.

٧) **سوك سەیر کردنی خەڵکی:** لە بەلاّی گەورەی پارە ئەوەیە کە نرخی مرۆڤی پێ دیاری بکرێ. ئەمڕۆ وای لێهاتووە ئەگەر پارەت هەبوو، خەڵکی ڕێزت لێدەگرن. ئەگەر نەتبوو، خۆت لێ بەدوور دەگرن و بەچاوی سوك تەماشات دەکەن. بەڵێ لای کەسانێك نرخ و سەنگی مرۆڤ بەو پارانەوەیە کە هەیەتی.

زانای گەورەی کورد، مەلا محمدی جەلی زادە ـ مەلای گەورەی کۆیە، لە تەفسیرەکەیدا ب١٠، ل٥٠١. دەفەرمووێ: لە ڕۆژگاری منالّیمدا، باوکم هەندێ شعری کوردی بۆ دادەنام و فێری دەکردم. یەکێ لەو شعرانە ئەوەبوو:

ئەوی ماڵی نەبێ قوربان هەنووکە
لەوی ماقوڵترە خواجە حەنووکە.

دیارە (خواجە حەنووکە) کابرایەکی ناموسڵمانی هەژاربووە، خەڵکی بەچاوی سوك تەماشایان کردوە و گرنگیان پێ نەداوە، ئەویش فەرموویەتی: ئەگەر پارەت نەبوو، لەبەرچاوی خەڵکی ئەمڕۆ (خواجە حەنووکە) بەو هەموو سوکی خۆیەوە لەتۆ بەنرختر دەبینن!!

شاعیری کورد (کەمال ئەسعەد چەرمەگا) بەشیعر ئاوا باسی پارە دەکات:

کە پارەت هەبوو پیاوێکی چاکی
بێ نرخ و فەڕ بی لە ڕیزا تاکی.

ڕێوی بی ئەتکا بە شێری ژیان
کڕنوشت بۆ دێ پێت دەڵێن قوربان!

سەرداران سەرت بۆ ئەنەوێنن
ناحەقت بەحەق بۆ ئەسەلمێنن.

هەر تۆ ڕاست ئەکەی قسەی ئەم خەڵکە
گەر فەیلەسوف بن بێ سود و کەڵکە

زانایان لەلای تۆ نەزان ئەبن
لەشەرمی ڕوتا بێ زوویان ئەبن

سامی ئازاییت وەك شێری ژیان
بەڕووی عالەمدا خۆی ئەدا نیشان.

سەد عەیبت هەبێ هەر هەمووی وونە
لەگەڵ ناحەزتا عالەم دوژمنە.

ڕێی چەوتیش بگری، پێت ئەڵێن بەخوا
هەر ئەو بە ڕێگەی ڕاستیا ئەڕوا.

ژنەکەت ئەگەر پیر و داماو بێ

پیری ژنێکی کوێری بێ چاو بێ.

مارەت کردبێ لە پاش حەفتا شوو

کە پێنجی و دەیی سور و شینت بوو.

گوایە برۆ و چاو هەر لە خۆی جوانە

گەر ئایشە شێت بێ خانی خانانە.

بەڵام: کە پارەت نەبوو هەژار بووی

بۆ پارەداران هەڵگری بار بووی.

ئەگەر لە نەوەی ڕەسولی خوابی

لەگەڵ هیچ کەسا ئاشنا نابی.

بێ ئەوەی باوکی کەست کوشتبێ

هەروەکو خوێنی خەڵکیت ڕشتبێ.

ئاوا ملکەچی و دایم بەد ناوی

ڕۆستەمی زاڵ بی هێشتا ناپیاوی.

بەڕێی ڕاستیشا بڕۆی ئەکەوی

نە ئاسمان ئەتبا و نە ئەتخوا زەوی.

کەواتە بمرە تاجاو هەرزانە

پیاوی بێ پارە بەشی نەمانە.



### ٨) گومانی خراپ بەخوا بردن:

لە بەڵای هەرە گەورەی پارە بۆکەسی ناتێگەشتوو لە ئیسلام، ئەوەیە کە لەکاتی هەژاریدا گومانی خراپ بەخوا ببات ـ نَعُوذُ باللهِ. هەروەکو خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَأَمَّا ٱلۡإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكۡرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَكۡرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾﴾ الفجر.

واتە: کاتێك ئادەمیزاد لەلایەن پەروەردگاریەوە تاقیدەکرێتەوە، رێزی لێدەگرێت و پارە و سامانی زۆری پێ دەبەخشێت، هەندێ لەوانە بە ئاشکرا، یان لە دڵی خۆیاندا دەڵێن: بەخوا وادیارە پەروەردگارم منی خۆش دەوێت و رێزم هەیە لەلای بۆیە ئەم هەموو سامان و پارەی پێ بەخشیوم. بەڵام کاتێك خوای گەورە ئادەمیزاد تاقیدەکاتەوە بە هەژاری و کەمدەستی و توشی زیان دەبێت لە سامانیدا، لە دڵی خۆیدا یان بە ئاشکرا دەڵێت: وا دیارە پەروەردگارم خەشمی لێگرتووم، بۆیە ئاوا سوکایەتیم پێ دەکات و زیانم لێ دەدات و ریسوام دەکات!

بەڵێ ئەمە پەنا بەخوای گەورە، گومانی خراپە بەخوای پەروەردگاری هەمیشە بەخشندەی کاربەجێ کە پەنا بەخوا بەهۆی پارەوە بەدڵێ مرۆڤدا دێ. خوا پەنامان بدات.

بۆچی پارە گەشتە بەنرخ و باشەکانی پیّ ئەنجام دەدریّ، ئەم هەموو خراپەشی لە پەنادا دەکریّ؟! لە وەلامدا دەلّێین: یەکێك لە بەلّگە نەویستەکانی زانستە کۆمەلاّیەتیەکان، بریتیە لە گۆڕینی جێگەی شتەکان لە سەردەمەکاندا ئەگەر ئەو شتانەش نەمابن، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕێسایە دەبیّ نمونە بهێنینەوە. بۆ نمونە: سیستمی (پارە). خۆ پارە لەم سەردەمە و پارە لە زەمەنە پێشوەکاندا هەر پارەیە بەلاّم جێگەکەی گۆڕاوە.. با مەبەستەکە ڕوونتربکەینەوە:

زوو زوو ئەو دەمانەی کە پارە داهات، کاتێك مرۆڤەکان هەستیان کرد شتە گەورە و قەبەکانیان بۆ ناگۆڕدرێتەوە، یان کاتیّ زانیان ناتوانن زۆرێك لە شتەکان لەت بکەن بۆئەوەی بایی بەشێکیان شت بکرن، ئەو کەسەی بایی ڕانێکی مانگا زیندوەکەی گەنمی دەویست نەدەکرا بیّ لەناو بردنی هەموو مانگاکە بایی ڕانێکی ئارد بکرێت، ئەوەبوو بیری مرۆڤەکان پارەی داهێنا، ئەو پارەیەی وورد و لەت دەکرێتەوە و هەمیش بچوکە و دەچێتە باخەلّ و بە ئاسانی هەلّدەگیرێت. بەکورتی: پارە بۆ (ئاسانکردنی گۆڕینەوەی شتەکان)داهات.

بەلاّم ئەمڕۆ کاتیّ بە وردی سەیری پارە دەکەیت دەبینیت لەو کارەی ترازێنراوە، سەرەڕای بونی شتەکان بۆ گۆڕینەوە، بەلاّم پارە ڕێگیرە لە ڕێی گۆڕینەوە.!

بۆ نمونە: ئیمەی خەڵکی جیهانی ئیسلامی شتمان هەیە لەگەڵ شتە ڕۆژئاواییەکان بیگۆڕینەوە. بەڵام چونکە پارە لە دەست ئەواندا قۆرخە سەرەڕای بونی ئەو شتانە ئێمە برسی و ڕوت و ڕەجاڵین. کەواتە پارە لە کارە بنەڕەتیەکەی ترازاوە (ئاسانکردنی گۆڕینەوە) بۆ کارێکی پێچەوانە، کە ئەویش ڕێگرتنە لە ڕێی گۆڕینەوە دا.

هەروەها جاران کە پارە دانرا، پارە وەسیلە و هۆکاربوو، ئێستا بۆتە هیوا و خولیا و ئاوات و ئامانج هەر گرنگ کۆکردنەوەیەتی و ژماردن و لەسەر یەك دانانیەتی.

کە قورئانی پیرۆز لە هاتنە خوارەوەیدا باسی خەتەرناکی ئەمەی کردوە، کە پارە لە جیاتی ئامڕازبێ. ببێ بە ئامانج، لەجیاتی ناو گیرفان و دەستدا بێ. بچێتە ناو دڵی مرۆڤەکان و تەواوی دڵێ مرۆڤ داگیر بکات و، هەموو جوانیەکان لە خۆشەویستی و بەزەیی و هاوکاری و دەست گیرۆیی بکاتە دەرەوەی دڵ و، مرۆڤێکی ماددی و پولەکی پارە پەرست دروست ببێ، کە زیاتر لە ڕۆبۆت دەچێ کە تەنها کاردەکات و پارە کۆدەکاتەوە و هیچ هەست و نەستێکی نیە.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ۝١ ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ ۝٢ يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ ۝٣﴾ الهمزة.

واتە: سزای سەخت بۆ هەموو توانج گرێکی عەیبگر، واتە: ئەو کەسەی ناوی خەڵك بەخراپە دەبا و بەشوێن کەم و کوڕی و نەنگدا دەگەڕێ، ئەو کەسەی کە ماڵێکی زۆری کۆکردەوە و هەر خەریکی ژماردنی بوو، ئیتر بێ لێکدانەوەی حەڵاڵ و حەرام، واتە: ئەوانەی کە ناوی خەڵکی دەبەن بە خراپە، هەر ئەو دەوڵەمەندانەن کە بەهۆی سامانەکانیانەوە خۆبە گەورە دەگرن و بەسووك سەیری خەڵکی دەکەن، ئەو کەسانە وا خەریکن بەدونیاوە، پێیان وایە ماڵ و سامانەکەیان بەیەگجاری لەدنیادا دەیانهێڵێتەوە و هەرگیز نامرن، بۆیە ڕەفتاری وادەکەن.

بەڵێ ماڵ و سامان پێویستی ژیانە و هەوڵدان بۆی بە حەڵاڵی و لە شوێنی شیاوی خۆیدا زۆر چاکە، بەڵام ﴿جَمَعَ مَالاً وَعَدَّدَهُۥ﴾ هەر کۆی بکەیتەوە و بیبژێری و لەسەر یەکی دانێ و نەخۆت نەکەس خێری لێ نەبینێ تا کوتوپڕ بەجێی دێڵێ، ئەمە خراپە.

یان قورئان دەفەرمووێ: ﴿وَتُحِبُّونَ ٱلْمَالَ حُبًّا جَمًّا ﴿٢٠﴾﴾الفجر. واتە: ماڵ و پارە و داراییان خۆشدەوێت بە خۆشویستنێکی زۆر، بەجۆرێ ئابڕوی خۆیانی لەسەر دادەنێن!! ئەوەندە پارەیان خۆشدەوێ، زۆرجار حەقی خوای لێ دەرناکەن، هەر لەبیری زۆرکردنیدان و گوێ بە حەڵاڵ و حەرام نادەن.. {تەفسیری ڕامان و ڕۆشن}.

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، (د. عائض القَرَني، لە تەفسیرە کورت و پوختەکەیدا ـ التَّفسر المُیَسَّر) دەفەرمووێ: **(وتُحِبُّونَ جَمْعَ المالِ حُبَّاً شَدیداً، تفنونَ مِنْ أَجْلِهِ الأَعْمار، وَ ترکبونَ في سَبیلِهِ الأَخْطار، وَ تکثرونَ لِتَحْصیلِهِ الأسْفار، وَ أَکثَرُ النّاسِ عَبیدٌ لِلْدِرْهَمِ وَالدِّینار).**

واتە: لەڕادەبەدەر پارە و ماڵی دنیایان خۆشدەوێ، هەموو تەمەنی خۆیان بۆ پارە کۆکردنەوە تەرخان کردوە، چەندین ڕێگای ترسناك و لەناوبەریان بڕیوە بۆی، زۆر شەونخونی و بەری بەیانیان لەجیاتی یاد و زیکری خوا بە ژماردن و ناردن و وەرگرتنی پارەوە بەسەر بردوە، وە لە هەموو کەس زیاتر بەندەی دیرهەم و دینارن و لەجیاتی پارە خزمەتیان بکات. ئەوان خزمەتی پارەن!!



## نەخۆشی پارە پەرستی و کۆکردنەوەی پارە:

(د. عائض القَرني) لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (لاتَحْزَن) بەسەرهاتێکمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ: پزیشکێکی هاوڕێ و خۆشەویستم کە زۆر کەسێکی دیندار و ڕاستگۆیە و، یەکێکە لە پزیشکە بەناوبانگەکانی شاری (ریاض) لە سعودیە بۆی گێڕامەوە و وتی: یەکێ لە بازرگانە زۆر بەناوبانگ و دەوڵەمەندەکان بەهۆی نەخۆشییەکەوە هاتە نۆڕینگە (عیادە)کەم و، منیش دوای گوێگرتن و ئەنجامدانی چەند پشکنینێك بۆی، جۆری نەخۆشییەکەو چارەسەرەکەیم بۆ دیاری کرد و، پێم گوت:

سەرەڕای بەکارهێنانی ئەم دەرمانانە بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەت، ئەوەی کە لە هەمووی گرنگترە ئەوەیە کە ماوەیەك پشوو بەخۆت بدەی و لە شوێنێکی هێمن و ئارامدا ئیسراحەت بکەی، چونکە دیارە تۆ جگە لە جەستەت مێشکت زۆر ماندووە و دەبێ پشوو بە مێشکت بدەی.

وتی: ئاخر دکتۆر گیان خۆ من کات هی خۆم نیە تا پشووی تێدا بدەم. من شەو و ڕۆژ خەریکی هاتن و چوون و سەفەری ئەم وولات و ئەو وولاتم، خەریکی ئیمزاکردنی گرێبەستی کۆمپانیا و بازرگانی و ناردن و هاوردەم. خەریکی کۆبونەوەم لەگەڵ ستافی کارەکەم.

بەخوا هیچ کات و دەرفەتم نەماوە بۆ پشوودان! !

وتم: بۆ تۆ سەروەت و سامانت چەندە؟!

وتی: من خاوەنی چەندین بازاڕ و ڕیزە دوکانم، خاوەنی چەند کۆمپانیا و ئوتومبێلی بار و کۆگای گەورەم. لە زۆربەی وولآتانەوە کەلوپەل دێنم و بۆیان دەنێرم! ئەوەی لەبەرچاوبێ نزیکەی بایی سێ ملیار ڕیاڵم هەیە!!

دکتۆرەکە دەڵێ: پێم وت: باشە ئەو پارەی هەتە ئەگەر دابەشی بکەیت بەسەر ڕۆژەکانی تەمەنت ـ ئەگەر درێژترین تەمەن بۆ خۆت دابنێی، وەتەمەنی کوڕ و کچەکانت. وە نەوەکانیشیان، هێشتا لێتان زیادە، ئەگەر هیچ جۆرە ئیش و کاسبیەك نەکەن و یەك ڕیاڵیش پەیدا نەکەن.

بەلآم خۆ من نەموتووە تۆ هەرگیز کاسپی مەکە، دەڵێم ماوەی چەند ڕۆژێك پشوو بەخۆت بدە، ئیتر ئەمەش بەخۆت ڕەوا نابینی کە بۆ سەلامەتی خۆتە و ژیانی داهاتوتی پێوە بەندە؟!

کابرای ملیۆنەر وەلآمی دامەوە و وتی: سوێند بە خوا ئەی دکتۆر ناتوانم لە ماڵەوە بۆ کاتژمێرێکیش بێ دابنیشم و پشوو بدەم. (**فَأَنا مُصابٌ بِمَرَضِ جَمْعِ المال**). من توشبووم بە نەخۆشی کۆکردنەوەی پارە و ماڵ، ئیتر لێم بۆتە نەخۆشی، ئەم مامەڵەیەم تەواو نەکردووە دەبێ دەست بە مامەڵەیەکی تر بکەم، ئەم پڕۆژەیەم تەسلیم نەکردووە، لە خەمی وەرگرتنی پڕۆژەیەکی تردام!

لە کۆبونەوەیەك هەڵدەستم و لە جیاتی پشوو دەچمە کۆبونەوەیەکی تری بازرگانیەوە، بۆیە هەرگیز کاتم نیە بۆ پشوودان.

دکتۆرەکە پێی دەڵێ: دەی بەخوا ئەمە خۆی لەخۆیدا بەدبەختی یە نەك خۆشبەختی!

سوێند بەخوا ئەگەر کەسێك تەنها بژێوی ژیانی ڕۆژانەی بەتێر و تەواوی هەبێ و، قەرزاری خەڵك نەبێ و کرێچی دەرگای خەڵك نەبێ و، پیشەیەکی ڕۆژانەی هەبێ کە بژێوی خۆی و ماڵ و منداڵی پێ دابین بکات و، ڕازی بێ بەو بەشەی خوا داویەتی و قەناعەتی لە دڵدا بێت، هەزار جار لەتۆی سەرمایەداری پارەدار خۆشحاڵتر و خۆش ژیانترە!

(د. عائض القَرني) دەڵێ: منیش پێم وت: قسەکەت زۆر ڕاستە و پێشتر (موتەنەبی) شاعیر ئەمەی بە شعر وتوە:

**وَمَنْ يُنْفِقِ السّاعات في جَمْعِ مالِهِ**
**مَخافَةَ فَقْرٍ فَالَّذي فَعَلَ الفَقْرَ**

واتە: هەر کەسێك هەمیشەی ژیانی هەر خەریکی کۆکردنەوەی پارە و سامان بێت، لەترسی ئەوەی نەوەکا هەژار بکەوێت. هەر ئەو کردەوەی کە دەیکات خۆی هەژاری یە و هەر ئێستا هەژارە!

## مرۆڤەکان دوو جۆرن:

### جۆری یەکەم: کەسانێکن پارە پەرستن:

پارە ناودڵی داگیرکردون و تەنها و تەنها بیریان لای پارەیە. پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمانەی ناو ناوە (بەندەی پارە) هەروەکو فەرموویەتی: (تَعِسَ عَبْدُ الدِّينارِ وَالدِّرْهَمِ...) البُخاري: (٦٤٣٥). واتە: بەهیلاك چێ و عەمری نەمێنێ بەندەی دینار و دیرهەم (دۆلار و دینار) کە هەر خەریکی کۆکردنەوەیەتی.

بەڕاستی بەهیلاك چووە و بەدبەختە ئەو کەسەی کەشێت و شەیدای پارەیە و هەموو شەوێ هەر دەیژمێرێ و ماچی دەکا و قسە لەگەڵ دینار و دۆلارەکانی دەکا و پێیان دەڵێ: ئای چەند جوانن، چەند بە نرخن، بەخوا بۆنتان خۆشە، بەخوا ناهێڵم لەم جێگایە بجولێن هەتا دەمرم، بڕۆنە ناو قاسە و بەئاسودەیی بخەون ئەی پارە نازدارەکانم، ڕوحم دەکەم بە قوربانتان، پاسەوانیتان دەکەم. هەرگیز بۆ خۆم و نە ماڵ و نە منداڵم نەکەس ناهێڵم دەستتان لێ بدات! حەزدەکەم هەمیشە هەر زۆربن!!

بەڕاستی ئەم بەندەی پارەیە هەژارن، داماون، هەرکۆی دەکەنەوە هەتا دەمرن، وەختێ مردن بەدەستی خاڵی دەڕۆن، نەخێر و خێراتێکیان لێکرد، نە چاکە و مەردایەتیەکیان بەو پارەیە کرد تا دوای مردنیان ستایشێکی خێریان بکرێ و ڕەحمەتێکیان بۆ

بچیّ، یان دوعای هەژاریکیان بەدەست نەهێنا کە لە تەنگانەی هەژاری و نەخۆشیدا، دەستیان بگرتایە و ئەویش لە ناخی دڵەوە دوعایەکی بۆ بکردایە و قەبری پیّ ڕووناك ببوایەوە..

یان زەردەخەنەی نەخستە سەر لێوی منداڵێکی نازداری بیّ باوك و دایکە بە شەرمە و شکۆکەی. تالەسەر تەرازوی چاکەی قیامەتی ئامادەبیّ و هەزاران گوناه لە ئاستیدا سوك و بیّ نرخ بیّ. بەڵیّ ئەم بەندەی پارەیە ژیانی دونیای هەر ڕاکە ڕاك و بەدبەختی بوو، هەر لە دنیادا ئەو پارە و سامانەیان بۆیان ببوو بە مایەی ئەشکەنجە و ئازاری دڵ و مێشکیان، شەوێك بە ئاسوودەیی سەریان نەکردە سەر جێگای خەویان، دڵیان جگە لە پارە ئەڤین و خۆشەویستی تێدا نەبوو بۆ هیچ کەس، تەنانەت بۆ هاوسەر و منداڵەکان و کەسوکاری خۆشیان!

زانایان لەبارەی ئەو بازرگانە پارە پەرستانەوە زۆر جوان فەرموویانە: (**وَأَمْراضُ التُّجارِ: فَقْرُ الدَّم، وَ كَثْرَةُ الهَمِّ، وَدَوامُ الغَمِّ**). واتە: نەخۆشی بازرگانی پارەداری پارەپەرست ئەمانەن: کەم خوێنی، مەراقی زۆر، غەمی بەردەوام!

لەبەرئەوەی: هەمیشە سەرقاڵە بە کڕین و فرۆشتن و وەرگرتنی پارە و ژماردن و تەلەفۆن کردن و تەلەفۆن وەلاّم دانەوە، لە وەختی نان خواردندا ئاگای لەخۆی نی یە هیچی خواردوە یان نا، چەند ژەم نانەکەی وەکو خۆی دەبەنەوە، دەستی بۆ نەبردوە،

هێندە مەشغوڵ بوە، نەیزانیوە کە نانەکەی نەخواردوە، بۆیە توشی کەم خوێنی و کەمی ڤیتامینەکان دەبێت!!

وە لەبەرئەوەی هەمیشە دڵی لای بەرز و نزمی دۆلار و گەیشتنی کەلوپەل و، کەشتی بازرگانیەکەی بە سەلامەتی و ناردن و هاوردەیە. بۆیە هەمیشە مەلاراق و دوو دڵی زۆرە و بەردەوام دڵی ناڕەحەتە!! چونکە قەناعەتی نی یە و هەر لە بیری زۆرکردنی پارە و پڕۆژەکانیدایە، بەردەوام دڵی بەخەمە و گەشی لە ڕوخساریدا نیە. چونکە دڵی بەیادی خوا ئاوەدان نی یە، هەر پڕ لە خەمە، ئەو قسەی پێ خۆشە کە باسی پارە و ئابوری و دەوڵەمەندبون بێ، بەو قسە و مەجلیسە و وتارە دڵی دەگیرێ کە باسی بەخشندەیی و هاوکاری هەژار و نەخۆش و دەربەدەر و داماوێکی تێدابێ!! بەڵێ سەرەنجام ئەم (بەندەی دینار و دیرهەمە، بەندەی پارە و پوڵە) هەر ڕیسوایی یە.

## لە هەژاریەوە بۆ دەوڵەمەندێکی ڕەزیل ﴿بەسەرهات﴾

لە وولاتی کوەیت گەنجێك هەبوو، تازە لە مێرد منداڵی ترازابوو، لەبەر هەژاری بنەماڵەکەی نەیتوانیبوو درێژە بە خوێندن بدات، ڕۆژانە بە پارەیەکی کەم کرێکاری دەکرد و هەندێ جار کاروکەسابەتیشی دەست نەدەکەوت، ڕۆژێکیان هاوڕێیەکی بینی، پێی وت: چۆنی؟

وتی: بەخوا زۆر خراپم، تەنانەت لە ماڵەوە دایك و باوکیشم لێم بێزارن، چونکە هەر نان دەخۆم و هیچ پەیدا ناکەم.

بەڕاستی لەبەر بێ ئیشی لەخۆم بێزارم، هاوڕێ یەکەی وتی: وەرە من دەتبەمە لای کابرایەکی خاوەن کارگەی بلۆك و خشت دروستکردن، ئەویش زۆری پێ خۆشبوو، چوە لای خاوەن کارگە و دەستی کرد بە ئیشکردن، شەو و ڕۆژی خستبوە سەر یەك، بەلاّم زۆر ڕەزیل بوو، خۆشەویستی پارە لەناو دڵیدا جێگیربببوو، هیچ یارمەتی ئەو دایك و باوکە بەساڵاچوە دەست کورتەی نەدەدا، کە چەندین ساڵ بوو بە هەژاری بەخێویان کردبوو، بەڵێ پارەی کۆکردەوە، وای لێهات لەگەڵ هاوڕێ یەکی ئوتومبیلێکی بارهەڵگری بە نیوەیی کڕی، هەر بەردەوام پارەی کۆکردەوە و بەنانەسکی خۆی ژیاند، تا توانی ئوتومبێلە بارهەڵگرەکە هەمووی بکات بەهی خۆی..

پاش ماوەیەك ئوتومبێلەکەی فرۆشت و بەشی کارگەیەکی کڕی. دواتر تەواوی کارگەکەی کڕی، بوو بە خاوەنی کارگەی خشت و بلۆك! بەلاّم چونکە پارە پەرست بوو، لەجیاتی سوپاسی خوا کە لە شاگردیەوە بۆتە خاوەن کارگە، دەستی کرد بە غەش کردن، موادی زۆر خراپی بەکاردەهێنا، پارەی زۆربوو، بوو بە خاوەنی چوار کارگە! ژنی هێنا و خانووی بەرزی دروستکرد.. جارێکیان

لەگەڵ خاوەن باڵەخانەیەکی چەند نهۆمی ڕێك کەوت کە خشت و بلۆکی تەواوی بیناکەی بۆ دروست بکات.

دەستی کرد بە خشت و بلۆك بڕین، بەلاّم هەرچی خراپ بوو ئەوەی تێدەکرد. بۆیە بلۆك و خشتەکانی زۆر بێ کەڵك بوون. بەڵێ پارتمانی کابرا لە تەواوبووندا بوو کە هەرەسی هێنا و ڕوخا! وە چەند کەس بریندازبوون و زەرەر و زیانێکی زۆری بە دەوروبەری گەیاند! لیژنەی لێکۆڵینەوە دروستکرا و دەرکەوت خراپی خشت و بلۆکەکانی ئەم کارگەیە هۆکاری ڕوخانی بیناکەبووە، کە تەماشایان کرد چی چیمەتنۆی خراپ و چەو و لمی قوڕاوی هەرزانە ئەوەی بەکارهێناوە. سەرەنجام دادگا بڕیاریدا، یان چوار ساڵ زیندانی بکرێ. یان بڕێکی زۆر پارە قەرەبووی بیناکە و زیان لێکەوتوان بدات!

بەلاّم ئەم پولەکی و پارە پەرستە دڵی نەدەهات نان بۆ ماڵ و منالّی بکڕێ. خۆی نانی نەدەخوارد، ئیتر چۆن زەرەر دەبژێرێ. بۆیە چوار ساڵ زیندانەکەی پێ باشتربوو، چوار ساڵی تەمەنی بەڕیسوایی لە زیندان بردەسەر، کە ئازادبوو، عێراق کوەیتی داگیرکرد و ئەمیش وەکو ئەو خەڵکە لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەی بەرەو سعودیە هەلاّت! کە کوەیت ئازاد کرا و خەڵکەکەی گەڕانەوە، تەماشایان کرد هەر چوار کارگەی ئەم کابرایە تالاّن کراون و پاشان سوتێنراون و هیچی نەماوە!! لەو شوێنەدا (بیست) کارگە و

مەعمەلی تر هەبوون کە خاوەنەکانیان کەسانی چاك و بەخشندە و حەڵاڵ خۆربوون، هیچیان لێنەهاتبوو! !

کابرای پارە پەرست کە ئەمەی بەچاوی خۆی بینی، ئەوەی بە مەینەتی چەندین ساڵە پەیدای کردبوو، وا لەپڕ هیچی نەما، پارەکانی کە لەناو دڵ و مێشکیدابوون، تیاچوون بۆیە دڵ و مێشکی بەرگەی ئەم کارەساتەی نەگرت و یەکسەر جەڵتە لێی دا و لایەکی لاشەی شەلەل لێیدا و مرد! لە ماڵەوە بە زەلیلی کەوت! بەڵێ ئەمە سەرەنجامی کەسی پارەپەرستە !

### ئاسودەیی بە پارە و ماڵ و سامانی زۆر نی یە

بەڕاستی تەنها ئیمان و ئیسلامە کە ئازادی و ئاسوودەیی و ئارامی و ئاشتی بۆ مرۆڤ دەهێنێت، نە ماڵ و منداڵ، نەتەخت و کورسی، نە پلە و پایە، ناتوانن ئەوانە فەراهەم بێنن ئەگەر ئیمان و بڕوای لەگەڵ نەبێت، باشترینی نمونەش لەمرۆدا (بیل گیتس)ە، کە نزیکەی (٦٥) ملیار دۆلاری هەیە و دەوڵەمەندترین کەسە لە جیهاندا، کە دەڵێت: ماڵ و سامان بەس نین بۆ بەختەوەرکردنی مرۆڤ، بگرە ڕەنگە بشبێت بەبەلا بۆ خاوەنەکەی، من هەست ناکەم کە سامانەکەم هەموو شتێکی بۆ بەدی هێنابم، من بە تەنها دەژیم و لە میحنەتدام بەدەست سامانەکەمەوە، خۆزگە ناودار نەبوومایە و دەوڵەمەندترین کەس نەبوومایە، خۆزگە هەژار بوومایە!. {بەرەو ئیسلام، ئەندازیار عثمان، ل٢٣٠}.

## جۆری دووەم: کەسانێکن سەروەتەکەیان بەهی خودا دەزانن:

عبدالله، بەندەی خوایە بەتەنها، کاسپی حەڵاڵ دەکات و حەزی لە پارەیە و کۆشی دەکاتەوە، بەڵام هەمیشە یەقین و دڵنیایی لەسەر ئەوەیە کە ئەمە هەمووی فەزڵی خوایە و بەرەکەتی خوایە نەك ئازایەتی و لێزانی و پیاوەتی خۆی. بەندەی ڕاستەقینەی خوا، حەزی لە پارەیە و هەوڵی بەدەستهێنانی دەدات، بەڵام لەسەر نەخشەیەك دەڕوات کە ئیسلام پێی داوە: چۆن و لە چ ڕێگەیەکەوە پەیدای دەکات، ئایا مەشروع و حەلاڵە یان حەرام و ناڕەوایە؟! وەچۆن صەرفی دەکات و بەچ شێواز و لەچ ڕێگایەکەوە بەکاری دێنێ؟! جا هەرکەس پەیداکردن و خەرجکردنی پارەی بەو شێوەیە بوو کە خوا پێی ڕازی یە. وە شەریعەت دیاری کردووە، ئەوە با دڵنیابێ کاروکەسابەت و پارە پەیداکردنەشی بە عیبادەت بۆ دەنوسرێ.

بەبەندەی ڕاستەقینەی خوا هەرچەندە پارەی حەڵاڵی هەبێ، هەوڵی زیادکردنی دەدا و بەبەرەکەتی خوای دەزانێ، ئیسلام فێری ئەوەمان ناکات کە پارە پیسە و بۆ کافر باشە و موسڵمان بە هەژاری بژی. نەخێر بە پێچەوانەوە ئیسلام هەژار دۆستە، بەڵام دوژمنی گەورەی هەژارییە.

**فەرمودەیەکی هیوا بەخش:**

**قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (بَيْنَما أَيُّوبُ يَغْتَسِلُ عُرْياناً خَرَّ عَلَيْهِ رِجْلُ جَرادٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَجَعَلَ يَحْثي في ثَوْبِهِ فَنادى رَبَّهُ: يا أَيُّوبُ أَلَمْ أَكُنْ أَغْنَيْتُكَ عَمّا تَرى؟ قالَ: بَلى يارَبِّ، وَلكِنْ لاغِنَى لي عَنْ بَرَكَتِكَ). رَواهُ البُخاريُّ: (٣٣٩١).**

واتە: ڕۆژێکیان ئەیوب پێغەمبەر ـ علیه السّلام ـ لە شوێنێکی چۆڵدا دور لە چاوی خەڵك خۆی دەشت و بەڕوتی و جلوبەرگەکەی دانابوو، لەوکاتەدا بە فەرمانی خوا کۆمەڵە کوللەیەك ـ ڕەوە کوللەیەك کە ئاڵتون بوون ـ ئاڵتونەکان لەسەر شکڵی کوللە ـ بەسەریا داباری!!

هەر خێرا ئەیوب جلوبەرگەکەی ڕاخست و بە مشت دەیکردە ناویەوە، لایەکی پڕدەبوو، لایەکەی تری پڕ دەکرد و خێرا خێرا ئاڵتونەکەی کەلەسەر شێوەی کوللەبوون، کۆدەکردەوە. پەروەردگاری ئەیوب بانگی کرد و فەرمووی: ئەی ئەیوب، ئایا ئەوەندەم ماڵ و سامان پێنەبەخشیوی کە پێویستیەکی ئەوتۆت بەم ئاڵتونانە نەبێت و ئاوا بە هەڵپە پەلاماریان نەدەیت و کۆیان نەکەیتەوە؟!

ئەیوب فەرمووی: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، زۆر زۆرت پێ بەخشیوم، بەلاَم هەرگیز دەوڵەمەندنیم و بێ نیازنیم لە بەرەکەتی تۆ. ئەمە بەرەکەتی تۆیە ئیتر چۆن بە هەڵپە کۆی ناکەمەوە!

زانای گەورە (إِبْنُ حَجر العَسْقَلاني) لە شەرحی ئەم فەرموودەیەکدا، لە کتێبە نایابەکەیدا: (فتح الباری ج٦ ص٥١٠) دەفەرمووێ: (**وَ فِي الحَديْثِ جَوازُ الحِرْصِ عَلى الأسْتِكْثارِ مِنَ الحَلالِ فِي حَقٍّ مِنْ وُثِقَ مِنْ نَفْسِهِ بالشُّكْرِ عَلَيْهِ، وَفيهِ تَسْمِيَةُ المالِ الَّذي يكونُ مِنْ هذهِ الجِهَةِ بَرَكَة، وَ فيه فَضْلُ غَنِيٍّ الشّاكِرِ**).

واتە: لەم فەرموودەیەی باسی ئەیوب پێغەمبەردا (علیه السَّلام) چەند وانەیەك وەردەگیرێ:

١) دروستە سوربون لەسەر دەوڵەمەندبوون و هەڵپە کردن بۆ پارە زۆرکردن و کۆکردنەوەی لە ڕێگەی حەڵاڵەوە، بۆ کەسێك کە متمانەی بەخۆی هەیە، کە هەرچەندە پارە و ماڵی زۆربێ لەخۆی ناگۆڕێ و توشی بوغرایی نابێ و تا دەوڵەمەندتربێ، زیاتر شوکری خوای لەسەر دەکات.

٢) لەم فەرموودەیەدا ئەوە دەردەکەوێ، ئەو پارە و سامانە لە ڕێگەی حەڵاڵەوە ـ(بە میراتی بۆی دێ، بەدیاری پێشکەشی دەکرێ، شتێکی کڕیوە و کتوپڕ نرخی دەیان جار بەرز دەبێتەوە و قازانجێکی خەیاڵی دەکات)ـ چاوەڕوان نەکراو دەستی دەکەوێ، پێی دەوترێ بەرەکەت!

٣) وە لەم فەرموودەیەدا، پلە بەرزی دەوڵەمەندی سوپاسگوزار، دەردەکەوێ، کە هەرکەسێ چەندە دەوڵەمەند بوو،

ئەوەندە شوکر و سوپاسی خوای کرد و لە چاکەدا بەکاری هێنا، خوا زۆری خۆشدەوێ و هەمیشە زیاتری بەسەردا دەرێژێ.

بەندەی ڕاستەقینەی خوا ـ عبدالله ـ مانای ئەوە نی یە، پارەی نەبێ. نەخێر، دەتوانێ یەگجار زۆری پارە هەبێ و هیچ کاتیش نەبێتە بەندەی دینار و دیرهەم (عَبْدُ الدِّينارِ وَالدِّرْهَمْ).

**فەرموودەیەك:** (پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ( پێغەمبەری خوا ـ ئەیوب ـ لە نەخۆشی و ئازارەکەیدا ماوەی (١٨) سالْ مایەوە، وای لێهات خزمی نزیکی و کەسانی دۆست و بێگانە هیچی تر سەردانیان نەکرد و زۆربەی کات بە تەنها دەمایەوە، تەنها دوو برادەری زۆر دلْسۆزی گیانی بەگیانی مانەوە کە پێیان لێ نەدەبڕی، هەموو بەیانیان و ئێواران سەرێکیان لێ دەدا..

ڕۆژێکیان یەکێ لەم دوو هاوڕێیە بەوی تریانی وت: دەزانی دەبێ ئەم ئەیوبە گوناهێکی زۆر گەورەی وای کردبێ، کە هیچ کەس گوناهی وا گەورەی نەکردبێ، هاوڕێکەی وتی: چۆن؟

بۆچی ئەو قسەیە دەکەی؟!

وتی: دەی ئەوەتا ئەو بۆ ماوەی (١٨) سالْە نەخۆشە و خوا شیفای نەداوە، مالْ و سامان و ئەولادەکانیشی لێ وەرگرتۆتەوە! دیارە ئەمە سزای گوناهێکی گەورەیە!

کاتێ لەیەك جیابوونەوە، کابرای هاوڕێی ئەیوب پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەربێ، خۆی بۆ نەگیرا و نەیتوانی ئەم قسەی بۆ نەگێڕێتەوە، کەبۆی گێڕایەوە، حەزرەتی ئەیوب فەرمووی: من نازانم ئەو برادەرە باشەم بە چ نیازێك ئەو قسەی کردووە، بەڵام خوای گەورە خۆی دەزانێ من بەلای دوو کەسدا تێپەڕیوم کە دەمەقاڵێ و دەمە بۆڵەیان بووە و ناوی خوایان هێناوە ـ ئەو وتوویەتی: خوا دەزانێ وایە و ئەو وتوویەتی: بەخوا وانیە، من کە گوێم لەوەبووە، هاتومەتەماڵەوە و لەپارەی خۆم کەفارەتی دوو سوێندم بۆ داون، لەبەرئەوەی هێندەم پێ ناخۆش بووە کە ناوی خوا لە غەیری حەقدا بهێنرێ!!

بەڵێ، ئەیوب پێغەمبەر ـ علیه السَّلام ـ ڕۆژێکیان دوای ئەو هەموو ساڵ نەخۆشیە، ویستی بچێ بۆ سەرئاو و پێویستی خۆی، خێزانەکەی دەستی دەگرت ـ دیارە نەخۆشیەکەی وەکو ڕۆماتیزمە وابووە و قاچەکانی لە کار خستون!

تەنانەت ڕۆژێکیان بەسەر خێزانەکەیدا کەوت و زۆر ناڕەحەت بوو. بەدڵ داوای لەخوا کرد کە شیفای بدات. خوای گەورە فەرمووی: ﴿ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَ ۖ هَـٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ﴾ ص:٤٢.

واتە: هەستە و بەپێی خۆت ڕاکە و پێی خۆت بکوتە بەزەویدا، ئەوە ئاوێکی فێنك و سارد و سازگار و خواشگەواری بەکەڵکە بۆ خۆشتن و خواردنەوە، خۆتی پێ بشۆ و هەندێکیشی لێ بخۆرەوە.

ئەیوبیش خێرا هەستا و لە ئاوەکەدا خۆی شت و لێشی خواردەوە، ئەوجا خوای دلۆڤان شیفای دا و ناڕەحەتیەکەی لەسەر هەڵگرت.

ئالەو کاتەدا کە خوای گەورە شیفای ئەیوبی دا، خێزانە بەڕێزەکەی، هاوسەرە بە وەفاکەی لە ماڵ نەبوو، کە گەڕایەوە و ئەم پیاوە جوان و لەش ساغەی بینی، نەیزانی و چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد کە ئەوە ئەیوبی مێردی بێ و ئاوا کتوپڕ چاك بوبێتەوە و زۆر لە جاران جوانتر و لەش ساغتربێ!

بۆیە کە چاوی پێکەوت وتی: بەرەکەتی خوات بەسەردا بڕژێ، ئەوە تۆ ئەو پێغەمبەری خوایەت نەبینیوە کە چەند ساڵە خوا بە نەخۆشی بەسەری کردۆتەوە؟

سوێند بە خوا لە ژیانمدا کەسم نەبینیوە ئەوەندە بەو بچێ لەو کاتەدا کەلەش ساغ بوو، جگە لە تۆ!!

ئەیوب فەرمووی: کچێ ژنە باشەکەم. خۆ من ئەوم. من ئەیوبم!! ئەمجا ماڵی حەزرەتی ئەیوب دوو عەمباریان هەبوو، دوو چاڵی دانەوێڵەیان هەبوو یەکیان هی گەنم بوو، یەکیان هی جۆبوو. خوای گەورە دوو هەوری ناردە سەر ماڵی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە و، لەسەر ئەو دوو چاڵە خاڵیە لەنگەریان گرت و دەستیان کرد بە بارین بە فەرمانی ئەو خوایەی کەباران دەبارێنێ، لەجیاتی باران و ئاو زێڕ لەو هەورەیانەوە دەهاتە خوارەوە کە چاڵە گەنمەکە بوو، هەتا پڕی کرد، **(وَأَفْرَغَتِ الأُخرى عَلى أَنْدَرِ الشَّعيرِ الوَرِقَ حَتَّى**

فاضَتْ) وە هەورەکەی تریشیان لەسەر چاڵی جۆیەکە لەنگەری گرت و وەستا و زیوی سپی لیّ باری هەتا چاڵەکەی پڕ کرد ! !).

ئەم فەرموودەیە: (صَحيحٌ، رَواهُ أَبُو يَعلي في مُسْندِهِ (١٧٦/١) وَ إِبْنُ حِبّان في صَحيحهِ: (٢٠٩١) وَ صَحَّحَهُ الحافِظ ابنُ حَجَر في فتح الباري ج٦، ص٥١١. وَقالَ الأَلْباني: حَديْثٌ صَحيحٌ ـ السلسلة الصَّحيحة، رقم: ١٧).

لەم فەرمووده موژده بەخشە دڵخۆشکەرەوە سیّ وانەی گرنگ فێردەبین:

١) نابیّ بە کەسێك کە خوای گەورە بەسەری کردۆتەوە بە نەخۆشی چەندین ساڵەی درێژخایەن، یان مردنی منداڵ و جگەرگۆشەی زۆری، یان نەمانی سەروەت و سامانی و شکستی لەبواری ئابوریدا، بڵێین: ئەوە دیارە گوناهی زۆر گەورەی کردووە، بۆیە خوا ئاوای لێکردووە، ئەوە سزای گوناهەکانیەتی، نەخێر. ئەوە ئەیوبە کە پێغەمبەرێکی هەرە گەورەیە و خوای گەورە بە ﴿نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ﴾ ناوی دەبات و لە قورئاندا ستایشی دەکات و دەفەرمووێ: ﴿نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ﴾ ص: ٤٤.

واتە: ئای ئەیوب چ بەندەیەکی چاك بوو، بەڕاستیش هەمیشە تەوبەکار و ڕوو لە خوا بوو. بەڵام خوای گەورە بە هەرسیّ تاقیکردنەوە قورسەکە بەسەری کردەوە: نەخۆشی درێژخایەن،

مردنی هەموو منداڵ و نەوەکانی، لەناوچوونی هەموو سەرمایە و پارە و موڵك و سامانی! لەبەرئەوە نابێ هەر کەسمان بینی خوا تاقیکردبۆوە بەم نارەحەتیانە، بڵێین ئەوە خوا سزای دەدات!

٢) هەموو ئەوانەی کە نەخۆشی درێژخایەنیان هەیە، هەموو ئەوانەی کە منالّیان دەمرێ و، کوڕ و کچی گەورە و بچوکیان دەمرێ و جەرگ سوتاو دەبن. هەموو ئەوانەی لە ڕووداوێکدا، لە بارودۆخێکدا، ئیفلاس دەکەن و هیچیان لە پارە و ماڵی دونیا بەدەستەوە نامێنێ، نەکەن لە خوا غافڵ بن و لە ڕەحمی خوا نائومێدبن. هەمیشە گەشبین بن کە ئەگەر خۆڕاگربن و ناشکوری دەرنەبڕن و پەنا بۆ کاری حەرامخۆری و ناشەرعی نەبەن، خوا دەرگاتان لێدەکاتەوە..

ژنە باش و وەفادارەکەی ئەیوب، عەقڵی قبوڵی نەدەکرد کە ئەیوبی هاوسەری ئاوا کتوپڕ خوای گەورە بە هەندێ ئاو شیفای بدات و لە جاران لەش ساغتربێتەوە! خوای گەورە منداڵی زۆر زیاتر لە جاران پێ بەخشینەوە، خوای گەورە پارەی بەسەردا باراندن کە عەقڵی مرۆڤ لە ئاستیدا سەرسامە، دەی زۆرجار مرۆڤ لە کتوپڕدا پارەی بەسەردا دەڕژێ و، لە ڕێگەیەکەوە بۆی دێ کە هەرگیز خۆی چاوەڕێی نەکردوە!

تۆش چاوەڕێی ئەو دەرگایەی ڕەحمی خوابە و دڵنیابە خوای گەورە دەرگا دەکاتەوە.

٣) لەم فەرموودەیەوە تێدەگەین کە: موسڵمانی بەحەق و، خواناس و، زۆر دیندار و، لەخوا نزیك دەتوانیٚ بە حەڵاڵی بە فەزڵی خوا زۆر دەوڵەمەند بێت. ئەیوب پێغەمبەر ـ سەلامی خوای لەسەر بێت ـ ئەگەر دوو چاڵی گەورە زێڕ و زیوی هەبێت. لە کاتێکدا پێغەمبەری خوایە و خواناسترین مرۆڤە، چ قەیدی هەیە، ئەگەر موسڵمانێکی ئەمڕۆش، خاوەنی دوو قاصەی گەورە دۆلار و دینار بێت و، شوکری خوای لەسەر بکات و، لە چاکە و ڕێگەی خزمەت بە دین و ژینی موسڵماناندا خەرجی بکات و، خۆی و خێزان و بنەماڵە و هاوشاری و هاوزمانیانی پیٚ بەختەوەر بکات؟!

کەواتە: لەم فەرموودەوە تێدەگەین، ئەوەی وابزانیٚ نابیٚ موسڵمان ملیاردلێربیٚ و بەبار پارەی هەبیٚ، بەمەرجیٚ بەهی خوای بزانیٚ و بە حەڵاڵ پەیدای بکات و لە حەڵاڵدا بە چاکە خەرجی بکات، لە ئاینی ئیسلام و ڕێبازی پێغەمبەران ـ علیهم السَّلام ـ تێنەگەیشتووە!

زانای گەورەی کورد، موفەسیری قورئان. عەللامە (مەلا محمدی جەلی زادە) مەلای گەورەی کۆیە لە تەفسیرەکەیدا: ( تەفسیری کوردی ب١٠ ل٥٠٣) دەفەرمووی:

وابزانم (عبدالخالق)ی غەجدەوانی، زۆر دەوڵەمەند بووە، وولآخە بەرزەی بەناوبانگی زۆر چاك چاكی هەبووە، زنجیری ولآخەكانی لە زێڕ بووە، مێخ زنجیرەكەیان لە زێڕ دروستكراوە! جارێكیان دەروێشێكی غەریب و هەژار، بۆ تاقیكردنەوەی دڵ و دەروون و پیاوەتی و مەردی ئەم زاتە بەناوبانگە، داوای ئەوەی لێدەكات ولآخە بەرزەیەكی زۆر جوان و بەناوبانگی ناو هەموو وولآخەكانی بە ئەمانەت بداتیٚ، تا سەفەرێكی پیٚ دەكات و بۆی دێنێتەوە. ئەویش دەفەرمووێ: بڕۆ بیبە!

دەروێش زنجیرە ئاڵتونەكە لە قاچی وولآخە بەرزەكە دەكاتەوە، بەتەمادەبیٚ لە شوێنی خۆی دایبنیٚ، شێخ عبدالخالق غەجدەوانی ئەفەرمووێ: زنجیرە ئاڵتونەكە جیٚ مەیەڵە، گوڵ مێخی ئەو زنجیرە لە زەوی چەقیوە، لە دڵی ئێمە نەچەقیوە!!

ئەم پیاوە لەو زەمەنە بیٚ پارەیەدا، واریداتی - داهاتی - ساڵانەی (شەست بۆ حەفتا) هەزار دینار بووە!!

زۆربەی لە ڕێی خوادا خەرج دەكرد، ئەی فەرموو: ئەگەر سستی بكەم لە كەسابەت داهاتی ساڵانەم كەم دەبیٚ، خوای گەورە حیسابم لەگەڵ دەكا و دەفەرمووێ: بۆچی سستیت كرد؟! هەوڵی زۆرت بدایە و زیاتر كاروكاسپیت بكردایە، بازیاتر داهات ببوایەو زیاترت لە ڕێگەی مندا صەرف بكردایە! بەڵیٚ بەڕاستی ئەمە تێگەشتنی ڕاستیە لە ئیسلام!

پاشان هەر مەلای گەورە، لە هەمان شوێندا دەفەرمووێ: ماموستا مەلا ئەحمەد دەیفەرموو: بە عیزەت تەرکی دونیامان کرد، بە زەلیلی و چاوچنۆکی داوای دەکەینەوە. ئاماژەی بۆ ئەو شێخ و مەلایانە دەکرد، کە پشتیان لە کاروکاسپی شەرەف مەندانە و حەڵاڵ هێنا و بێ کاروکەسابەت دانیشتن. پاشان بۆ دابین کردنی گوزەران و بژێوی ژیانیان، بە زەلیلی و ملکەچی داوایان لە خەڵکی دەوڵەمەند دەکرد و، بە سواڵ و صەدەقە بەڕێوە دەچوون!

**وتەیەکی زۆر جوان:**

د.عائض القَرَني لە کتێبە بەنرخەکەی خۆیدا: (مقامات عائض القَرَني، ص٤٦٧)دا، دەفەرمووێ: **(لا بَأسَ أنْ نسكنَ القَصْرَ، وَمَعَنا سورَةَ العَصر، وَ أَنْ نركَبُ الطّائرَة، وَوُجُوهُنا بالْإيمانِ ناضِرَة).**



## به ویستی خوا نەبێت نابی بە خاوەنی هیچ !

لە خوا غافڵ مەبە و یەقینت ببێ کە غەیری ـ الله ـ هیچ کەس ناتوانێ پارەت پێ ببەخشێ. هەرچەندە خاوەنی کەلوپەلی باش بی، کارگەی باش بی، کێڵگەی باش بی، شەهادە و عیلمت پێ بێ، ئەگەر ویستی خوای لەسەر نەبێ، نابیت بە خاوەنی پارە. بەڵکو لە

دەستی تۆ دەردەچێ و دەچێتە دەستی کەسێکی ترەوە. لەسەر ئەمە سەرنجی ئەم دوو بەسەرهاتە بدەن:

**یەکەم: خاوەنی خەزێنەی ئاڵتون بوو، بەڵام لێی بێزاربوو!**

لە باشوری ئەفریقیا، پیاوێك هەبوو بەناوی (جۆرج هاریشن) خاوەنی پارچەیەك زەوی بوو، بەڵام هەرچیەکی لێ دەچاند سەوز نەدەبوو، زۆر بەرهەمی لێ تاقیکردەوە، هیچی لێ دەست نەکەوت. بە کورتی زەویەکەی نەزۆك بوو، بە کەڵکی کشتوکاڵ نەدەهات. بۆیە زۆر عەوداڵ بوو بەدوای کەسێکدا کە ئەم زەویە بێ خێرەی بکڕێ. ئەوەبوو خاوەن کارگەیەك بۆئەوەی پاشماوەی کارگەکەی تێدا بشارێتەوە، بە نرخێکی یەگجار کەم لێی کڕی!

خاوەن زەویەکەش وای دەزانی ئەم پارەی دۆزیوەتەوە ئەوەندە خۆشحاڵبوو، بەڵام کاتێ خاوەنی تازەی دەستی کرد بە لێدانی چاڵی گەورە لە زەویەکەدا، گەورەترین کانی ئاڵتونی تێدا دۆزیەوە، کە لە جیهاندا وێنەی نەبوو! ئەو کانە ئاڵتونە وایلێهات (٧٠٪)ی زێڕی جیهان بەرهەم بێنێ!! {وەرچەرخان، ژ: ١٦٧}.

**دووەم: دوای مردنیشی هەر پارەی دەدا!**

لە وولاتی فەڕەنسا، پارێزەرێك بەناوی (ئەندریا ڕافری) لەساڵی (١٩٦٥)ی زاینی، هەستا بە کڕینی خانوو لە ئافرەتێك کە تەمەنی (نەوەد) ساڵ بوو، ناوی: (جییان کالمینتین) بوو، ئەوکات نەخۆش

بوو، کاکی پارێزەر ئەوەی بەهەل زانی، ڕێك کەوتن کە هەتا ئەو پیرەژنە لە ژیاندا بێت، مانگانە بڕێك پارە بدات بە پیرەژنەکە و دوای مردنی پیرەژنەکە خانوەکە بۆ پارێزەرەکە دەبێت، پارێزەرەکە بە هەلی زانی و مۆری کرد. بەلاّم ئافرەتەکە چاك بۆوە و ژیا و نەمرد!

لە ساڵی (١٩٨٥ی زاینی) کابرای پارێزەر لە تەمەنی (٧١) ساڵی توشی شێرپەنجە (سرطان) بوو مرد. خێزانی پارێزەرەکە بەردەوام بوو لەدانی پارەی مانگانە - چونکە ناچاربوو لە عەقدەکەدا وانوسرابوو، کە تا پیرەژنەکە لە ژیاندا بێ، دەبێ مانگانە بڕێك پارەی بدەنێ! - هەتا لە ساڵی (١٩٩٣)ی زاینی، پیرەژنەکە (جییان کالمینتین) لە تەمەنی (١٢٢) ساڵی و لە (١٦٥) ڕۆژدا، کۆچی دوایی کرد، پارێزەرەکە (دە) ئەوەندەی نرخی خانوەکەی دا.. {گۆڤاری پزیشك، ژ: ١٠}.

کەواتە پارە پەیداکردن بە زیرەکی و شەهادە نی یە و، لەخوا غافلّ مەبە و هەرگیز وەکو قارون نەڵێی: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓ﴾ القصص: ٧٨.

واتە: ئەمەی کە بەدەستم هێناوە لە پارە و سامانی زۆر، بەهۆی زانست و زانیاری و لێهاتوویی خۆمەوە بووە! ئەوەبوو بەخۆی و پارە و سامانیەوە تیاچوو.

پەیامی کۆتایی بۆ خاوەن پارە و دەوڵەمەندەکان ئەوەیە کە خوای گەورە بۆی دیاری کردوون:

١) ﴿وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا﴾القصص: ٧٧.

واتە: بەشی خۆشت لە دونیادا فەرامۆش مەکە و ژیانێکی خۆشگوزەران بەسەرببە.

٢) ﴿وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ﴾القصص: ٧٧.

واتە: وەچاکە بەو پارە و سامانەی کە لە ژێر دەستایە بکە و، یارمەتی هەژار و نەدار و نەخۆش و لێقەوماوان بدە. هەروەکو خوای گەورە چاکەی لەگەڵ تۆدا کردوە و، ئەم پارە و سامانەی پێ بەخشیوی، تۆش لێی ببەخشە و چاکەکاربە..

## وانەی بیستەم:

## بابەت: ئەی نەخۆش لە خوا غافڵ مەبە

### ـ بەشی یەکەم ـ

۞ **قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:** ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٨﴾﴾ الأنعام: ١٧ –١٨.

۞ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (ما يُصيبُ المُؤمنُ مِنْ وَصَبٍ ولاهَمٍّ وَلاحَزَنٍ ولا أَذى، حَتَّى الشَّوْكَةُ يُشاكِها إلّا كَفَّرَ اللهُ بِها مِنْ خَطاياهُ) ـ رَواهُ البُخاريُّ.**

**سەرچاوەکان:**

١) شەیدا، ن: د. محمد عبدالرَّحمن العريفى، و: هێمن محمد على، ل٥، ل٢٥.

٢) ڕۆژنامەی (باسك) ژ: ٥١١.

٣) فەرهەنگی بانگخوازان، ئەندازیار عثمان، ل٧٥.

٤) بالآنس ئەندازیار عثمان، ل٩٣، ل٣٦.

٥) گۆڤاری (بڕیار) ژ: ٣٧، ل٣١.

٦) ریاض الصّالِحین، و: نوری فارس، ب٢، ل٢٦٧.

٧) تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد ئەمین، پێداچوونەوەی: د. سَید أحمد عبدالوَهّاب، ل٤٨٤.

٨) أحْسَن البَیان مِنْ مَواقِف أهل الإِیمان، صالح طه عبدالواحِد، ص٧١.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين. وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ أجمَعينَ:

سوپاس و ستایش بۆخوای پەروەردگار، درود و سڵاو بۆ سەر گیانی پێغەمبەری سەروەر و نازدار، شەفیعی مەحشەرمان، دڵسۆزتر لە خۆمان بۆ خۆمان، محمد المصطفي ﷺ.

بابەتی ئەم جارەمان لە زنجیرە باسی لەخوا غافڵ مەبە، تایبەتە بە نەخۆشەکانەوە، ئەمڕۆ زیاتر لە هەموو سەردەمەکان نەخۆشی زۆرترە. ئەگەر بڵێین جەستەی ساغ کەمبووە ڕەنگە قسەیەکی ناڕاست نەبێ. هەر کەسێ دەبینی و قسەی لەگەڵ دەکەی نەخۆشیەکی لەگەڵە، بەڵام نەخۆشیەکان هەیانە سەختن، وە هەیانە باشترە و سوکترە و کەسەکەی لە جێگادا نەخستوە. زۆرماڵ هەیە نەخۆشی تێدایە، زۆرکەس هەیە هەموو ژیانی بۆتە ئاخ و ناڵە و هاوار بە دەست نەخۆشیەوە، یان گرفتارە بەوەی نەخۆشیەکی درێژخایەنی بێ چارەسەری لەش بە ئازار لە ماڵەکەیدا هەیە.

لەبەرئەوە پێویستە ئەو کەسانە لەڕوانگەی ئاینی ئیسلامەوە دڵنەوایی بکرێن و ئومێدیان بە شیفای خوا پێ بدرێ و پێیان بوترێ لە خوا غافڵ مەبن، هەمیشە یادی خوا بکەن و داوای شیفا لە خوا بکەن..

ئەوەی جێگەی سەرنجە لە دێر زەمانەوە، زاراوەی نەخۆشی و ناخۆشی و بەلاّ و موصیبەت، پێکەوە لێکنراوە، بۆیە ئەم فەهمە دەرگای لە ڕووی ئیجابی بوونی نەخۆشیدا داخستوە، ئەمە دەکرێت ڕاست بێت بۆ کەسانێك، کە ئایە و مایەیان تەنها ژیانی دونیا بێت. بۆیە ناکرێت هیچ ئاستەنگێك لە چێژەکانی ژیانی دونیا دایان ببڕێت.. بەلاّم: ئەگەر هاتوو پێناسی تاقیگەمان دابەدونیا و ئادەمیزادەکانیش وەك قوتابی، ئەوکات دەکرێت نەخۆشی وەك پرسیارێکی قورسی بێتەرك هەژمار بکرێت..

بەدیهێنەری بونەوەر خوایەکی دانا و دادپەروەرە، ئاگاداریشە بە ختورەی دڵی بەندەکانی، بۆیە لە کاروانی پێغەمبەراندا، ئەیوب ـ علیه السَّلام ـ دەبینرێت، تاهیچ کات گومانی خراپ بە نەخۆشەکان نەبەین و خەیاڵمان دوور نەڕوات، چونکە ئەگەر نەخۆشی سزابوایە، نەدەکرا پێغەمبەرێکی وەکو ئەیوب پێوەی گیرۆدە ببوایە، نەخێر، دەبوایە دڵتەنگیەکیش ڕووی تێنەکردایە. بەڵکو بە پێچەوانەوە، دەبێت ئەیوب ـ علیه السَّلام ـ سەرمەشق و پێشەوای نەخۆشەکان بێت. چونکە ئەم جۆرە کەسانە مەدالیای ڕێزداری بەسەر سنگیاندا هەڵواسراوە..

## سودەکانی نەخۆشی:

### ١- نەخۆش بەهێزترمان دەکات:

لەڕووی فەسلەجیەوە، لاشە لەکاتی نەخۆشیدا، لە هەموو کاتێك چوست و چالاکترە و ئامادەی پارێزگاریە، دواتریش خوێن و ماسولکە و بەشە زیان لێکەوتوەکانی تر، بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەرتر نۆژەن دەکرێنەوە، چاکتر لەپێش نەخۆشیەکە.

هەروەك عەرەب دەڵێت:

**(الضَّربَة الَّتي لا تسقطكَ تقويكَ) !**

واتە: ئەو لێدانەی کە ناتخات و لەناوت نابات، بەهێزترت دەکات. لەنمونەی هەڵامەتێکەوە کە ساڵانە لانی کەم دوو تا سێ جار، هێزەکانی بەرگری ناو خۆی لاشە ڕادەچڵەکێنێت، نەبادا پشتێن شلبن بەرامبەر بە مەترسیە دەرەکیەکان.

هەربۆیە ئەو کەسانەی کە لە ژیانیاندا بەدەگمەن نەخۆش بوون. لەگەڵ یەك نەخۆش کەوتنی بچوکدا یان کتوپڕ دەمرن، یان توشی شەلەل و جەڵتەی مێشك و دڵ دەبن، چونکە جەستە و خانەکانی بەرگری. هیچ ئامادەکاریەکی پێشتریان بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو نەخۆشیە نەبووە!

**٢- نەخۆشی پلەی مرۆڤ لەلای خوای گەورە بەرز دەکاتەوە:**

هەرکات پەروەردگار بەندەیەکی ئاڵتون ئاسا زاخاو بدات، عەیارەکەی بەرز دەکاتەوە بۆ بیست و چوار، کەنەدەکرا بەبێ ئەو ئاگر و کورەی نەخۆشییە پێی بگەیشتایە.

**٣- نەخۆشی پاك کەرەوەی مرۆڤە لە گوناهوتاوان:**

هەر کەسێك لە دنیادا توشی هەر ئازارێك ببێت، تەنانەت کاتێ دڕکێ ئەچێ بەلاشەیدا، ئەوا خوای گەورە گوناهوتاوانەکانی پێ دەسڕێتەوە. چەندان کەس نەخۆشی و ئازار بۆیان بووە بەو دەرگایەی کە لێوەی دەچنە بەهەشتەوە، تاقیکردنەوە و ناڕەحەتی و نەخۆشیش بەردەوام توشی ئیمانداران دەبێت، هەتا ئەو کاتەی کە خوای گەورە وازی لێ دێنێ و بەسەر زەویدا دەڕوات و، هیچ تاوان و گوناهێکی پێوە نامێنێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**ما يُصِبُ المُؤمِنُ مِنْ وَصْبٍ وَلا هَمٍّ وَلا حَزَنٍ وَلا أذى، حَتَّى الشَّوْكَةُ يُشاكِها إلّا كَفَّرَ اللهُ بِها مِنْ خَطاياهُ**) - رَواهُ البُخاريُّ.

واتە: ئیماندار توشی هیچ ماندووبون و غەم و خەفەت و ئازارێك نابێت، هەتا دڕکێکیش بەقاچیدا بچێت، ئەوا خوا لەبری ئەم شتانە هەندێك لە گوناهەکانی دەسڕێتەوە.

هەروەها دەفەرمووێت: (**وَلا يَزالُ البَلاءُ بالْمُؤمِنِ في أَهْلِهِ وَمالِهِ وَوَلَدِهِ، حَتَّى يُلْقَى اللهُ وَما عَلَيْهِ خَطيئَةٌ**) رَواهُ الترمذي.

واتە: ئیماندار بەبەردەوامی لەڕووی کەسوکار و ماڵ و منداڵەوە تاقیدەکرێتەوە، هەتا بەدیداری خوای پەروەردگار دەگات و هیچ گوناهێکی پێوە نامێنێ.

لە فەرموودەیەکی تردا، خۆشەویستمان ﷺ دەفەرمووێت: (**يَوَدُّ النّاسُ يَوْمَ القِيامَةِ أَنَّ جُلُودَهُمْ كانَتْ تقرضُ بالمَقاريضِ في الدُّنيا، لِما يَرَوْنَ مِنْ ثَوابِ أَهْلِ البَلاءِ**) رَواهُ الترمذيُّ.

واتە: خەڵکی لەڕۆژی دوایدا کاتێك پاداشتی ئەو کەسانە دەبینن کە بەبەلا و ناڕەحەتی تاقیکراونەتەوە، حەزیان دەکرد پێستی لاشەیان لێبکرایەتەوە.

ئەنەس لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (**إِنَّ عَظُمَ الجَزاءِ مِنْ عَظُمِ البَلاءِ، وَ إِنَّ اللهَ إِذا أَحَبَّ قَوْماً إِبْتَلاهُمْ، فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضا، وَمَنْ سَخِطَ فَلَهُ السُّخْطُ**) واتە: گەورەیی پاداشت لە گەورەیی تاقیکردنەوەدایە، خودا کاتێك نەتەوەیەکی خۆشویست تاقیان دەکاتەوە، ئەوەی ڕازی بێت ڕەزامەندی خوای دەست دەکەوێت و، ئەوەش کە توڕە بێت و ناڕازی بێت، ئەوا توڕەیی خوای لەسەرە.

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێتە ژوورەوە بۆلای دایکی ئیمانداران عائیشە ـ خودا لێی ڕازی بێت ـ و دەبینێت سەری

بەستوە و لەتاو ئازار دەناڵێنێت. پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەفەرمووێت: ئەوە چیتە ئەی عائیشە؟ ئەویش دەفەرمووێ: تام لێهاتووە، بەرەکەتی خوای لێ نەبێت و خودا لەناوی بدات.. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **(لاتَسبي الحمَّى، فَإنَّها تَأْكُلُ خَطايا إبن آدم كَما تَأْكُلُ النّارُ الحَطَبَ)** رَواهُ مُسْلِم.

واتە: جنێو و قسە بەتا مەڵێن، بەدڵنیاییەوە (تا) هەڵە و تاوان و گوناهی مرۆڤەکان لەناودەبات، هەروەك ئاگر دار لەناو دەبات.

جاری واهەیە خوای پەروەردگار پلە و پایەی بەندەکانی ئەوەندە بەرز دەکاتەوە، کە هەرگیز بەکردارەکانی خۆیان ئەوەندە بەرز نابێتەوە، بەڵام خوای گەورە بەهۆی تاقیکردنەوەی بەندەکانییەوە ئەو پلە و پایەیان پێ دەبەخشێت.. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: **(إنَّ الرَّجُلَ ليكونُ لَهُ عِنْدَ اللهِ المَنْزِلَةَ، فَما يَبْلُغُها بِعَمَلٍ، فَما يَزالُ يَبْتَليهِ بِما يَكْرَهُ حَتَّى يَبْلُغُهُ إيّاها)** رَواهُ إبنُ حِبّان.

واتە: مرۆڤ لەلای خودا شوێن و پلە و پایەیەکی هەیە، کە هەرگیز بەکردەوەکانی خۆی پێی ناگات. خودای گەورە بەردەوام بە ناڕەحەتی و ناخۆشی تاقی دەکاتەوە، هەتا دەیگەیەنێت بەو شوێن و پلە و پایەیە.

٤- نەخۆشی نەبێت مرۆڤ قەدری لەش ساغی نازانێت:

جارێکیان پیاوچاکێك سەردانی یەکێك لە قوتابیە نەخۆشەکانی دەکات لە ماڵەوە، کە ئەچێ بۆلای بۆ عەیادەکردنی، نەخۆشەکە دەڵێت: مامۆستا حاڵم زۆر خراپە، ئەوا (١٢٠) ڕۆژە من لەناو ئەم جێگایە ڕاکشاوم و نەخۆشم، پیاوچاکەکە دەفەرمووێت: باشە وا ڕۆژەکانی ناڕەحەتی و نەخۆشیت بژاردووە، ئەی ئەو ڕۆژانەت حیساب کردووە کە لە نەخۆشی و لەش ساغیدا بەسەرت بردووە؟!

بەڵێ مرۆڤ هەتا نەخۆش نەبێت نازانێ لەش ساغی چەند خۆشە و چ خەڵاتێکی خوای گەورەیە.

زۆرجار مرۆڤ دڵی بۆ پارە و سەروەت و سامانی دنیا تەنگ دەبێت کە کەمی هەیە، یان فلاّن کەس زۆر دەوڵەمەندە و ئەم هەژارە، بەڵام کاتێ کە نەخۆش دەکەوێ و لەبەر نەخۆشی ئەوەی دەیخوات تامی لێ ناکات و خەوە خۆشەکەی جارانی نەماوە و، شەوگاری بە ئازارەوە لێ دەبێت بە ساڵێك. ئەوجا تێدەگات کە ئەو کاتەی لەشی ساغ بووە هەموو دونیا هی ئەو بووە. بەڵام قەدری نەزانیوە!!



## ئەی نەخۆش لەخوا غافڵ مەبە و بزانە:

### ١) هەموو دەردێ دەرمانی هەیە:

ئەو خوایەی کە بەبێ ویستی ئەو هیچ میکرۆب و ڤایرۆس و نەخۆشیەك دروست نابێ، هەر ئەو خوایەشە کە شیفای نەخۆشی دەدات و، یەکێك لەناوە پیرۆزەکانی (**الشّافي**)یە، دەی بە یەقینەوە، بەگەشبینیەوە پەنای بۆ ببە و لێی بپاڕێوە و، لە نیوە شەواندا هەستە و دەست نوێژ بگرە و هانا و هاوارت بۆلای خوای گەورە ببە و بڵێ: (**یا الله یا شافي**) شیفام بدە، خوای گەورە دەرمانێکم بۆ بکە بەشیفا، لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

(**لِكُلِّ داءٍ دَواءٌ، فَإذا أُصيبَ دَواءٌ الدَّاءَ بَرَأَ بِإذْنِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ**) رَواهُ مُسْلِم. واتە: بۆ هەموو دەرد و نەخۆشیەك دەرمانێك هەیە، جار هەرکات دەرمانەکە بۆ ئەو نەخۆشیە دەگونجا و لەناوی دەبرد، ئەوە بە ویستی خوای باڵادەست ئەو نەخۆشی یە چاك دەبێتەوە.

لەبەرئەوە هەموو دەرمان و چارەسەرە پزیشکیەکانت ئەوەندە بە دڵنیاییەوە بخۆ، کە وابزانە یەکسەر خوای گەورە شیفاکە دەنێرێ. خۆ ئەگەر لای دکتۆرێك و بەبەکارهێنانی دەرمانێك چاك نەبووی، ئەوا نائومێد مەبە و پەنا بۆ دکتۆر و دەرمانێکی تر ببە و،

فەرموودەکەی پێغەمبەری خوات لەیاد بێت ﷺ کە فەرمووی: بۆ هەموو دەردێك دەرمانێك هەیە.

## ٢) هەمیشە گەشبین بە:

ئەی نەخۆش هەمیشە گەشبین بە و چاوەڕێی چاك بونەوە بکە، لەبەرئەوەی یەکێك لە چارەسەری نەخۆشی، گەشبینی دەرونی نەخۆش خۆیەتی، چونکە لەناو جەستەی مرۆڤدا، دەزگایەك، کۆئەندامێکی تایبەت هەیە پێی دەوترێ ـ(الشِّفاء الذَّاتي)ـ کە ئەمە لەناو دەرونی مرۆڤ خۆیدایە و، دکتۆرە بەڕێزەکان و زانستی پزیشکی، تا ئەمڕۆ نەیتوانیوە بەڕوونی وێنای ئەم دەزگایەی ناو جەستەی مرۆڤ بکات. ئیشی ئەم دەزگایە ئەوەیە کە هەرکاتێ مرۆڤ نەخۆش کەوت، بەڵام ورەی بەرزبوو وتی: ئەم نەخۆشیەی من هیچ نی یە و خوای گەورە شیفای بەدەستە و، شیفای هەزاران نەخۆشی وەکو منی داوە..

سبحان الله، هەر کە نەخۆش ئاوا گەشبین و ورە بەرز بوو، یەکسەر ئەم دەزگایە لە جەستەدا دەکەوێتە کار و، نەخۆشیەکە لە جەستەدا بەرەو نەمان دەڕوات و، زۆر بە ماوەیەکی کەم نەخۆشەکە چاك دەبێتەوە. بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر مرۆڤ لە ئاستی نەخۆشی یەکەیدا ورەی ڕوخابوو، خۆی بەخۆی دەگوت: بەخوا زەحمەتە من چاك ببمەوە، بەخوا ئەم دەرزی و دەرمانە هیچ

سودێکم پێ ناگەیەنێ، فلاّن کەسیش نەخۆشیەکەی منی بوو کەچی چاك نەبۆوە، سبحان الله، یەکسەر ئەم دەزگایەی ناو لەش لەکاردەکەوێ و ئیتر ئەو نەخۆشە بەرگری جەستەی لەناو دەچێ و، نەخۆشیەکە بەئاسانی زاڵ دەبێت بەسەریدا و، خواردنی دەرمانەکانیش سودێکی ئەوتۆی پێ ناگەیەنن.. لەبەرئەوە پێویستە نەخۆش خۆی هیمەتی بەرزبێت و ئەوانەش کە دەچنە لای نەخۆش و سەردانی دەکەن، یان کەسوکاری نەخۆشن و لە ماڵەوە خزمەتی دەکەن، هەمیشە دڵخۆشی بدەنەوە و بەسەرهاتی ئەو نەخۆشانەی بۆ بگێڕنەوە کە چەندە نەخۆشبوون، بەلاّم خوای گەورە زۆر بە ئاسانی شیفای داون.

نابێ وورەی بڕوخێنن و بڵێن: بەڕاستی نەخۆشیەکەت سەختە، بەداخەوەم بۆت! خۆزگە ئاوا نەمبینیایە! بەم ووشە ڕووخێنەرانە، نەخۆش بەرگری جەستەی دادەبەزێ و چاکبوونەوەی دوا دەکەوێ!

### ٣) خێر بکەن بۆ نەخۆشی:

ئەی نەخۆشەکان بە پێی توانای داراییتان خێر و خێرات بکەن، بە ئومێدی ئەوەی کە ئێوە دڵی هەژار و لێقەوماوێکتان خۆشکرد، خوای گەورەش دڵی ئێوە خۆش بکات و ئازاری نەخۆشیتان لەسەر لابەرێت. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (داووُ مَرْضاكُمْ

**بالصَّدَقَةِ)**. واتە: دەرمانی نەخۆشیەکانتان بکەن بە صەدەقە و خێرکردن.

**بەسەرهاتێك:** زانای بانگخواز و نوسەری ناوداری ئیسلام، شێخ محمد الغَزالي - رَحِمَهُ الله - کە لەساڵی (١٩١٧)، لە میصر لە دایکبووە، تەواوی تەمەنی لە خزمەتی بانگەوازی ئیسلامدا بەکارهێناوە، وە هەمیشە دوعای کردووە کە لە گۆڕستانی (بەقیع)، لە شارە مونەوەرەکەی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە بەخاك بسپێردرێ، لەناو ئەو سەدان صەحابە ئازیزەی کە لەوێ بەخاك سپێردراون.

ئەوەبوو خوای گەورە ئاواتەکەی هێنایە دی و، لە ساڵی (١٩٩٦) لە کاتێکدا بۆ کۆنگرەیەکی زانایانی موسڵمان لە (سعودیە) لە شاری (مەدینە) دەعوەت کرابوو، لەناو کۆنگرەکەدا وەفاتی کرد و لە گۆڕستانی (بەقیع) نێژراو ئاواتەکەی هاتەدی.

شێخ محمد الغزالی، لە بیرەوەریەکانی ژیانیدا ئەمەی تۆمارکردووە و دەفەرمووێ: (قوتابی بووم لە زانکۆی ئەزهەر، نامەیەکم بۆهات لە ماڵی باوکمەوە کە بەپەلە بگەمە ماڵەوە، منیش بەپەلە زانکۆم بەجێهێشت و گەیشتمە ماڵەوە، بینیم باوکم حاڵی زۆر خراپە و ئازارێکی زۆری هەیە، بەهۆی بەردی گورچیلەوە، نەمان دەزانی چی بکەین؟! پارەمان نەبوو نەشتەرگەری بۆ بکەین، لەلایەکی تریشەوە ئەگەر پارەشمان بۆ قەرز بکردایە، نەمان دەوێرا

نەشتەرگەری بۆ بکەین، چونکە مامم بەهۆی نەشتەرگەری گورچیلەوە گیانی لەدەست دابوو. پزیشك هەندێ حەبی ئازاری دایە باوکم، منیش ناچار چومە سەر دوکانی باوکم، چونکە کەسمان نەبوو بیکاتەوە، زۆر دڵتەنگ و نارەحەتبووم، دنیام لێ ببوە چەرمی چۆلەکە و سەری دنیام لێهاتبۆوە یەك..

پیاوێك هاتە دوکان و هەندێ شتی لێ کڕیم و بە دەنگێکی نزم و زۆر بە شەرمەوە وتی: پارەکەم پێ نی یە، بەخوا سبەینێ بۆت دەهێنم. منیش زانیم ڕاست دەکات، وتم: ئەوە بۆ خۆت و بڕۆ خوات لەگەڵ..

کابرا ڕۆشت و لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بکات. ئینجا چوومە سوچێکی دوکانەکەوە و وتم: خوایە پێغەمبەرەکەت پێی ڕاگەیاندوین کە چارەی نەخۆشەکانمان بە خێر و صەدەقە بکەین، داوات لێدەکەم بەو خێر و صەدەقەی ئێستام، باوکم چاك بکەیتەوە.. ئیتر لەسەر زەویەکە دانیشتم و زۆر گریام..

پاش سەعاتێك لە ماڵەوە بانگیان کردم (کە نزیکی دوکانەکەمان بوو) بەپەلە گەڕامەوە، زۆر ئەترسام، کە گەیشتمە ماڵەوە باوکم هات بەرەو پیریم و وتی: ئێستا ئەم بەردەم فڕێ دا!! نازانم چی بوو، شکور ئازارم نەما و سەرفراز بووم، منیش زۆر سوپاسی خوام کرد کە هات بە هانامەوە، بۆ سبەینێ گەڕامەوە بۆ زانکۆ و لە

سایەی خواوە بەردەوام بووم لە خوێندن.. {فەرهەنگی بانگخوازان، ل٧٥}.

## بچۆ بۆلای دکتۆری پسپۆڕ و دەرمان بەکاربهێنە، بەڵام صەدەقە لەبیرنەکەی!

**بەسەرهات:** نوسەر و بانگخواز (ئەندازیار عُثمان محمد ڕشید) دەفەرمووێ: ڕاستە ئەبێ بچینە لای پزیشك و دەرمان بەکاربهێنین، بەڵام باخێر و صەدەقەشمان لەیاد نەچێت..

بەندە بۆ خۆم ساڵی (٢٠١٠) چوومە لای پزیشك سۆنەری بۆ کردم، دوو کیسەی (٥٠) مللیمەتری لەسەر گورچیلەکانم بوو، دکتۆر وتی: دوو مانگی تر سۆنەر بکەرەوە، ئەگەر گەورەتربوون بەنازوور بۆت دەردێنین.. دوای دوو مانگ سۆنەرم کردەوە بوو بوون بە (٧٠) مللیمەتر، دکتۆر وەرەقەی دامێ کە ڕۆژی یەك شەممە، بچمە خەستەخانە بەنازوور بۆم سەحب بکەن، منیش نەچووم و خێرێکم نارد بۆ داماوێك بە نیەتی شیفا، خوا شایەتە پاش ماوەیەکی تر سۆنەرم کردەوە بوو بووە بە (٥٠) مللیمەتر، هەزاران جار سوپاس بۆ خوا. {بالانس، ل٩٣}.



### ٤) پەنا بۆشتی ناشەرعی مەبە:

ئەی نەخۆش پەنا بۆ نوشتە نوسی ناشەرعی و فاڵچی و دەستبڕەکان مەبە و، تەوەکولت لەسەر خوا بێ و بە ئەدەبەوە لەخوای خۆت بپاڕێوە، هەروەکو ئەیوب پێغەمبەر ـ علیه السَّلام ـ کە لە کاتێکدا نەخۆشیەکەی تینی بۆ هێنا، لە خوا پاڕایەوە و فەرمووی: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾﴾ الأنبياء.

واتە: ئەیوبیش کاتێ خوای گەورە تاقیکردەوە بەلەناوچوونی سەروەت و سامانی، ماڵ و منداڵی، هەروەها بەناساغی و لەش بەباری، دوای چەندەها ساڵ خۆڕاگری، هانا و هاواری بۆ پەروەردگاری برد و فەرمووی: لە ڕاستیدا من توشی تەنگانە و نەخۆشی و ناخۆشی هاتووم، تۆیش لە هەموو میهرەبانان میهرەبانتری، گەر فریام دەکەویت سوپاسگوزارم، گەر واش دەمهێڵیتەوەخۆڕاگر دەبم.

لێرەدا ئەدەبی پاڕانەوە لەخوا فێردەبین. ئەیوب (علیه السَّلام) چەند بە ئەدەب و ویقارەوە لەخوای خۆی دەپاڕێتەوە، ناڵێ: خوایە جاچیم کردبوو ئاوات لێکردم؟!!

خوایە خۆمن هەمیشە عیبادەتی تۆم دەکرد بۆ ئاوات لێکردم!!

نەیفەرموو: خوایە بۆچی نەخۆشت خستم! نەخێر، بەڵکو لە

خزمەت خودا نالێ: خوایە شیفام بدە، بەڵکو دەفەرمووێ: خوایە ئەوە حاڵی بە ئازاری منە و تۆش لە هەموو میهرەبانان بە ڕەحمتر و میهرەبانتری، چی بۆ من باشە ئەوەم بۆ بکە.

﴿فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾﴾الأنبياء.

واتە: خوای گەورەش فەرمووی: ئێمەش خێرا بە هانایەوە چوین، دوعا و نزاکەیمان گیرا کرد، وە هەرچی نەخۆشی و ناخۆشی هەیە لەسەرمان لابرد و لە کۆڵمان کردەوە، ماڵ و منداڵیشمان پێ بەخشیەوە و ئەوەندەی تریش لەگەڵیا، بێگومان ئەوە سۆز و ڕەحمەتێکی تایبەتی ئێمەبوو، هەروەها یاداوەریشە بۆ بەندە خواناسەکانمان، کە ئەگەر ئەوانیش توشی تەنگانە و ناڕەحەتی و زەرەر و زیان هاتن، پاشان وەکو ئەو پاڕانەوە، چۆن بە هانای ئەوەوە چوین بەهانای ئەوانیشەوە دەچین. {تەفسیری ڕۆشن، ل٤٨٤}.

## ئەی نەخۆش دوعا بەسەر خۆتدا بخوێنە

فەرموودەیەك: عوسمانی کوڕی ئەبولعاص، عەرزی پێغەمبەری خوای کرد ﷺ، ئازارێك لە جەستەمدا پەیدا بووە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: دەستت دانێ لەسەر ئەو شوێنەی لەشت کە دێشێ و سێ جار بڵێ: (**بِسْمِ اللهِ**) وە حەوت جار بڵێ: (**أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ ما أَجِدُ وَأُحاذِرُ**) رَواهُ مُسْلِمْ: ٢٢٠٢.

واتە: پەنادەگرم بەگەورەیی خودا و بەتەوانایی ئەو ئەم ئازارەی کە هەستی پێ دەکەم و مەترسیم لێی هەیە. (ریاض الصّالحین ب٢، ل٢٦٧).

**ئەی کەسێ کە چووی بۆلای نەخۆش دوعای بۆ بکە**

هاوەڵی پایە بەرز (سەعدی کوڕی ئەبو وەققاس) فەرمووی: نەخۆش بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ سەردانم و سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: (**اللّهُمَّ اشْفِ سَعْداً**) رَواهُ مُسْلِم: ١٦٢٨.

واتە: خوایە دەرمانی سەعد بدە و شیفای بفەرموو.



## ٥) وا نەزانی نەخۆشیەکەت بێ چارەسەرە!

ئەی نەخۆش هەرگیزا و هەرگیز لە خوا غافڵ نەبی و وانەزانی نەخۆشیەکەت بێ چارەسەرە، پشت بەو خوایە ببەستە کە ئەگەر ویستی لەسەرت بوو، بە شێوەیەك شیفات بۆ دەنێرێ، کە خۆت هەرگیز بیرت لێ نەکردۆتەوە و لای خەڵکیش جێگەی تێڕامان و سەرسوڕمانە.

**بەسەرهات:** ئەم چیرۆکە پەیامێکە بۆ ئەو کەسانەی کە نائومێدی و بێزاری بۆتە هاوڕێیان، پاشان بەهۆی دڵگرانیەوە لە ژیان بێزارن و، وادەزانن هیچ کات ژیان ئاسودەیی پێ نەبەخشیون، بەداخەوە زۆرمان تا ئێستا واتای نائومێدی و هۆکارەکانمان

نەبیستوە، نائومێدی کەلەپچەیەکی بەهێزە خاوەنەکەی لە هەموو جوڵە و توانایەك دەخات. مرۆڤی نائومێد خۆشیەکانی دنیا بە ناخۆشی و بێزاری دێتە پێش چاوی، کەسێکی ڕەشبینە. بەڵام کەسێك بیەوێت بەڕێگاکانی ژیاندا بڕوات، بێگومان دەبێت جۆرەکانی ژیانیش بزانێت، هەروەك وتراوە: ژیان ڕێگایەکی دوور و درێژە دەبێت چاوەڕوانی خۆشی و ناخۆشەیەکانی بیت، واتە: هەست بە سەرکەوتن ناکەی تاکو شکست نەهێنیت، هەست بە پشوو ناکەیت، هەتا ماندوێتی نەچێژیت، هەست بە خۆشبەختی ناکەیت هەتا تاڵی نەچێژیت.

## بەدوو شتی سەیر شیفایان بۆ هات ! 〈بەسەرهات〉

دوو پیاو هاوڕێی یەکتردەبن، پێکەوە دەژیان، یەکێکیان نابیناو ئەوی تریان نەخۆشی ئێسکە نەرمەی لەگەڵدایە و ناتوانێت بڕوات، لەسەر ئەو بارودۆخە گوزەریان دەکرد، ڕۆژێکیان برسیەتی زۆری بۆ هێنان، بەڵام هیچ لایەکیان توانای ئامادەکردنی خواردنیان نەبوو، پیاوە نابیناکە بڕیاری دا بچێت بۆ ڕاو، بەڵکو نێچیرێکی دەست بکەوێت، بەڵام کەبیری کردەوە، وتی: چۆن بچم من نابینام، بەهاوڕێکەی گوت: وەرە ئەتخەمە سەر کۆڵم، تۆ ناتوانیت بڕۆیت، منیش نابینام، تەنها تۆ ئاگادارم بکەوە لە ڕاست و چەپ، تاشتێك ڕاوبکەین. بۆیە لەکاتی گەڕانیان بۆ نێچیرێك بینیان ئاسکێکی بچوك

قاچی شکاوە و ناتوانێت بڕوات و خۆی ڕزگار بکات، توانیان بیگرن و بیکەنە خۆراکی ئەو ژەمەیان، ئەو پیاوەی کە ناتوانێت بڕوات مارێکی بینی خەریکبوو نزیك دەبۆوە لە هاوڕێکەی، بەردێکی پیا کێشا و مارەکە تۆپی..

توشی دوو دڵی بوو، وتی: هاوڕێکەم چاوی نیە باشتر وایە بەتەنها ئاسکەکە بخۆم، ئەم مارەش بۆ هاوڕێکەم ببرژێنم!!

نیەتی خۆی جێبەجێ کرد. مارەکەی برژاند و دای بە هاوڕێ نابیناکەی! خۆشی گۆشتی ئاسکەکەی خوارد، پیاوە نابیناکە تێری خوارد، تەنها چەوری مارەکە بەدەستیەوە مابوو، هێنای بەدەم و چاویدا چاوەکانی چاك بۆوە، بەڕۆنی مارەکە!!

هاوڕێکەی زۆر سەرسام بوو، باوەڕی نەدەکرد چاوی چاك بۆتەوە، کابرا نابیناکە کاتێك بینی کلکی مارەکە و چەرمەکە بەدەستیەوە ماوە، سەری مارەکەش لە تەنیشتیەوەیەتی، سەیری هاوڕێکەی کرد کە ئەو کارەی لەگەڵ کردوە زۆر تورەبوو، وتی: ئەمە کۆتایی هاوڕێیەتیمانە، ویستت بمکوژی؟!

لە تورەیی و دڵگرانی خۆیدا لقی دارێکی بریەوە بە توندی کێشای بە قاچی هاوڕێکەیدا، ئەویش لە ترسا کەوتە ڕۆشتن!!

هەردوو هاوڕێکە چاك بوونەوە!!

بەناتەواوی ڕۆیشتن، بەڵام بە سەلامەتی گەڕانەوە، بەڵێ هەریەکەیان بەشتێکی چاوەڕوان نەکراو خودا شیفای پێ بەخشین. {بڕیار، ژ: ٣٧، ل٣١}.

بەسەرهاتێکی ئەم سەردەمە:

بانگخواز و نوسەر، ئەندازیار عُثمان محمد ڕەشید دەڵێ: حاجی عبدالله خەڵکی پێنجوێن بوو، دۆستێکی خۆشەویستم بوو، ڕێز و خۆشەویستی لەنێوانماندا هەبوو، ئەم حاجی یە قورحەی گەدەی هەبوو، هەموو ڕەمەزانێك بەیانیان پارشێوی دەکرد و، تا ئێوارە ئازاری زۆر هەراسانی نەکردایە ڕۆژوەکەی نەدەشکاند.

لە ساڵی هەشتاکاندا ناوبراو ئەچێ بۆ حەج، لە مزگەوتی ڕەسولی نازدار خەوی لێدەکەوێت. لە خەویا پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ تفی موبارەکی ئەدات لە پارچەیەك نانی تیری و، ئەیدا بە حاجی عبدالله، ئەویش دەیخوات.. پاشان کە خەبەری دەبێتەوە، بە فەزڵی خوا بەیەگجاری ئازاری گەدەی نامێنێ و خوا شیفای ئەدات!

ئەم حاجی عبدالله یە، برایەکی هەبوو ناوی کاك عومەر سەد و هەشتا پلە پێچەوانەی ئەم بوو، بێ دینی تەواوبوو، بەڵام خۆی و هاوسەرەکەی زۆر خزمەتی دایکی دەکردو، دایکیشی هەمیشە دوعای هیدایەت و سەرفرازی بۆ دەکرد، ئەم کاك عومەرە بەجۆرێك توشی ئازاری پشت بوو، کە نەیدەتوانی ڕاست ببێتەوە. شەوێك لە

خەویا پێی دەڵێن: ئادەی پاڵکەوە و پێیەك دەنێن بە پشتیا و دەڵێن: دەی هەستە، کە ئەیەویٚ هەستیٚ خەبەری دەبێتەوە، سوپاس بۆ خوا ئازاری نامێنیٚ!! یەکسەر بە ژنەکەی دەڵێت: بەرماڵم بۆ بێنە بارووبکەمە خوا، ئیتر تەواو، لەوساوە ئەبێتە خواناسێکی باش و بەردەوام گویٚ لە قورئان دەگرێت. {بالآنس، ل٣٦}.



## وانەی بیست و یەکەم :

# ئەی نەخۆش دڵنیابە هەموو دەردێك دەرمانی هەیە.. بەویستی خوا!

- بەشی دووەم -

وانەی بیست و یەکەم

بابەت: ئەی نەخۆش لەخوا غافڵ مەبە و، دڵنیابە بە ویستی خوا هەموو دەردێك دەرمانێکی هەیە



۞ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهۡدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطۡعِمُنِى وَيَسۡقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ ﴿٨٠﴾﴾ الشُّعَراء.

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (لِكُلِّ داءٍ دَواءٌ، فَإِذا أُصيبَ دَواءُ الدَّاءِ بَرَأَ بِإِذْنِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ). رَواهُ مُسْلِم: ٢٢٠٤.

سەرچاوەکان:


١) رياضُ الصّالحين، شرح إبنُ عُثيمين.

٢) آياتُ الله في الإنسان، د.محمد راتب النابُلسي، ص٣٦٥.

٣) إسلامُنا، لَمْحَةٌ مُوجَزَةٌ، الدكتور مصطفى السَّباعي، ص٥٠.

٤) گۆڤاری: (تەندروستی و کۆمەڵ) ژ: ٤، کانونی دووەمی ١٩٨٨، ل٢٦، ل١٦، ل٧١.

٥) ڕۆژنامەی (بانگ) ژ: ٣٣، ٢٠١٣/٥/٢٦، ل٢.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمينَ وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعينَ:

لە وانەی ڕابردوودا باسی نەخۆشیمان کرد، پشتیوان بەخوای گەورە لەم وانەیەشدا، هەندێکی تر لەسەر نەخۆشی و شیفای نەخۆشی، لەلای خوای گەورەوە بۆ نەخۆشەکان باس دەکەین. وتارەکەمان بەم فەرموودەیە دەست پێدەکەین:

عبدالله ی کوڕی مەسعود فەرمووی: چومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، لەو کاتەدا پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ تایەکی زۆر بەهێزی لێبوو، لاشەی گەرم داهاتبوو، لە شوێنەواری ئەو (تا) بەهێزە، دەم و چاوی موبارەکی سور هەڵگەڕابوو، منیش عەرزم کرد: **(يا رَسُولُ اللهِ إنَّكَ تُوعَكُ وَعْكاً شَديداً)** ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڕاستی پێتەوە دیارە و بەگەرمی لەشت وادەردەکەوێ، کە تایەکی یەکجار بەهێزت هەیە؟!

فەرمووی: **(أَجَل، إنِّي اوُعَكُ كَما يُوعَكُ رَجُلانِ مِنْكُمْ)** بەڵێ ڕاست وایە، بەڕاستی من تام لێ یەوە، بە ئەندازەی دووکەس لە ئێوە تایەکەم بەهێز و بەرزە، عەرزم کرد: **(ذالِكَ أنَّ لَكَ أجْرَيْنِ؟)** کەواتە بۆ تۆ دوو پاداشت هەیە؟

فەرمووی: (أَجَل، ذالِكَ كَذالِكَ). بەڵێ وایە، من چونکە بەئەندازەی دووکەس لە ئێوە تا و ئازارەکەم قورسە، بە ئەندازەی دووکەس لە ئێوەش پاداشتم بۆ دەنوسرێ.

ئەمجا پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرمووی: (**مامِنْ مُسْلِمٍ يُصيبُهُ أَذيً، شَوْكَةً فَما فَوْقَها، إِلاّ كَفَّرَ اللهُ بِها سَيِّئاتِهِ، وَحُطَّتْ عَنْهُ ذُنُوبُهُ، كَما تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَها**)رَواهُ البُخاريُّ: (٥٦٤٨). واتە: هەر موسڵمانێك توشی ئازارێك ببێ، لەوەی کە دڕکێ ئەچێ بە شوێنێکی جەستەیدا، تا سەروتر لە توشبوون بە ئازار، ئەوا خوای گەورە بەهۆی ئەو ئازارەوە گوناهەکانی لەسەر لادەبات و، خراپەکانی لەسەر ڕەش دەکاتەوە و، لە گوناه پاکی دەکاتەوە، هەروەکو چۆن لە پایزێکی درەنگدا گەڵای دار هەڵدەوەری، ئاواش گوناه لەو بەندە لەش بەئازارە هەڵدەوەرێ.

بەڵێ ئەمە موژدەیە بۆ ئەو نەخۆشانەی کە هەموو جەستەیان بە ئازارە، بەهۆی ئەو هەموو دەرزیەی کە لێیان دراوە، دڵنیابن هەموو دەرزی لێدانێك گوناهی لێ کردونەتەوە، وە هەموو نەشتەرگەری و بەنج وەرگرتن و مانەوە لە نەخۆشخانە و، سەر قەرەوێڵەی نەخۆشی، خوای گەورە گوناهەکانتان لەسەر ڕەش دەکاتەوە و نامەی کردارتان سپی دەبێتەوە.

**بزانن:** دروستە نەخۆش بڵێ: ئای چەند ئازارم هەیە، ئای چەند ناڕەحەتم. بەمەرجێك لە دڵەوە مەبەستی ناڕازی بون نەبێ بەوەی کە خوا بەسەری کردۆتەوە بەو نەخۆشی یە، بەڵکو لە ڕوانگەی ئەوەوەبێ کە مرۆڤ ئەگەر باسی ئەوەی کرد کە لە جەستە و ناخیایەتی و خەڵکی تر پێی نەزانێ، ئەوە سوکنایی و ئیسراحەتێکی بۆ دروست دەبێ. یان لەلای کەسێ بڵێ بەڕاستی ئازاری سەرم هەیە، یان ئازاری سکم هەیە، وەکو هەواڵدان ئەمە بڵێ دروستە، لە کاتێکدا ئەو کەسە دکتۆرێك بێ، یان ئەزمونی لە چارەسەری دەرمانی دا هەبێ، بە ئومێدی ئەوەی کە لەم هەواڵدانەوە عیلاج و چارەسەرێکی نەخۆشیەکەی دەستبکەوێ.

**فەرموودەیەك:** پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەیەك پێش وەفاتی، ڕۆژێکیان چوەماڵەوە، کەچووە ژوورەوە، خاتوو عائیشەی خێزانی سەری بەستبوو، هاواری دەکرد و دەینالاند و دەیفەرموو: **(وا رَأْساهُ)** ئای چەندە ئازاری سەرم هەیە، ئای لەو سەر ئێشە توندەی هەمە! وای سەرم.. پێغەمبەری خواش ﷺ لەو کاتەدا سەری زۆر دێشا و سەرەتای نەخۆشی وەفاتی بوو، فەرمووی: **(بَلْ أنا وَا رَأْساهُ)** منیش ئای سەرم چەند دێشێ و چ ژانە سەرێکی توندم گرتووە!. ئەم فەرموودەیە: (رَواهُ البُخاريُّ: (٥٦٦٦).

زانایان دەفەرموون: لەم فەرموودەیەدا دوو سوننەتی پێغەمبەری تێدا کۆبۆتەوە:

یەکەم: (إِقْرارِتَّة) کە عائیشە فەرمووی: ئای لەو ژانە سەرە توندەم. پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو وامەڵێ، ئەوە چۆن لە نەخۆشی هاوار دەکەی؟ نەخێر، ڕەدی نەدایەوە، ئەمەدان پێداهێنانە بەوەی کە دروستە نەخۆش لە تاوی ئازاری نەخۆشیەکەی بناڵێنێ و بڵێ ئازارم هەیە.

دووەم: (قَولِیَّة). کەخۆی فەرمووی: ئای من چەندە سەرم دێشێ، کە ئەمەش بەقسە و فەرموودەی خۆی دەری بڕی کە دروستە نەخۆش بڵێ: بەڕاستی ئازاری زۆرم هەیە.

## ئەی نەخۆش لەخوا غافڵ مەبە و چاوەڕێی شیفای خوا بکە و، بزانە و بە ئومێد بە کە هەموو دەردێك و نەخۆشیەك دەرمانی خۆی هەیە

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لِكُلِّ داءٍ دَواءٌ، فَإِذا أُصيبَ دَواءُ الدَّاءِ بَرَأَ بِإِذْنِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ). رَواهُ مُسْلِم: ٢٢٠٤.

واتە: بۆ هەموو نەخۆشی و دەردێك دەرمانێك هەیە، جا ئەگەر دەرمانەکە دەرد و نەخۆشیەکەی پێکا ئەوە بەویست و ڕەزامەندی خوا، خوا شیفای دەدا و چاك دەبێتەوە.

لەم فەرموودەیەی پێغەمبەری سەروەرماندا ﷺ چەند وانەی گرنگ هەیە:

١) کە فەرمووی: (لِكُلِّ داءٍ دَواءٌ) بەڕاستی ئەمە دڵخۆشکردنێکی گەورەی تێدایە بۆ نەخۆشەکان و پێیان دەڵێ: هەرگیز نائومێد مەبن و دڵنیابن دەرمانی ئەم نەخۆشیەی ئێوە هەیە، بەمەش ڕوحی نەخۆش و لایەنی دەرونی و مەعنەوی زۆر بەرز دەبێتەوە، حاڵەتی نەفسی و دەروونی نەخۆشیش کە ئومێدی زۆر بە چاك بونەوەی خۆی هەبوو، یارمەتی دەرێکی گەورە دەبێت لەسەر زوو چاك بونەوەی نەخۆش لە نەخۆشیەکەی.

٢) لەم فەرموودەیەدا، هاندانێکی زۆری تێدایە بۆ پسپۆڕانی بواری دەرمانسازی (الصَّيْدَلاني)، کە هەمیشە لە تێکۆشان و بەدوادا گەڕان و توێژینەوەی زاستی نوێدا بن، چونکە ئەو نەخۆشیەی ئەمڕۆ دەرمانی نیە، مانای ئەوە نیە ئیتر دەرمانی پەیدا نابێ، بەڵکو هەیە و خوای گەورە لەگەڵ نەخۆشی یەکەدا، دەرمانەکەشی داناوە، بەڵام بەدوادا گەڕان و لێکۆڵینەوەی زانستی دەوێ و، دەبێ زانایانی بواری پزیشکی و دەرمانسازی و ڕووەکناسی لە هەوڵی ئەوەدابن، کە دەرمانی نەخۆشی یەکان بدۆزنەوە، کە بەدڵنیاییەوە هەیە.

٣) لەم فەرموودەیەدا کە خۆشەویست و ڕێگا نیشاندەرمان، بۆ هەموو خۆشبەختی و ڕزگاربوونێك لە ئازار ـ هەزاران صەلات و سەلامی خوای لەسەربێ ـ فەرموویەتی، کە فەرمووی: (**فَإِذا أُصيبَ دَواءُ الدَّاءِ**) ئەگەر دەرمانەکە نەخۆشی و دەردەکەی پێکا، بەویستی خوا ئەو نەخۆشە ڕزگاری دەبێت. ئەم فەرموودەیە ئاماژە بو زەروریەتی هەڵبژاردنی دەرمانی گونجاو بۆ ئەو نەخۆشی یە، لە شێوەی چۆنیەتی و چەندیەتی (**النَّوعُ وَ الكَمُّ**) ئایا چ جۆرە دەرمانێکی دەداتێ؟ وە ئایا چەندی لەو دەرمانە دەداتێ؟ چونکە بڕی دەرمان ئەگەر لە ڕێژەی خۆی و پێویست کەمتربێ، نەخۆشیەکە نافەوتێنێ و ئەگەر لە خۆشی زیاتر بێ توشی نەخۆشی تری دەکات.

کەواتە: دیاریکردنی جۆری نەخۆشیەکە (**التَّشخيص**) لەلایەن پزیشکی پسپۆڕەوە زۆر گرنگە، بەداخەوە زۆربەی جار نەخۆش تەخشیصی نەخۆشیەکەی نەکراوە و هەر لە خۆیەوە دەرمانی پێدەدرێ و هەندێ جار نەخۆش لە وڵاتی ئێمە دەرمانی لەسەر تاقیدەکرێتەوە، بەمیان چاك نەبوو، بۆی دەگۆڕێ بە جۆرێکی تر، کە سەرەنجام نەخۆشەکە لەناو دەچێ!!



## بەسەرهاتێکی سەرنج ڕاکێش:

نوسەری ناودار (د.مصطفی السباعي) لە کتێبەکەیدا: (إسْلامُنا، لَمْحَةٌ مُوجَزَةٌ، ص٥٠) دەفەرمووێ: لە کۆندا، یەکێ لەزانایان و حەکیمانی وڵاتی غەیرە موسڵمان، دەیەوێت شارەزایی و پسپۆڕی موسڵمانان لە بواری پزیشکی دا تاقی بکاتەوە و، بۆی دەربکەوێ ئایا موسڵمانان هەر لە بواری عەقیدەی ئیسلامی و شەریعەتدا شارەزان، یان لە هەموو زانستەکان و، بە تایبەت زانستی گرنگی پزیشکی دا پسپۆڕن و زانای گەورەیان هەیە..

بۆیە هاتە ناو موسڵمانان و چوە شاری (دیمەشق) و جل و بەرگی پیاوێکی هەژاری نەداری بیابانی لەبەرکرد و، ڕووی کردە نەخۆشخانەی گەورەی شار و، خۆی نەخۆش خست و دەستی بە سکیەوە گرت و خۆی دەڕشاندەوە و، وا خۆی نیشان دەدات کە مردنی لە ژیانی نزیکترە.. بەڵێ نەخۆشخانەوەری دەگرێ و پزیشکەکان لەسەری کۆدەبنەوە، کە دەزانن غەریبە و خەڵکی ئەوێ نی یە، زیاتر بۆی بە پەرۆش دەبن و دەست دەکەن بە لێکۆڵینەوە لە نەخۆشی یەکەی و، ئەمیش زیاتر هات و هاوار دەکات و داوای چارەسەر دەکات.

بەلاّم سەرۆکی دکتۆرەکان، دوای گرتنی لێدانی دڵی و تەماشاکردنی دەم و زمان و نینۆك و ناوچاوی، بانگی دکتۆرەکان دەکات و دەفەرمووێ: ئەم پیاوە هیچ جۆرە ئازار و نەخۆشی یەکی

نی یە و، بە ئەنقەست و عەمدی خۆی نەخۆش خستووە! جا بە چ مەبەستێ ئەمەی کردووە نازانم، بەڵام ڕەنگە بۆ تاقیکردنەوەی ئێمە بێت! بۆیە هیچ عیلاج و دەرمانی بۆ مەنوسن بەڵکو لە ژورێکدا کە نەخۆش تێیدا دەخەوێ، بیخەوێنن و تاماوەی سێ شەو و سێ ڕۆژ خزمەتی بکەن و، سێ ژەمە خواردن و میوەی چاکی پێشکەش بکەن و بڵێن دەرمانەکەمان بۆ کردویە ناو خواردنەکەوە، دوای سێ ڕۆژەکە ئاگادارم بکەنەوە..

بەڵێ ئەوانیش ئەمە جێبەجێ دەکەن و، کابرای بەحیساب نەخۆش سەری سوڕدەمێنێ لەم خزمەت و خواردنە باشە و، لەوەی کە هیچ دەرمانێکی ئاشکرا و دیاری پێ نادەن و، دەڵێ هەست دەکەم تۆزێ باشترم! لە ڕۆژی سێهەمدا سەرۆکی نەخۆشخانەکە ئاگادار دەکەنەوە و ئەویش دەڵێ: ئەم نوسراوەی پێ بدەنێ و پێی بڵێن: ئەمە فەرمانی دکتۆرە بۆ دەرچونت و بۆی بخوێنەوە، کە بردیان بۆی لێی نوسرابوو:

بەڕێز لای ئێمەی موسڵمان ڕێز و حورمەتی میوان و کەسی غەریب و نەناس واجبە، وە میوانداریش لای ئێمەی موسڵمان تەنها سێ ڕۆژە و، تۆش سێ شەو و ڕۆژەکەت تەواوبوو، خوات لەگەڵ! !

ئەمجا کابرای حەکیم و زانای ناموسڵمان تێگەیشت، کە پزیشکی موسڵمان لە پسپۆڕیدا و لە دیاریکردنی جۆری نەخۆشی دا، بەڕاستی کارامە و لێهاتوون، وە لەیەکەم ساتەوە زانیویانە بە

ئەنقەست خۆی نەخۆش خستوە و هیچی نیە و، ئەوەی بۆی کراوە حورمەتی میوانداری بوە و بە ئەدەبەوە پێیان وتووە: سەرەتا زانیمان نەخۆش نیت!

بەڵێ دکتۆری ڕاست و شارەزا، پێویستە ئاوا بە تەواوی تەشخیصی نەخۆش بکات، ئەمجا دەرمانی بۆ دابنێت، نەك وەکو ئەو کارەساتە دڵتەزێنەی کە لە مانگی (٥) ی (٢٠١٣)دا ڕوویدا لە کوردستان، کە کۆمەڵێك کەس بۆ چارەسەری چاویان ڕوویان کردبوە، نەخۆشخانەی چاو بەڵام بەهۆی ناشارەزایی و کەمتەرخەمی سیستەمی تەندروستی لە بەکارهێنانی دەرزی (ئاڤاستین) کەسانێك نابینابوون و، کەسانێك کەمبین بوون و، (سێ) کەسیش لەبەر ئازاری زۆری چاویان کە ئەو دەرزیەیان لێ درابوو، گەیەندرانە وڵاتی (ئەڵمانیا)، بەڵام لەوێ چارەسەرەکەیان ئەوەبوو کە (چاویان دەرهێنرا و بونە خاوەن پێداویستی تایبەت!!)

٤) لە فەرموودەکەی پێغەمبەری پێشەوامان‌دا ﷺ کە فەرمووی: (بَرَأَ بِإِذْنِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ). بە ویستی خوا نەخۆشەکە چاك دەبێت، ئەوە فێردەبین: کە دوای دیاریکردنی جۆری نەخۆشیەکە لەلایەن پزیشکی پسپۆڕەوە و، دیاریکردنی دەرمانی تایبەت بەو نەخۆشی یە بە ڕێژەی پێویست و، لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا، هەمویان مەرجی پێویستن، بەڵام بەس نین بۆ چاك بونەوە، بەڵکو

ئەمجا پێویستی بەوە هەیە کە خوای پەروەردگار فەرمان و ئیزنی لەسەر بێت کە ئەو نەخۆشە چاك دەبێتەوە. وە پەروەردگارێك کە دەرد و دەرمان بەبێ ئیزنی ئەو دروست نابن، فەرمانی لەسەر ئەوەبێ، ئەو دەرمانە ببێ بە شیفای ئەو نەخۆشی یە، یان سوکی بکات و ئازارەکەی کەم بکاتەوە. هەربۆیە پێویستە مرۆڤی موسڵمان کاتێ دەرمان بەکاردێنێ لەکاتی خواردن و بەکارهێنانیدا (بسم الله) بکات و کە خواردی بڵێ خوایە گیان (یا الله، یا شافی) شیفام بدەی و یەقینی هەبێ کە خوای گەورە وەڵامی داواکەی دەداتەوە و شیفای دەدات.



## لەخوا غافڵ مەبە و بزانە کە خوا شیفای نارد زۆر ئاسانە..

ڕووداوێکی ڕاستەقینە لە کوردستانەوە: نازانی شیفا لە چیدایە!

مامۆستا (کەریم مصطفی شارەزا) ئاوا بەسەرهاتی نەخۆشی و شیفا هاتنی خوایی خۆی دەگێڕێتەوە:

ساڵی (١٩٦٥)ی زاینی بوو، وەرزیش ناوەڕاستی بەهاربوو، گۆڤاری (طبیبُكَ) ـ پزیشکی تۆ ـ ببوە گۆڤاری بەبرەوی نیمچە ڕۆشنبیران، هەر ژمارەیەکی دەردەچوو، خەڵکێکی زۆر دەیان کڕی

و منیش یەکێك بووم لەو خەڵکە و، دەمکڕی و زوو دەکەوتمە خوێندنەوەی گۆشەی پرسیار و وڵامەکانی.. دکتۆر (سەبری قەببانی)ی خاوەن و سەرنوسەری گۆڤارەکە، زۆر کەس بەنامە پرسیاریان لێدەکرد و باسی نەخۆشی یەکی خۆیان بۆ دکتۆر دەنوسی و، ئەویش بەپێی نیشانەکانی ئەو نەخۆشی یە، جۆری دەرمان و ڕاسپاردە پزیشکی یەکانی خۆی، بۆ خاوەن پرسیار دەنوسییەوە.

لەو کاتەدا من زیپکەیەکی بەخورشتم لە پشتی دەستی چەپمدا پەیدا ببوو، ڕۆژ بەڕۆژ زیادی دەکرد و خوێنی تیێ دەدزا و، پتر سور هەڵدەگەڕا و بڵاودەبونەوە، تاکو پشتی دەستمی هەموو گرتەوە، زۆر پێی سەغڵەت بووم. لەو کاتەدا بەوردی پرسیار و وەڵامە پزیشکی یەکانی بەشی نەخۆشی پێستی ژمارەیەکی ئەو گۆڤارەم خوێندەوە، لە پڕ گەیشتمە پرسیاری یەکێك کە دەیگوت: (زیپکەیەکم لە دەست هاتووە و خورویەکی زۆری هەیە و دەوروبەرەکەی سور هەڵگەڕاوە، وە دەستمی بەڵەك کردوە و، گەڵێ داو و دەرمانم لێ ناوە کەچی هەمووی بێ سودە، ئایا چارەی چی یە؟)

لە وەڵامدا دکتۆر یەك دوو ئیحتیمالی بۆ جۆری نەخۆشیەکەی نوسی بوو، یەك لەوانە: نەخۆشی (بەڵەکی)بوو، وە چەند مەرهەمێکی بۆ دیاری کردبوو بەکاریان بێنێ، کاتێ ئەو وەڵامەی

(د.قەببانی)م خوێندەوە دڵم ڕاچەنی و وتم: لەوانەیە زیپکەی دەستی منیش سەرەتایەك بێ بۆ بەڵەکە، هەستام بەپەلە چووم بۆلای پزیشکی شارە بچکۆلەکەم و، وەك بزانم دکتۆری گشتی بوو، پسپۆڕی لە نەخۆشی (پێست)دا نەبوو.

ئەویش دوای پشکنین و سەرنج دانی زیپکەکە و سوراییەکەی دەور و پشتی، دڵی دامەوە و گوتی: (هیچ نیە، تەنیا زیپکەیەکی ئاسایی یە و بەم دەرمانە چاك دەبێتەوە)و جۆرە مەرهەمێکی بۆ نوسیم و چۆنیەتی بەکارهێنانی تێ گەیاندم. منیش بۆماوەی حەوت ڕۆژ لەسەر یەك بەکارم هێنا، کەچی بێ سود بوو، هیچ کارێکی لە زیپکەکە نەکرد و دوایی چومەوە لای پزیشکەکە و ئەم جارە جۆرە مەرهەمێکی تر و چەند دەرزیەکی (پەنسلین پڕۆکایین) بۆ نوسیم و بەکارم هێنان، کەچی ئەم جارەش بێ سود بوو. لە جیاتی دامرکانەوە پتر خوێنی تێزا و زیاتر سور هەڵگەڕا..

ئینجا زۆر زیاتر بیرم لە نەخۆشیەکەی کابرای پرسیارکەر و وەڵامەکەی دکتۆر قەببانی و، دەردی (بەڵەکی) دەکردەوە و دەمگوت: (خۆیەتی، منیش وا توش بووم!! تاماوم دەبێ بەم دەردە پیسەوە گرفتاربم)!!

ڕۆژێك پیاوێکی بەتەمەنی دنیا دیتەی دۆستی باوکم توشم بوو، دوای چاك و چۆنی، چاوی بە زیپکەکەی پشتی دەستم کەوت، کە

حەزم نەدەکرد هەموو کەسێك بیبینێ، پێی گوتم: دەستت چ خێریەتی؟ بۆ وای لێهاتووە؟!

منیش گوتم: وا ماوەی سێ چوار هەفتەیە بەم زیپکەیەوە گرفتارم و بەهیچ دەرمانێك چاك نابێتەوە، ئەویش دوای ئەم وەڵامەم گوتی: رۆڵە ئەمە (تەڕە بیرۆیە)و جۆرە نەخۆشیەکی پێستە و لە وەرزی بەهاراندا، لە ئەنجامی زۆر خواردنی ماست و بەروبومی شیری مەڕومالاَت، توشی هەندێ کەس دەبێ. چارەسەری ئەم جۆرە دەردەش (ڕۆنی دار زی)یە، کە جۆرە درەختێکی زۆر دڕکاویە و بۆ پەرژینی باخ و ڕەزان بەکاردێ، لە هەندێ ناوچەی تری کوردستان پێی دەڵێن: (ئەستری) یان (ستری).

منیش گوتم: بەو هەموو دەرمانەی پزیشك چاك نەبۆتەوە چۆن بە ڕۆنی زی چاك دەبێتەوە؟!!

ئەویش گوتی: تۆ بەقسەی من بکە و بەکاری بهێنە، خۆ نە پارەی پێ دەدەی نە زیانیشت لێ دەکەوێ، تاقی کردنەوەیەکە و دەیکەی، یان سودی لێ دەبینی و ڕەحمەتم بۆ دەنێری، یاخود وەکو دەرمانەکانی ترت بێ کەڵك و بێ ئەنجام دەبێت!!

منیش گوتم: باشە بەگوێت دەکەم، بەلاَم پێم بڵێ چۆن (ڕۆنی زی) دەردێت و دروست دەبێت؟! ئەویش گوتی: هەندێ لقی دار زێیەکە بێنە و وردیان بکە و هەر ڕۆژە دوو پارچەی بچوکی لێ

بسوتێنە و، دەفرێكی شوشە سەرەو ژێر بخەرە سەر دوكەڵەكەی، لە ئەنجامدا ڕۆنێكی زەردی مەیلە و قاوەیی بەناو دەفرەكەدا دەنیشێ، ئینجا هەر بە گەرمی بە پەنجە ئەو ڕۆنە لە دەفرەكە بكەوە و، لە زیپكەكە و دەورووپشتی هەڵسوو، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ئەم كارە بكە، ئینجا بزانە بەچاوی خۆت دەبینی چ كاریگەریەكی دەبێ؟!!

كە گەڕامەوەماڵەوە، ڕام سپارد، چەند لقێكم لەو جۆرە (زی)یە بۆ بێ. چۆنی وتبوو ئاوام كرد و ڕۆنی زیەكەم لێدا.. بۆ ڕۆژی دووەم هەستم كرد سورایی زیپكەكە و دەورووپشتی بەرەو نەمان دەچێ و، دەست دەكات بە توێژ فڕێدان و لەو كاتەدا دڵم زۆر شاد بوو، وەخت بوو لە خۆشیاندا باڵ بگرم!

هەستام لە جیاتی سێ ڕۆژ بۆ ماوەی (حەوت) ڕۆژ لەم ڕۆنی زیەم گرت و لە زیپكەكەم دا، كاتێكم زانی پشتی دەستم هەمووی بوو بە توێژی سپی و، دوای سێ ڕۆژ نە زیپكەكە ما و نە سوراییەكەی دەورووپشتی و، هیچ شوێنێكیشی لە پشتی دەستمدا بەجێ نەهێشت! زۆر شوكر بۆ ئەوەی كە نەك هەر ئەو جۆرە برینە سەیروسەمەرەیەم لە كۆڵ بۆوە، بەڵكو ئەو جۆرە خەیاڵە سەیر و سامناكەی دەردی بەڵەكی خاوەن پرسیارەكەی گۆڤاری (طَبيبُكَ)ەشم لە مێشك دەرهات و، بارێك سوپاسم بۆ خاڵۆی پزیشكی میللیم نارد..

لێرەدا من هەر ئەوەندە دەزانم و دەڵێم: ئەو (ڕۆنی دار زی)یە، بریتیە لە: (کاربۆن و ئاو و جۆرە چەوریەك)، بەڵام ئەوە نازانم چ جۆرە ئەنزیم و توخمێکی تری تێدایە، کەوا بۆتە هۆی کوشتنی میکرۆبی ئەو جۆرە زیپکەیە؟ کە چەشنە تەڕە بیرۆیەکە و بیرۆش جۆرێکە لە سەدەها جۆری (ئەکزیما)، کە توشی پێست دەبێت، ئەوەشم بۆ ساغ نەبۆتەوە کە بۆ تەنیا ڕۆنی دار زی دەرمانە بۆ ئەم نەخۆشیانەی پێست و، بۆچی ڕۆنی دوکەڵی هەموو درەختێك نابێتە هۆی چاك بونەوەیان؟! لە کۆتایی ئەم بەسەرهاتەدا دەگەینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١) ئەگەر یەکێك توشی نەخۆشیەك بوو، واباشە بچێتە لای دکتۆرێکی پسپۆڕ لە نەخۆشیەکەی، تاکو بەچاکی لە دەردەکەی بگات و توشی هاتوو چۆ و ماندوبونێکی بێ سود نەبێ.

٢) پزیشکی میللی لەناو هەموو نەتەوەیەکدا بایەخی پێ دەدرێ، چونکە ئەنجامی تاقیکردنەوەیەکی دور و درێژی میللەتە و، لەداو و دەرماندا بەزۆری پشت بەڕووەك و گیا و گوڵی پزیشکی و، چارەکردنی پزیشکی و، چارەکردنی سروشتی دەبەستێ. پزیشکی نوێش لەم دوایی یەدا بایەخێکی تەواوی داوە بەو جۆرە چارەکردنە.

٣) زانینی نەخۆشی و دەستنیشان کردنی و، چارە بۆ دۆزینەوەی، بەهۆی گۆڤاری پزیشکی و بەرنامەی تەلەفیزۆنی نابن،

بەڵکو لە ڕێگەی پزیشکی پسپۆڕ و بەهۆی پشکنینی ورد و، وێنەی ئەشیعە و تەحلیلی خوێن و میز و پاشەڕۆکی نەخۆشەکەوە دەبێ، کە نەخۆشی یەکە زانرا، ئەو کاتە دەرمانی شیفا بەخشی بۆ دەنوسرێ. بە ویستی خوای پەروەردگار. {تەندروستی و کۆمەڵ، ژ: ٤}.

لێرەدا لەگەڵ گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتەدا دەبێ ئەوەش بڵێین کە: ئەی مرۆڤ لەخوا غافڵ مەبە و هەرگیز ڕەخنە لە کاری خوا نەگری، بۆ نمونە: نابێ بڵێی باشە بۆچی خوای گەورە (دڕکەزی) دروست کردوە، خۆ ئەگەر زەمانی زوو خەڵکی بۆ پەرژینی باخ و ڕەزەکانیان بەکاریان دەهێنا، خۆ ئێستا خەڵکی بە تەلی پاك و خاوێن و، بێ ئەرك پەرژینی باخ و ڕەزەکەی دەکات و پێویستی بە زی نیە! نەخێر، کاری خوا هەمووی جوانە و هەمووی پڕ حیکمەتە و، هەرچی دروستی کردووە بۆ خزمەتی مرۆڤە. مەرج نی یە تەنها بۆ ئەو شتە دروست کرابێ و، تەنها ئەو خزمەتەی پێ بکرێ کە مرۆڤ لە قۆناغێکی ژیاندا لێی سودمەند بووە، بەڵکو دەیەها سودی تری هەیە، کە بەپێی سەردەم و پێشکەوتنی زانست ئەمجا ئەدۆزرێتەوە. ئەوەتا (داری زی) تەنها بۆ پەرژینی باخ بەکەڵك نەهات. بەڵکو باشترین دەرمانی بیرۆی نەخۆشی پێستی لێ دروستکرا!!

یان ئەوەتا ئەمڕۆ زانایان دەڵێن: (ئەو پێکهاتەیەی حەبی (ئەسپرین) کە مرۆڤ بۆ چارەسەرکردنی ئازار و سەرئێشە بەکاری دەهێنێت لە (دار چنار) دروست دەکرێت!! {یەکگرتوو، ژ: ١٠٢٣، ل٨}.

بۆیە نابێ کەسێك بڵێ : خۆ ئێستا خەڵکی خانو بەدار دروست ناکات و بەشیش و چیمەنتۆ سەقفی خانوو دروست دەکرێ، ئیتر دار چنار بۆچی باشە؟! نەخێر، ئەوەتا دەرمانێکی گرنگی لێ دروست دەکرێ.

وە لە داهاتوودا زانستی دەرمانسازی چەندین شت لە ڕووەك و گژوگیا دا دەدۆزێتەوە، کە پێشتر نەزانرابوون، هەموشی بە ویستی خوایە و دیاری خوایە بۆ مرۆڤەکان، هەزاران سوپاس بۆ تۆ خوایەگیان.



## مەرج نی یە چارەسەر تەنها هەر بە دەرزی و دەرمان بێت

مرۆڤ هەندێ جار توشی جۆرێك لە كاركەوتنی ئەندامێكی جەستەی دەبێت و، لەم حاڵەتەدا پزیشكی پسپۆڕ و بە ئەزمون، مەرج نی یە تەنها بە دەرمان و چارەسەری دەرمانی، هەوڵ بۆ چاك بونەوە و گەڕانەوەی دەور و ڕۆڵی ئەو ئەندامە لەكاركەوتوە، یان لاوازبوە بدات، بەڵكو زۆرجار لە ڕێگەی تایبەتی دەرونی یەوە، بەویست و شیفای خوا، نەخۆشەكە بەبێ بەكارهێنانی دەرمان چاك دەبێتەوە..

## چارەسەری منداڵێكی ناگۆ

بەسەرهات

لەساڵی (١٩٨٧)دا لە كۆتایی ئەو ساڵەدا، لە شاری هەولێر، تیمێكی پزیشكی هەوڵیاندا و بە ویستی خوا سەركەوتووبون، كە توانیان منالێكی تەمەن (١١) ساڵ كە ماوەی سێ ساڵ بوو، واتە لە تەمەنی (٨) ساڵی یەوە، لە ئەنجامی كارەساتێكی دڵتەزێندا، زمانی لەگۆكەوتبوو وە توانای دەربڕینی تاقە ڕستەیەكی نەمابوو! ئەم منالە ناوی (دڵشاد)بووە، دڵشادی لاڵ ـ ناگۆ ـ لەگەڵ كۆمەڵێك كەڕولاڵی تر ـ ناگۆ و نابیست ـ ی تردا، لە خانەی چاودێری منالان لە سلێمانیەوە ڕەوانەی هەولێر كرا، بۆ بەردەم ئەو لیژنە نوژداری یەی كە بەرپرسە لە فەحصص كردنی كەڕولاڵەكان،

کاتێك ئەندامانی لیژنەکە چاویان بە (دڵشاد) دەکەویّ، دەم و دەست هەست دەکەن کە کەڕولاڵیەتی ئەم منداڵە زگماك نی یە، بەڵکو ئەنجامی کارەساتێکە و دەکریّ چارەسەر بکرێت.

جا دوای ئەوەی هەواڵی ئەم چارەسەر کردنە بڵاوبۆوە، دکتۆرە بەرێزەکان وتبویان: دوای ئەوەی دڵنیابوین کە ئەمە حاڵەتێکی دەرونی یە و کەڕولاڵیەتی زگماك نی یە، چونکە هەڵسوکەوت و جوڵانەوەی کەڕولاڵی زگماك لەگەڵ کەڕولاڵیەتی تر، کە بەهۆی کارەساتێکەوە زمانی گیرابیّ جیاوازە، بۆیە کەوتینە دانان و نەخشە و پیلان بۆ چۆنیەتی چارەسەرکردنەکە، لیژنەی پزیشکی بڕیاریدا چارەسەرکردنی (دڵشاد) بخرێتە ئەستۆی (د.نزار محمد أمین) کە نوژداری نەخۆشی یە دەرونیەکانە، دکتۆر نزاریش بەم شێوەیە باسی چارەسەرەکە دەکات و دەڵیّ:

یەکەم هەنگاومان ئەوەبوو، بەهەموو کارگێرانی نەخۆشخانە و خانەی چاودێری مێر منداڵان و ئامۆژگاری کەڕولاڵان ڕابگەیەنین، کە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئەم مناڵە تایبەتی بێت و، وەك کەڕولاڵ ڕەفتاری لەگەڵ نەکەن، هەروەها داوام لە پشکنەری کۆمەڵایەتی (باحِث إجتماعی) خانەکە، کاك (سامی صابر أمین) کرد کە ڕۆڵی باوکایەتی لەگەڵدا بنوێنیّ و داواشم لە خوشکە (تاڤگە نافع) کرد، کە ئەویش پشکنەری کۆمەڵایەتی یە لە نەخۆشخانە، وەك دایکێك ڕەفتاری لەگەڵدا بکات، بەم جۆرە لە ژێر باڵی سۆز و هەستی

ناسکی هەموو کاربەدەستانی ئەو شوێنانەدا، گوزەرانی دەکرد و دەژیا. پاشان داوام لە (دڵشاد) کرد کە ناو بەناو بێتە لام بۆ نەخۆشخانە، چونکە دەمویست ڕێبازی چارەسەری دەرونی پشتگیری لەگەڵدا بەکاربێنم.

تا بتوانم وای لێبکەم زیاتر بڕوا بەخۆی بکات. ئەمە قۆناغی دووەم بوو، قۆناغی سێهەمیش ئەوەبوو کە چەند جارێك لەگەڵ (دڵشاد) دانیشتم و ڕێبازی (إحياء)م لەگەڵ بەکارهێنا، بۆئەوەی تێی بگەیەنم کە ئێمەی نوژدار دەتوانین چاکی بکەینەوە. بۆ ئەم مەبەستەش کاتێکی تایبەتیمان دیاری کرد، کە دڵشاد بێتە نەخۆشخانە بۆ تەواو کردنی چارەسەرکردنەکەی، ئیتر ئەوەبوو لە نەخۆشخانە دەرزیەکی بەنجم لێدا و، پێی کەوتە حاڵەتێکی نیوە خەوتوو..

ئەم ڕێبازەش بۆ چارەسەرکردنی گرێ دەرونیەکان بەکاردێت، چونکە نەخۆش دەخاتە حاڵەتێکی بێ ئاگایی (اللاشعور)یە وە و هەموو ئەو کۆسپ و تەگەرە دەرونیانە تەخت دەکا، کە نایەڵن شتە شاردراوە و پەنگ خواردوەکانی ناخی بدرکێنێ، بەم جۆرە گرێ دەرونیەکەی دەکرێتەوە و، ئەوەی هەیە و نی یە دەری دەبڕێ. هەر بەم پێ یەش دڵشادی زمان گیراو هاتەوە گۆ و دەستی بە ئاخافتن کرد! ئەو کاتەی کە لە ژێر بەنجدا بوو وتی: من خەڵکی شاری پێنجوێنم، کاتێك باوك و دایکم لێك جیابونەوە تەمەنم

(حەوت ساڵ و نیو)بوو، لە پۆلی دووەمی سەرەتایی بووم، دایکم ڕۆشت و خوشکە بچوکەکەمی لەگەڵ خۆیدا برد، ئێمەش ماینەوە و من و باوکم و براکەم، باوکم ڕۆژ بە ڕۆژ کاسپی دەکرد و، بەشەویش سەرپەرشتی دەکردین، تەنانەت جێی دایکیشی بۆ گرتبوینەوە، ماوەی شەش مانگ بەو شێوەیە گوزەرانمان کرد، ڕۆژێکیان لە کۆڵان بووم، لەگەڵ هاوڕێکانم یاریم دەکرد، ئەوەندەم زانی لەناکاو فڕۆکەیەکی ئێرانی ـ شەڕی عێراق و ئێران بووە ـ هات و کەوتە بۆردومان کردنی شارەکەمان..

لەو کاتەدا بینیم بۆمبایەك بەرماڵەکەمان کەوت، منیش بە پڕتاو ڕامکردە ماڵەوە، بەڵام چیم دی!! ئەوەبوو براکەم لە خوێندا کەوتبوو گیانی دەرچوبوو، باوکیشم هەر پارچەیەکی کەوتبوە لایەکی ماڵەکە!! کە چاوم بەم دیمەنە سامناك و جەرگ بڕە کەوت، ویستم پڕ بە دەم هاواری باوکە ڕۆبکەم، زمانم گیرا و هەرچەندم کرد نەمتوانی یەك ووشە دەبرم، ئیتر لەو ساتەوە تا ئێستا هەر بە زمان گیراوی مامەوە..

بەڵێ دڵشاد لە ژێر بەنجەکەدا ئەم قسانەی ناو ناخی کرد و، دوایی تەواو زمانی کرایەوە و وەکو جاران دەستی کردەوە بە قسەکردن و، بڕیار درا بگەڕێنرێتەوە بۆ قوتابخانە بۆ ئەوەی خۆی بەکەم نەزانێ و دوا ڕۆژیشی لە دەست نەچێك، وە پاشان هەوڵبدرێ

که کەسوکاری بدۆزنەوە و ئەگەر بتوانن بیگرنە خۆیان، بە مەرجێك خۆی قایل بێت... {تەندروستی و کۆمەڵ ژ: ٤٠}.



## چەند سەرنج و تێبینیەکی پێویست:

### ١- بێ ڕاوێژی پزیشك دەرمان بەکارمەهێنە:

لەخۆتەوە بەبێ زانستی تەواو و ڕاوێژی پزیشکی دەرمان بەکارمەهێنە، با ئەو جۆرە خواردن و دەمانەش بە پیرۆز و موبارەك لە قورئاندا ناوی هاتبێ. بۆ نمونە (هەنگوین) خوای گەورە لەبارەی هەنگوینەوە فەرموویەتی: ﴿فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ﴾. بۆگەلێك نەخۆشی شیفای تێدا هەیە.

بەڵام: خوای گەورە نەیفەرموو: بۆهەموو نەخۆشیەك شیفایە، بۆیە نابێ بەناوی ئەوەی هەنگوین شیفایە بیدەین بە هەموو کەس، بۆ نمونە: منالێك کە تازە لە دایك بووە، نابێ هەنگوینی بدرێتێ گوایە بۆ زەردویی باشە. چونکە ئەمە بۆ گەورە شیفایە. بەڵام منالّ گەدە و ڕیخۆڵەی بەرگەی هەنگوین ناگرێ و پێی لەناو دەچێ! بۆیە تاتەمەنی منالّ دەبێتە یەك سالّ نابێ هەنگوینی بدرێتێ.

یاخود کەسێك (تا)ی لێ بێ نابێ هەنگوینی بدرێتێ، چونکە لەوانەیە بیکوژێ!

**بەسەرهاتێك:** مامۆستای جەلی زادە، مەلا محمدی گەورەی کۆیە. لە تەفسیرەکەیدا دەفەرمووێ: (حاجی مەلا أحمدی مامم) توشی زگچونی خوێناوی بوو، بەردەوام وەکو چارەسەر شەربەتی هەنگوینی دەخواردەوە، عەرزم کرد: هیچی تر هەنگوین مەخۆوە، بۆ تۆ خراپە چونکە خوێن دادەنێ ی، لێم تورە دەبوو، دەیفەرموو: خوا ئەفەرمووێ: ﴿فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ﴾..

ئەمگوت: قوربان ئەم ئایەتە کە باسی هەنگوین دەکات وەکو شیفا مانای وانی یە، بۆ هەموو دەرد و نەخۆشی یەك و بۆ هەموو کەسێك شیفایە، بۆئەم نەخۆشی یەی تۆ هەنگوین خراپە. بەڵام بە قسەی نەکردم، هەتا ئەو شەوەی کە تێیدا چۆوە ڕەحمەتی خوای، خێزانی دەیفەرموو: مامۆستا شەربەتی هەنگوین ناخۆیتەوە؟

دەیفەرموو: نا، ناخۆمەوە، ـ کاك (حمد) مەبەستی مەلای گەورە بوە ـ دەڵێ خراپە، بەڵام تازە کار لەکار ترازابوو، مرد! ڕەحمەتی خوای لێبێ.

هەروەها مەلای گەورە دەفەرمووێ: باوکم نەخۆشبوو، هەنگوین و ڕۆنە کەرەی خوارد، لێی کرد بە زگچونی خوێناوی و کاری لە جگەری کرد و پێی چوە ڕەحمەتی خوا! خوا لێی خۆش بێ. لەبەرئەوە دەرمان چ حەب و عیلاج بێ، یان گژوگیا و دەرمانی

کوردەواری بیّ، سەربەخۆ بەبیّ ڕێنمایی دکتۆر و دەرمانساز و حەکیمی بەتەجروبە مەخۆ.

### ٢- نابێت دکتۆر دەرمانت بۆ نەنوسیّ:

واچاکە دکتۆر هیچ کات بە نەخۆش نەڵیّ عیلاجت بۆ نانوسم. چونکە لەوانەیە نەخۆشەکە وا تێبگات کە ئەم نەخۆشی یەی ئەو، چارەسەری نی یە و دکتۆر لێی بیّ ئومێد بوە، کە چاك دەبێتەوە و ئیتر بە تەواوی ئەڕوخیّ. بەڵکو دکتۆر بە ئەوپەڕی متمانەوە بە نەخۆش بڵیّ دەرمانێکی زۆر چاك و بەسود و کاریگەرت بۆ دەنوسم، بە ویستی خوا هەرزوو چاك دەبیتەوە، ئەو کاتە دەتوانی دەرمان و حەبێکی ئاسایی بداتیّ و، بە ویستی خوا دەبێتەی مایەی شیفا.

**بەسەرهاتێك:** نەخۆشێك هەبووە، کە هەموو ڕێگەیەك بۆ چارەسەرکردن لەگەڵیدا بیّ سود بوو، تا پزیشکێك بیرێکی ئاسان و زیرەکانەی بۆ هات و بە نەخۆشەکەی وت: چارەسەرێکی نویّ دۆزراوەتەوە کە لەوانەیە لە ماوەی (٢٤) کاتژمێردا چارەسەرت بکات. نەخۆشەکە بە خۆشحاڵیەوە داوای بەدەست هێنانی ئەو چارەسەرە سەرنج ڕاکێشەی کرد. دکتۆرەکەش دوو دەنك حەپی پێدا و دڵنیای کردەوە کە لەماوەی کەمتر لە (٢٤) کاتژمێردا بە ویستی خوا شیفای بۆ دێت و چاك دەبێتەوە!!

ئەزانن چی ڕوویدا؟! : ڕۆژی دواتر نەخۆشەکە زۆر بەرەو چاك بونەوە چوو، سەرەنجام تەواو چاك بۆوە! زۆر سوپاسی دکتۆرەکەی کرد لەسەر پێدانی ئەو دەرمانە کاریگەرە تازە سەرسوڕهێنەرە!! ئێستا دەزانن ئەو دەرمانە چی بوو؟!

دوو دەنك حەب لە (ئەسپرین)!!

بەڕاستی چاك بونەوەی نەخۆشەکە کە تەنها بەهۆی بیروباوەڕی بەهێزی بوو بەچاك بونەوە، ئەویش لە ڕێگەی ئەو دڵنیایی و بڕوا بەهێزەی کە دکتۆرەکە بەو دەرمانەی هەبوو!! {گۆڤاری متمانە، ژ: ٣٤، ل٣٥}.

## ٣- بەدوو دڵیەوە دەرمان مەخۆ:

ئەی نەخۆش هەرکات ئەو دەرمانانەت بەکارهێنا، کە دکتۆری پسپۆڕی نەخۆشی یەکەت بۆی نوسیوی، بەڕاڕایی و دوو دڵیەوە مەیانخۆ، بەڵکو بە ئەوپەڕی ئومێد بە شیفای خوا، کە خوا شیفای ئەو نەخۆشی یەتی لەو دەرمانانەدا داناوە، بیانخۆ، بسم الله بکە و کە خواردت بڵێ: خوای گەورە و میهرەبان (یاشافی) بۆم بکەیت بە شیفا. (إن شاء الله) بۆت دەبێت بە شیفا.

## ٤- بە نەزانی دەرمان هەڵمەسەنگێنە:

دیاردەیەکی نابەجێ و ناشیرین هەیە، ئەویش ئەوەیە: کە کاتێ یەکێك سەردانی نەخۆشێك دەکات، یان لە عیادە و لای دکتۆر

توشی نەخۆشێك دەبێت، سەیری دەرمانەکانی دەکات و یەکسەر دەڵێ: بەخوا ئەم دەرمانانە هیچ نین. من بەکارم هێنا هیچ لێی سودمەند نەبووم، یان فلان کەسی نەخۆشیش هەر ڕێك لەم دەرمانانەی بۆ نوسرابوو، پێی چاك نەبوو! !

بەڕاستی ئەمە هەتا بڵێی دیاردەیەکی ناشیرین و ناموسڵمانانەیە، بەبەلاش نەخۆش نائومێد دەکەی لەچاك بونەوە و لە کاریگەری ئەو دەرمانە، بەبێ ئەوەی بزانی کە نەخۆش تا نەخۆش، بەپێی جۆری تەمەن و کێشی لەش و ژینگە و نەخۆشی تری ناو لەش و، جۆری نەخۆشی لە سوکی و قورسی جیاوازی زۆریان هەیە و، مەرج نی یە ئەو دەرمانە بۆ کەسێ کاریگەری هەبوە، بۆ هەموو کەس هەر وابێ یان بە پێچەوانەوە، لەبەرئەوە خۆزگە موسڵمانان وازیان لەو ڕەفتارە درزێوە بهێنایە!



لەکۆتایی دا: بۆ بزەی لێوی نەخۆشەکانمان:

١) عیادەی پزیشکە و نەخۆش دەڵێ: دکتۆر گیان گوێم زۆر گران بووە، تەنانەت گوێم لە دەنگی کۆکەی خۆشم نی یە !

دکتۆر: باشە ئەوا حەبێکت بۆ دەنوسم، ڕۆژی سێ جار بیخۆ.

نەخۆش: جابەوە گوێم چاك دەبێتەوە؟!

دکتۆر: نەء، بەڵکو کۆکەکەت بەرزتر دەبێ و ئەو کاتە بەئاسانی گوێت لێ دەبێ!!

٢) دکتۆر بە تورەیی یەوە بە نەخۆش دەڵێ: جگەرە دەکێشی؟

نەخۆش بە دەنگێکی نزم و بە شەرمێکەوە: بەڵێ.

دکتۆر: دەبێنە جگەرەیەکم بدەرێ، خۆم جگەرەم پێ نەماوە!!

٣) ژنێك نەخۆش دەکەوێ و دەچێتە لای پزیشك، ئەویش شروبێکی بۆ دەنوسێ و پێی دەڵێ: ڕۆژی سێ جار ئەم شروبە باش بشلەقێنە و، پاشان کەوچکێکی قاوە بخۆوە. دوای هەفتەیەك ژنەکە دەچێتەوە لای هەمان دکتۆر و پێی دەڵێ: نەخۆشیەکەم هەروەکو خۆی وایە و هیچ چاك نەبومەتەوە..

دکتۆر دەڵێ: باشە تەواوی شوشە شروبەکەت خواردوە؟

نەخۆشەکە دەڵێ: نەخێر، بەڵام تۆ چۆنت پێ وتوم من وام کردوە! دکتۆر دەڵێ: تۆ چیت کردووە؟!

ژنە نەخۆشەکە دەڵێ: من سێ ژەمە شوشە شروبەکەم جوان شڵەقاندوە و پاشان چوم کەوچکێك قاوەم گرتۆتەوە و قاوەکەم خواردۆتەوە!!

٤) ئوتومبێلێك وەردەگەڕێو سەرنشینەکان - شۆفێرەکەی دەبەن بۆ نەخۆشخانە و، دکتۆر چارەسەری بۆ دەنوسێت و پێی دەڵێ: شکور سەلامەتی و بەیانی دەتوانی بچیتەماڵەوە.

بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی هەر هەمان دکتۆر دێتەوە و بە نەخۆشەکە دەڵێ: پێویستە تۆ دوو سێ ڕۆژی تر لێرە بمێنیتەوە!!

نەخۆشەکە بە سەرسوڕمانەوە دەڵێ: بۆچی دکتۆر، ئەی تۆ دوێنێ نەت گوت بەیانی دەتوانی دەربچیت و بچیتە ماڵەوە؟!

دکتۆر: بەڕاستی من نەم زانیبوو لاشەی تۆ ئەوەندە وێرانە و، ئەوەندە ئازاری پێ گەشتووە، هەتاوەکو دوێنێ کە لێرە ڕۆشتمەوە و لە مەرکەزی پۆلیس سەیارەکەم بینی، کە تۆی تێدابووی بینیم زۆر وێرانە و هەر نەماوە، ئەمجا بۆم دەرکەوت تۆ زۆر وێرانی و پێویستت بە مانەوەی زیاترە. {تەندروستی و کۆمەڵ ژ: ٤، ل٧١}.

بە ئومێدی خوای شیفای بەخش زەردەخەنە بکەوێتە سەر لێوی نەخۆشەکانمان و خوای گەورە شیفایان بدات. آمین.

## وانەی بیست و دووەم:

# ئەی نەخۆش ئاگاداربە..
# سەردانی ئەم سێ دکتۆرە بکە!

## وانەی بیست و دووەم

## بابەت: ئەی نەخۆش لەخوا غافڵ مەبە و ئاگاداربە، سەردانی ئەم سێ دکتۆرە بکە!

۞ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَتَعالى: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨﴾ الرعد.

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (ما مَلَأَ آدَمِيٌّ وِعاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ، بِحَسَبِ ابْنِ آدَمَ أَكلاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كانَ لا مَحالَةَ، فَثُلُثٌ لِطَعامِهِ وَ ثُلُثٌ لِشَرابِهِ، وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ). {رَواهُ الترمذي: (٢٣٨٠) وَقالَ: حَسَنٌ صَحيحٌ} .

### سەرچاوەکان:


١) گۆڤاری: (چرای ڕووناکی) ژ: ٥٠، ل١٢، بابەتی: (باشترین پزیشك) لە نوسینی: د.هەڵگورد فتح الله أحمد.

٢) نَظرة النَّعيم، ج٤، ص١٣٦٠.

٣) آيات الله في الإِنْسان، د.محمد راتب النّابُلسي، ص٣٦٠.

٤) لاتَحْزَن، د.عائض القَرَني، ص٣٣٣.

٥) ئەسرینەکانی سەدەی (٢٠/٢١) ئاوات أبوبكر أحمد، ل٢٥٧.

٦) زەردەخەنەی هیوا، ئەندازیار عثمان.

٧) هەزار و یەك، ئەندازیار عثمان، ب١، ل٢٣٧.

٨) گۆڤاری زانستی سەردەم، ژ: ٦١، ل١٥٢.

٩) شەیدا، د.محمد عبدالرَّحمن العریفی، و: هێمن محمد علی، ل٦٣.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين. وَالصَّلاةُ وَالسَّلام عَلى سَيِّدنا محمد وَعَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعينَ:

زۆربەی خەڵکی ئەمڕۆ بەداوی باشترین دکتۆر و، پزیشکی پسپۆڕ و بەناوبانگدا وێڵن، لەزۆربەی دانیشتنەکانی خەڵکی لەکۆڕ و مەجلیسەکاندا، بەهۆی زۆربونی نەخۆشی. کە ئەوەی لەو دانیشنەدایە یان خۆی نەخۆشیەکی هەیە، یان نەخۆشێك لەماڵیایەتی، بۆیە زۆرجار باس باسی پزیشك و دکتۆرە، وە ڕیکلامی ناو تەلەفزیۆنەکان و گۆڤار و ڕۆژنامەکانیشمان، بەشی زۆری بۆ بواری پزیشك و کردنەوەی عیادەی فلاَن و، سەنتەری پزیشکی فلاَن و، هاتنی پرۆفیسۆر فلاَن لە ولاَتێکی دەرەوە، کە پسپۆڕە لە نەخۆشیەکانی ئەوە و ئەوەدا..

لەم کاتەدا کە باسی باشترین پزیشك و دکتۆر دێتە ئاراوە، هەریەك لەلای خۆیەوە گوێڕا دەدێریٚ و هەندیٚ جار دەپرسیٚ: ئەریٚ دەبیٚ ئەو دکتۆرە بۆ نەخۆشیەکەی من چۆن بیٚ؟!

هەریەکەی نەخۆشیەکی هەیە، هەیە نەخۆشی دڵی لەگەڵە، یەکێکی تر فشاری خوێنی بەرزە، ئەوی تر چەوری خوێنیەتی، ئەمیان شەکرەیەتی و ژیانی هەراسان کردوە، کەسێکی تر گورچیلەی بەردی هەیە، ئەو نەشتەرگەری زراوی کردوە و دکتۆرەکەی دەڵیٚ هیچت نی یە و کەچی هەر ئازاری هەیە. یەکێکی

تر بەدەست قەڵەوی و ورگنیەوە دەناڵێنێ و کێشی دانابەزێ، کەسانێکیش وەکو جەستە هیچیان نی یە، بەڵام ئەودڵە خورپەیەتی و هەمیشە وا دەزانێ یەکێ بەدواوەیەتی، کەسێکی تر خەوی نەماوە و هەرچەند دەکات شەو خەوی لێ ناکەوێ، ئەوی تر قەلەق و ڕاڕایە و، ترسێك لە دڵیایەتی و دڵە کوتەی زۆری هەیە..

بە کورت و کرمانجی هەموو هەر چاوی لەوەیە، ئەو دکتۆرە باشەی کە باس دەکرێ، دەبێ بۆ نەخۆشی ئەم، یان نەخۆشی کەسێکی نزیکی بنەماڵەکەی دەست بدات و سودی هەبێ!

بەڵام لەم وانەیەدا، وەکو تەواوکەری وتارەکانی ڕابردوو لە باسی نەخۆش و نەخۆشیدا، ناونیشانی سێ دکتۆری زۆر بەناوبانگ و پسپۆڕ و بە سود بە ویستی خوا، بەتۆی بەڕێز و هەموو نەخۆشەکان دەناسێنین، کە بەڕاستی باشترین دکتۆرن و لە هەموو جیهاندا هەر لە زۆر کۆنەوە، لەدێر زەمانەوە بەناوبانگن، هەمیشەش بەپێشکەوتویی دەمێننەوە و، مرۆڤەکان بەردەوام پێویستیان پێیانە، دەبێ سەردانیان بکەن و بەگوێی بکەن و بە گوێی ڕێنماییەکانیان بکەن..

## ئەو سێ دکتۆرە زانا و شارەزا و پسپۆڕە گرنگانە کێن؟

### یەکەم: دکتۆر پارێز!

لەسەر دەرگای عەیادە ـ نۆڕینگە ـ کەی نوسراوە: (الحَمِيَّةُ رَأْسُ الدَّواءِ) واتە: پارێز سەرپشکی دەرمانەکانە، بەڕاستی ووشەیەکی جوانە، زۆربەی نەخۆشی کە توشی مرۆڤ دەبێت لە ئەنجامی زۆر خواردنیەتی، یان بەسەریەکدا کردنی جۆرەها خواردن و، دەست هەڵنەگرتن لەدوای تێربونیش، هەتا سەرەنجام ئەو خۆراکە لێی دەدا و توشی نەخۆشی دەبێت.

پێغەمبەری پێشەوا و سەروەرمان فەرموویەتی: (ما مَلَأَ آدَمِيٌّ وِعاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ، بِحَسَبِ ابْنِ آدَمَ أَكلاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كانَ لا مَحالَةَ، فَثُلُثٌ لِطَعامِهِ وَ ثُلُثٌ لِشَرابِهِ، وَثُلُثٌ لِنَفْسِهِ). رَواهُ الترمذي: (٢٣٨٠) وَقالَ: حَسَنٌ صَحيحٌ.

واتە: ئادەمی هیچ دەفرێکی پڕنەکردوە، کە خراپتر بێ لە سك و گەدە، بەڕاستی چەند پارویەك بەسە بۆئەوەی مرۆڤ بیخوات و هێز و تینی پێ وەربگرێ و خۆی بگرێ، ئەگەر هەر ناچار بوو کە بخوات و حەزی زۆری بۆ خواردن چوو، ئەوا با گەدەی بکات بە سێ بەشەوە، بەشێکی بۆ خواردن و خۆراك، بەشێکی بۆ ئاو و خواردنەوە حەڵاڵەکان، بەشێکیشی بۆ هەناسەدانی.

بەڵام بەداخەوە کەسی واهەیە، ئەوەندەی لە گەدەی کردووە و ئاوی بەسەردا کردوە، بەشی هەناسەی نەماوەتەوە و هەمیشە لرف و هوڕیەتی و قرقێنە لێ دەدات و هەناسەی توندە!!

بەڵێ پێغەمبەری ﷺ، زۆر جوان و ڕاست فەرموویەتی: هیچ شتێ نیە کە خواردنی تێ بکرێ خراپتربێ لە پڕکردنی لە گەدەی خۆت، لەبەرئەوەی ئەگەر سەلاجەی ماڵەکەت زۆر پڕکرد لە خواردن و میوە، پاشان پێت نەخورا و خراپبوو، فڕێی دەدەی و تەنها زەرەری ماڵیت لێ دەکەوێ..

ئەگەر مەتبەخ و مەخزەنی ماڵەکەت زیاد لە پێویست ڕۆن و شەکر و برنج و چا و خۆراکت تێ کرد و، پاشان بەکارت نەهێنا و بۆت نەخورا، ئەوا ماوەی بەسەردەچێ و بۆن کۆن دەبێ و دەبێ فڕێی بدەی. دەی ئەمە خراپە و گوناهە و ئیسڕافە و شەرع نەهی لێ کردوە، بەڵام لەم کاتەدا تەنها زەرەری ئەو پارە و پوڵەت لێ کەوتوە کە داوتە بەو خۆراکە و، بەدەستی خۆت فڕێت داوە و نەتدا بە هەژارێك لێی سودمەندبێت، کە هەم خۆت زەرەرت لێ نەدەکەوت و، هەم خێر و پاداشتێکت بۆ دەنوسرا.

بەڵام ئەگەر مەخزەنی گەدەت پڕکرد و زیاد لە پێویستت تێکرد، ئەوا نەك هەر زەرەری مادیت لێ دەکەوێت. بەڵکو زەرەری جەستەیشت لێ دەکەوێت و توشی جۆرەها نەخۆشی دەبیت، ئەوکاتە تۆ هاتی بەدەستی خۆت، بە پارەی خۆت، بەدەم و ددانی

خۆت، خۆتت لەناوبرد، بۆیە حەکیم و زاناکان لەکۆنەوە فەرمویانە: (**الإنْسان يَحْفُرُ قَبْرَهُ بِأَسْنانِهِ**) مرۆڤ قەبری خۆی بە ددانەکانی خۆی هەڵدەکەنێ!! واتە: چەندە مرۆڤ دەمی بجوڵێنێ و خۆراك بخوا، ئەوەندە زوتر تەمەنی تەواو دەبێت و قەبرەکەی ئامادە دەبێت بۆ پێشوازی!!

هەروەها حەکیم و زاناکان فەرموویانە: قەبرەکەت و مردنەکەت، بەنزیکی ژمارەی قایشی پانتۆڵەکەت دەبێت، قایشی پانتۆڵەکەت چەند کونی زیاتری تێدایە و درێژترە، یان بەندۆخینی شرواڵەکەت درێژترە، دیارە ورگت گەورەترە و نیشانەی ئەوەیە زۆرت خواردوە، زوتر نەخۆش دەکەویت و مردنت زیکتر دەبێتەوە!

ئەمجا ئەو کەسانەی کە لە سنور لادەدەن لەخواردندا و هەر تێی دەکەن، چەندە پارە دەدەن بە خواردن بۆ تێربونیان، دەبێ ئەوەندە، بەڵکو دەیان ئەوەندە، بدەن بە دکتۆر و دەرمان بۆ چارەسەری ئەو نەخۆشیانەی کە بەهۆی ئەو زۆر خۆری یەوە توشیان بووە:

لەکۆنەوە لەناو زانستی پزیشکی و زانستی خۆراکدا ئەم قسەیە بەناوبانگە کە دەلێ: (**أَنَّ عُشْرَ ما نَأْكُلُهُ يَكْفي لِبَقائِنا أَحْياءً، وَ إِنَّ تِسْعَةَ أَعْشارِ ما نَأْكُلُهُ يَكْفي لِبَقاءِ الأَطِبّاءِ أَحْياءً**).

واتە: یەك لەسەر دەی (١/١٠)ی ئەوەی دەیخۆین، بەسە بۆئەوەی بە ژیانێکی تەندروست و جەستەیەکی ساغەوە بژین، وە

نۆ لەسەر دەی (٩/١٠)ی ئەوەی تر کە خواردومانە بەسە بۆ ئەوەی دکتۆر و پزیشکەکان بە دەوڵەمەندی بژین و بێ کار نەبن! !

لەبەرئەوە: ئاگاداری تەندروستیت بە، پێویستە هەموو کەس ئەو ڕاستی یە بزانێت کە:

بەڕاستی تەندروستیت زۆر گەورەترە لە سەروەت و سامانەکەت، لەبەرئەوە چەندە لە خەمی پارێزگاری لە سەروەت و سامان و پارە و پوڵەکەتی، زۆر لەوە زیاتر ئاگادار و چاودێربە بەسەر پاراستنی تەندروستی جەستە و دەروونتدا، بەڕاستی خەزێنەو سامانی هەرە گەورە لەش ساغی یە، دەی بیپارێزە، بۆئەوەی ژیانێکی بەختەوەر بەسەربەریت.

بەڕاستی جێگای تێڕامان و سەرسوڕمانە کە ئەو خەڵکە دەبینی، کە چۆن تەواوی گەنجی و تەمەنی جوانی و لاوی و لەش ساغی و هێز و گوڕیان دەبەخشن، بۆئەوەی کە سەروەت و سامانێك بەدەست بهێنن، بەڵام دواتر هەموو ماڵ و سامان و دارایییەکەیان، بە هەردوو دەست و بە مەمنونیەوە دەبەخشن بە دکتۆر و دەرمان، بۆ گێڕانەوەی تەندروستی و لەش ساغی یەکەی گەنجیان! ! لەبەرئەوە خواردنی حەڵاڵ و پاك بخۆ و کاروکردەوەی جوان بکە، زیادە ڕەوی مەکە لە خواردندا و بەزۆر خۆری خۆت لەناو مەبە، با کاتی نان خواردنت دیاربێ و ژەم و دەمت دیاریکراو بێ، خۆت بپارێزە لە زۆر خواردنی چەوری و شیرینی، بە ئەندازەی ئەوە

نەبێت کە جەستەت پێویستی پێ یەتی. هەولّبدە زۆرتر سەوزە و میوەی تازە و پاك و خاوێن و خۆماڵی بخۆیت، خۆت بپارێزە لە زۆر خواردنی گۆشت، ئەوەندە گۆشت بخۆ کە جەستەت پێویستی پێ یەتی، نەك لاشەت نەتوانێ خۆی لێ ڕزگار بکات. وە بشزانە چەندە خواردن سادە و ساکاربێ و سەوزە و میوەی زۆرتربێ و چەوری و گۆشتی کەمتربێ بەسودترە ! !

حەکیم و زاناکان وتویانە: (**الإقْلالُ مِنَ الضّارِ، خَيْرٌ مِنَ الإكْثارِ مِنَ النّافِعِ**). کەمتر بەکارهێنانی ئەو شتەی زیانی هەیە ـ وەکو خواردنی چەوری و شیرینی، چاکتر و بەسودترە لەوەی کە شتی بەسود و بەکەڵك زۆر بەکاربهێنی.

وتراوە: (**إسْتَديمُوا الصَّحَةَ بِتَرْكِ التَّكاسُلِ عَنِ التَّعَبِ، وَ بِتَرْكِ الإمْتِلاءِ مِنَ الطَّعامِ وَالشَّرابِ**). درێژە بە تەندروستی و لەش ساغیتان بدەن بەوەی کە خۆتان بەدوربگرن لە تەمەڵی و دانیشتن و کارنەکردن و نەجولاّن، وە بە وازهێنان لە ورگ پڕکردن لە خواردن و خواردنەوە ! {لاتَحْزَن، د.عائض القَرَني، ص٣٣٣} .



## دووەم: دکتۆر ئاسودە!

ئاگاداربە، مەبەست لە دکتۆر ئاسودە، دکتۆرەیەکی ئافرەت نیە ناوی (ئاسودە) بێت!! بەڵکو مەبەستمان ئاسودەیی دڵ و دەرونە. لەسەر نۆڕینگە (عیادە)ی ئەم پزیشکە ئەم ئایەتە موبارەکەی قورئان نوسراوە: ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾. واتە: بەیادی خوا دڵەکان ئاسودە و دڵنیا دەبن..

بەڵێ نۆڕینگەی ئەم پزیشکە ناودارە لەناو دڵتە، باشترین پزیشك بۆ دڵەڕاوکێ و دڵتەنگی و نەخۆشی دەرونی، کە ئەمڕۆ تەنگژەی جیهانیانە، تەنانەت نەخۆشی لاشەیش هاوکات دەرون تێکئالآن لەگەڵ خۆی دێنێ، هەموو خولەکێ ناچاری سەردانی بکەیت و یادی خوا بکەیت گرنگیشە گوێڕایەڵی بیت.

هەوڵبدە دڵ و دەرونت ئاسودەبێت، ئەویش بەوەی کە: ستەمت لە کەس نەکردبێت، مافی کەست نەخواردبێت، چاڵت بۆ کەس هەڵنەکەندبێ، بە زمانت کەست توشی گرتن و ئەشکەنجەدان نەکردبێت، بەهۆی تۆوە ژن و مێردێك لەیەکتر جیانەبوبنەوە و خێزانێك هەڵنەوەشابێ و، منالآنێکی بێتاوان سەرگەردان نەبوبن و فیتنەیەك ڕووی نەدابێ!

بەڕۆژ کاروگوفتارێکی وا بکە و بڵێ کە کاتێ شەو چویتە سەر جێگای خەوتن، بە دڵێکی سەلامەت و دەرونێکی ئاسودە و ویژدانێکی ئارامەوە سەربخەیتە سەرجێگای خەوەکەت و، بەدەم

شایەتمان و یاد و زیکری خواوە بخەویت، ئەمجا سەیرکە چۆن بەیانی بە لاشەیەکی ئاسودەوە لەخەو هەڵدەستی و، هەموو لاشەت لەڕێی دەم و چاوی گەشتەوە خۆشحاڵی لێ دەبارێ بەلاَم: دڵی پڕ لە گومان و سینەی پڕ لە کینە و، ڕق و حەسودی و کردەوەی بەد و ستەمکارانە، هەمیشە سینە و دڵت دەگوشێ و ناهێڵێ هەناسەیەکی خۆش هەڵمژی، هەمیشە ئەگەر بەڕواڵەت لە خۆشی و خانوی کۆشك و جێگای نەرم و، خواردنی گەرم سود وەربگری، بەلاَم لە دەرونتا دیلی و زیندانی کراوی و ئەگەر دڵیش خۆش نەبوو، جەستە سەلامەت نابێ، لەبەرئەوەی: (جەستە بەرهەمی دەروونە) !

## دڵ تەنها بە یادی خوای گەورە ئاسودە دەبێت

دکتۆر محمد عبدالرَّحمن العریفی دەفەرمووێ: برادەرێکی موسڵمان چوو بۆ بەریتانیا بۆ چارەسەری نەخۆشی، دکتۆرەکە پێی وت: موسڵمانیت؟ وتی: بەڵێ، وتی: باشە پرسیارێکت لێدەکەم لە زۆر کەسی تریشم کردووە، نەگەشتومەتە وەلاَمێکی تەواو، وتی: فەرموو.

وتی: وەك دەبینی من دکتۆرێکی ناودارم و، هەموو توانایەکی ماددی و مەعنەویم هەیە و، هەرچی گەڕان و خۆشی هەیە دەیکەم و دەیبینم و کەچی دڵم خۆش نیە و بەختەوەر نیم!

نەخۆشەکە موسڵمانەش پێی دەڵێ: باشە دکتۆر تۆ ئەگەر بتەوێ چاوت ڕوون بێتەوە، چی دەکەیت؟!

وتی: سەیری گوڵ و شتی جوان دەکەم.

وتی: ئەی ئەگەر بتەوێ گوێت ئاسودە بێت چی دەکەی؟

دکتۆر: گوێ لە شتی خۆش دەگرم.

وتی: ئەی ئەگەر بتەوێ لوتت ئاسودە بکەی؟

دکتۆر: بۆنی شتی خۆش دەکەم.

وتی: دەی باشە ئەگەر وویستت چاوت ئاسودە بکەی، دەکرێ بۆن بکەیت؟!

وتی: نەخێر.

نەخۆشە موسڵمانەکە وتی: باشە دکتۆر ئەگەر وویستت گوێت ئاسودە بکەیت، کێك بخۆیت ئاسودە دەبێت؟!

دکتۆر: نەخێر، خواردن بۆ ناو دەم و گەدە و تێرییە.

وتی: دەی تۆش پێویستت بە ئاسودەیی دڵتە و، ئەچی گوێ و چاو و لوتت ئاسودە دەکەیت؟! ئەگەر دەتەوێت بەڕاستی دڵت ئاسودەبێت، تەنها بەیادی خوا ئەوەت دەست دەکەوێت: ﴿أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ﴾ الرَّعد: ٢٨. سوپاس بۆ خوا پاش دیراسە و خوێندنەوەی چەند پەڕاوێك دکتۆرەکە موسڵمان بوو.
{هەزار و یەك، ئەندازیار عثمان ب١، ل٢٣٧}.

## بەقەناعەت و ڕازی بوون بە بەشی خودا، ئاسودە دەبیت!

دکتۆر محمد راتب نابلوسی دەفەرموویت: لە شام دەوڵەمەندێکم بینی کە زۆر دەوڵەمەند بوو، دەیوت: کەی ئەمە ژیانە و لێرە ژیانی تیانەماوە و کاروکاسپی وەك پێویست نیە، لەگەڵ ئەوەدا کە ملیۆنەر بوو! چاوی بەهیچ پڕ نەدەبۆوە، هەستی بەو هەموو خەڵاتەی خوا نەدەکرد لەسەری.. کاتێ نەخۆش کەوت سەردانم کرد، وتی: یا شێخ بەخوا مرۆڤ نانی شەوی نەبێت و بەس لەشی ساغ بێت! یا شێخ بەڕاستی پیاو ئەوەندەی هەبێ، موحتاجی دەستی خەڵکی نەبێت بەسیەتی، وتم: سبحان الله ئێستا تێی ئەگات. {هەزار و یەك، ئەندازیار عثمان ب١، ل٢٢٧}.

## مێشکت ئاسودە بکە، خوای گەورە شیفای جەستەت دەدات

**بەسەرهاتێك:** دکتۆر ئیبراهیم فەقێ، باسی ئەزمونێکی خۆی دەکات و دەڵێت: توشی ژانە سەرێك بووم، خەریك بوو لەتاو ئازار سەری خۆم بدەم بەدار و بەردا، لە کەنەدا چوومە لای پزیشك، ئەویش بەبێ پشکنین لەکۆڵ خۆی کردمەوە و حەبی ئازاری بۆ نوسیم، بە مەرجێ لەو وولاتە هەر پزیشکێ بێ پشکنینی تەواو،

دەنکێ حەب بۆ کەسێ بنوسێت، بڕوانامەکەی لێدەسەنرێتەوە! (کت و مت وەك کوردستانی خۆمان)!!

چومە لای پزیشکێکی تر و پشکنینی تەواوی بۆ کردم و، ئەشیعەی سیتی سکانی بۆ گرتم، دەرکەوت کە جەڵتەی دەماغم توش بووە و حاڵەتەکەم زۆر مەترسیدارە. شەش ڕۆژ لەژووری چاودێریدا مامەوە و زۆر بێ تاقەت بووم، کە نەئەبوایە لە شوێنی خۆم بجوڵێم! لە نەخۆشخانە منالێك هات بۆ لام کە وەرەم لە سەریدا هەبوو، بۆ سبەینێ نەشتەرگەری بۆ دەکرا، کە بەو حاڵەوە بینیمی وتی: بۆ بێتاقەتی مەگەر تۆ دیاری وەرناگریت؟

وتم: دیاری چی؟!

وتی: یادی خوایی، ئەوەتا من توشی شێرپەنجەی دەماخ بووم و، سبەینێش نەشتەرگەریم بۆ دەکرێت، ڕێژەی سەرکەوتنی نەشتەرگەریەکەشم لە سەدا یەکە و زۆر دڵخۆشیشم بە دیاریەکەی خوا!! ئەو قسانەی ئەو منالە تەزویەکی هێنا بە گیانمدا، لە تەوقە سەرمەوە تا بینی پێم، هەرچەندە بۆ سبەینێ ئەو منالە مرد!

بەلآم وانەیەکی گەورەی دا بەمن و بە هەزارانی وەك من. بە خۆمدا چوومەوە و بەڕاستی پشتم بە خوا بەست و، بە هیوا و هیمەتێکی نوێوە سەیری نەخۆشیەکەمم کرد، وتم: ئەو ڕۆبەم بدەنێ ئەچم دەستنوێژ دەشۆم، دکتۆر وتی: دەست نوێژی چی؟! تۆ حاڵت خەتەرە و نابێ بجوڵێی ئەگینا دەمریت، وتم: ئەی دکتۆر

بۆچی تۆ نامریت؟! دەست نوێژم شت و بەڕاستی ڕومکردە خوا، خوای گەورەش شیفای دام و ئەو پەڵە خوێنەی لە سەرما بوو، لە دوو سانتیمەترەوە بوو بە نیو سانتیمەتر، بەڕاستی ئێمە دەچینە لای دکتۆر و دەرمان و عیلاج وەدەگرین، بەڵام نابێ بیرمان بچێت کە تەنها خوا خۆی شیفا بەخشە.. {زەردەخەنەی هیوا، ئەندازیار عثمان}.

**ئاسودەیی دەروون، تەسلیم بونە بەکارەکانی خوا!**

ئاسودەیی دڵ و دەروون، بە تەسلیم بونە بەوەی کە هەموو کارەکانی خوای کاربەجێ، بەجێیە و، مرۆڤی موسڵمان نابێ هەرگیز گومانی خراپ بەدڵیدا بێت بەرامبەر بە کاری خوای گەورە، جا ئەگەر مرۆڤ پاك بێ و خواناس بێ و، جارێ لە جاران ئەمەی لێ بەسەر بێ و، گەردێك لەسەر دەروونی ئاسودەی بنیشێ، خوای پەروەردگار بەبەزەیی شتێکی نیشان دەدات و ئەو کات دەگەڕێتەوە، بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی ئەم باسە، سەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەن:

گێڕەوەی چیرۆکەکەمان دەڵێ: ئێستاش ئەو دیمەنە لەبەرچاومە، چەندین جار بۆیان باس کردبووم و تاڕادەیەك بڕوام نەدەکرد، تا ڕۆژێکیان لەگەڵ چەند کەسێکدا بەلای ئەو بەردەدا تێپەڕین و بەچاوی خۆم ئەو دیمەنە جوانەم بینی، (شارە مێرولەیەك لەسەر بەردێکی گەورە هەبوو، مێرولەکان دەهاتنە

دەرەوە و دەچوونەوە ژورەوە، ئەوەی زۆر سەرسامی کردم، ئەم گا بەردە گەورەیە لەناو چەمێکی پڕ ئاودا بوو، کە ئەو ئاوە لە سنوری خۆرهەڵاتەوە ئەهات و دەگەیشتە قەڵاچۆلان، ئەم چەمەش سنوری نێوان (بناویلە و شێراویژە)بوو، ئای خودایە ئەم مێرولانە چۆن خۆراك پەیدا دەکەن، خۆناتوانن بێنە وشکانی!! زۆر سەیرە چۆن ئەژین؟!)

یەکێك لە هاوڕێکانم وتی: خوای گەورە دەیان ژێنێت.

وتم: ئاخر چۆن؟!

وتی: سەری بیّ ڕۆزی لەژێر خاکدایە.

ئەو هاوڕێیەم وتی: ڕۆژێك پیاوێك بەلای ئەم شارە مێرولەیەدا تێئەپەڕێت و ئەڵێت: بەخوا گوناهن، دەچێت دار چنارێکی گەورە دەبڕێت و، لەمسەرەوە دایدەنێت کە وشکانیە و سەرەکەی تری دەخاتە سەر گابەردەکە، تا مێرولەکان بە ئاسانی بێنە وشکانی. کاتێك ئەگاتەوە ماڵەوە، چاوەکانی وردە وردە لێلّ ئەبێت و نابینا ئەبێت! خێزان و خزمانی زۆریان پیّ ناخۆش دەبێت.. تاوەکو ڕۆژێکیان کە میوانی زۆریان دەبێت و هاتوون بۆ هەواڵ پرسی، لێی ئەپرسن: هۆکاری کوێربونەکەت نازانی چیە؟

ئەویش هەرچەندە بیر ئەکاتەوە نازانیّ چی یە و چی کردووە؟! پاش چەند خولەکێك دێت بە خەیاڵیدا: ڕۆژێکیان بەلای شارە مێرولەیەکدا تێپەڕیم کە لەناو بەردێکدا بون و، ئەو بەردەش لەناو

چەمێکی پڕ ئاودابوو، منیش دار چنارێکی درێژم دوای بڕینی هەڵپاچی و سەرێکی بۆ سەر بەردەکە و سەرەکەی تری بۆ سەر ووشکانی، تابەئاسانی بێنە وشکانی و خۆراك کۆبکەنەوە.

ڕیش سپی دێیەکە دەڵێت: خوا ڕازیقە، بۆ دەستکاری ئیشی خوا ئەکەیت، بچن ئەو دارە لابەرن، چاوەکانت چاك ئەبێتەوە!! سبحان الله چون دار چنارەکەیان لابرد، پیاوەکە چاوەکانی چاك بونەوە.. {ئەسرینەکانی سەدەی ٢١/٢٠، ئاوات أبو بکر ل٢٥٧}.



## سێهەم: دکتۆر ئارامی ولەسەرخۆیی

پزیشك و دکتۆری بەناوبانگ، دکتۆر ئارامی و لەسەرخۆیی، بەڕاستی پزیشکێکی نایابە، دەی ئاگاداری کردارەکانت بە، ئارام بە، هێواش بە، زوو هەڵمەچۆ وەکو مەنجەڵی نیسك، وەکو شێر بە تۆزێ گەرم بوون لەخۆت مەچۆرە دەرەوە، سەرە ڕۆ مەبە، بەدیهێنەری مرۆڤەکان فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ عَجُولاً ١١﴾ الإسرى. مرۆڤ هەمیشە پەلە پەلیەتی و، ئارام نی یە.

نۆرینگە (عیادە)ی ئەم دکتۆرە، لەسەر شەش ملیۆن خڕۆکەی سورە لە هەر مللیلیترێك لەخوێنت، بەڵام دوژمنێکی هەیە دەری دەکات. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**الشَّيطانُ يَجْري في ابنِ آدَمَ مَجْرى الدَّمِ**) واتە: شەیتانی نەفرینلێکراو لەناو لاشەی

نەوەی ئادەم دەسوڕێتەوە، وەکو سوڕانەوەی خوێن، بۆیە دەبێ گشت خڕۆکە سورەکانت بە چەکی ئارامی پڕ بکەیت، ئەینا شەیتان سواری سەر و ملیان دەبێ، دڵە خورپە، پەلە پەل، دەیان هەڵەت پێ دەکات. ئەم پزیشکە خۆی دێت بۆ لات لەگەڵ هەر خڕۆکە سورێك، هەر چرکەیەك (١٠)جار خواردن و ئۆکسجین و ئارامی بۆ هەموو خانەکانی لەشت دەگوازێتەوە، بەڵام ئاگاداربە شەیتانی نەفرەت لێکراو پزیشکە فریاگوزارەکەی فریێ نەدابێتە خوارەوە.

بەڵێ، زۆربەی نەخۆشی ئەمڕۆ هی کەم ئارامی و توڕە بوون و عەصەبی بونە، زاناکانی بواری پزیشکی دەڵێن: (**إنَّ الشِّدَةَ النَّفْسِيَّة وَراءَ أَكْثَرِ الأَمْراضِ**). توڕەبون و کەم چیکڵدانەیی و هەڵچون، لە پشت زۆربەی نەخۆشیەکانەوەیە.

**ئەگەر لە ژیانی ڕۆژانەتدا، بارودۆخێکت بەدڵ نەبوو، چاو لە پێغەمبەر ﷺ بکە:**

پێغەمبەری خۆشەویستمان ڕۆژێکیان دوای گەڕانەوەی لە مزگەوت بۆ ماڵەوە، کە عادەتی وابوو، لەدوای نوێژی بەیانی لە مزگەوت دەمایەوە هەتاکو نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد و، ئەمجا دەهاتەوە ماڵەوە بۆ خواردنی نانی بەیانی، ڕۆژێکیان هاتە ئەو ماڵەی کە ئەو شەوە نۆرەی مانەوەی لای ئەو بوو، فەرمووی:

چیمان هەیە ئەم بەیانی یە بیخۆین؟! خێزانی بەڕێزی عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەخوا هیچ خواردنیێ لە ماڵماندا نی یە!!

جا بەڕاستی نانی بەیانیان بەتامترین و خۆشترین نان و خۆراکە و، زانایانی پزیشکیش دەڵێن: خواردنی نانی بەیانی سودێکی یەگجار زۆری بۆ مرۆڤ هەیە و، هەتا بگونجێ مرۆڤ نانی بەیانیان بخوا و، لە کاتێکی زوشدا بیخوات بەسودترە، چونکە لە دەوروبەری هەتاو کەوتندا جەستەی مرۆڤ خۆی ئامادەکردووە بۆ وەرگرتنی خۆراك و وزەی پێویست بۆ کاروچالاکی ئەو ڕۆژەی، جا ئەگەر مرۆڤ نانی نەخوارد یان درەنگ خواردی، جەستە نائومێد دەبێت و لەو سود و کەڵکەی نانخواردنی بەیانی بێبەش دەبێت!

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ ماڵی خێزانێکی تر و داوای نانی بەیانی کرد، بەڵام ئەوانیش عەرزیان کرد کە هیچ خۆراکیێ لە ماڵیاندا نی یە!! بەم شێوەیە تەواوی ماڵە بەڕێزەکانی کرد و، هەمان وەڵامی وەرگرتەوە!!

{میللەتی کوردی موسڵمانمان، لە گرانیە سامناکەکەی ساڵی نەوەدەکاندا ئەوەی بەچاوی خۆی بینی، چەندین ماڵ هەبوە بەیانی کە ڕۆژی کردۆتەوە، هەرچی خۆراك بێ و مرۆڤ بیخوات لە ماڵیا نەبووە، چەندین ماڵ هەبوو کە خێزانیان زۆربوو، بە نۆرە نانیان دەخوارد، ئەوەی نیوەڕۆ نانی بخواردایە، دەبوایە ئێوارە

هیچی نەخواردایە. بۆئەوەی نانەکەیان بەشی هەموان بکات و لە مردن ڕزگارین! ! خوایە ڕەحممان پێ بکەی و نەیبینینەوە ! } .

بەڵێ پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ لەم کاتەدا، بەم برسیەتیە، خەمی خۆی و خەمی ئەو هەموو خێزانە برسی یەی لەسەر شانە. بەلاّم لە جیاتی تورەبون و لەدەست دانی ئارامی و هێمنی و ناڕازی بوون و وتنی: کەی ئەمە حالّ و گوزەرانە؟

بەڕوپەکی خۆشەوە، بەیەك دێڕ ووشەی گرانتر و پڕشنگدارتر لە گەوهەر و ئالّتون ئەم خەمەی ڕەواندەوە و فەرمووی: (إِذاً إِنِّي صائِمٌ) دەی مادام هیچمان نی یە و، منیش لەدوای بانگی بەیانی یەوە هیچم نەخواردوە و نەخواردۆتەوە، وانیەتی ڕۆژوم لێ هێنا و ئەوا من بەڕۆژووم.

بەڵێ، بەوەی کە بەڕۆژووە و چاوەڕێی پاداشتی خوایی یە، زۆر لە ئازاری برسی یەتی و خەمی هەژاریەکەی لەسەر لاچوو! !

جارێکی تریان پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ چوە مالّی (أُمُّ هاني کچی أبو طالب)، فەرمووی: ئەرێ چیتان هەیە؟ برسیمە.. ئەویش عەرزی کرد، ڕۆحمان و مالّمان فیدات بێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەخوا تەنها چەند پارچە نانێکی ڕەقمان هەیە (نانی جۆ ڕەش بوە و ووشك بۆتەوە و ددان نایبڕێ!).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیهێنە و جامێ ئاویشم بۆ بێنە لەگەلّ تۆزێ خوێ، ئەویش هێنای و، سەروەرمان لەتە نانە ڕەقە

ووشکەکەی خستە ناو ئاوەکەوە و، تۆزێ خوێی بەسەردا کرد و، ئەمجا نانەکە خوسایەوە لەم کاتەدا (أُمُّ هاني) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆزێ سرکەشمان هەیە ئەگەر دەیکەی بە پێخۆر و نانەکەی پێوە دەخۆی! پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە شادمانی و ڕووخۆشی یەوە فەرمووی: (**نِعْمَ الأُدامُ الخَلُّ**) بەڕاستی سرکە چاکترین پێخۆرە.

بەڵێ بەم قەناعەت و ڕازی بوون بەوەی کە هەیە و، لە دەست نەدانی ئارامی و هێمنی، بەو تۆزە نان و سرکەیە، خۆشترین ژەمی بەڕێ کردووە! چونکە بە دڵی خۆش و ئارامەوە خواردویەتی جەستەشی زۆر پێی تەندروست بووە.

بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ کەسانێك هەن، کە ئەگەر تەنها یەك ژەم خواردنەکەیان بە دڵ نەبێت، دەیکەن بە شەڕ و هەرا و جار هەبوە گەشتۆتە ڕادەی لەیەك جیابونەوەی ژن و مێرد و تەڵاق دان!! کە ئەمەش جگە لە شێوانی خێزان و پەیوەندی کۆمەڵایەتی، چەندین جۆری نەخۆشی و تێکچونی جەستە و دەرونی بۆ ئەو مرۆڤە توڕە و توندانە بەدواوەیە!



**لەکۆتاییدا بزانە:** ئەگەر ئەم سێ پزیشك و دکتۆرە نەناسی و لێیان سودمەند نەبی، ئەوا خۆشی ژیانت لێ تاڵ دەبێ و، کەسانی دەورو پشتیشت لەگەڵ خۆت گرفتار دەکەی.

بشزانە: ئەم سێ دکتۆرە هەرسێکیان بە پارە (هەستیاری ـ حەساسیة)یان هەیە، بە دەوڵەمەندی بە دەست نایەن، بەڵکو تەنها بەڕازی بون بەو بەشەی کە خودا پێی بەخشیوی دێتە دی، جا چ کەم بێ چ زۆر..

وە نەشڵێی لاشەی خۆمە، گوێی پێ نادەم، خۆم ئازاری پێ دەکێشم، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت: (**إِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا**). بەڕاستی لاشەی خۆت مافی هەیە بەسەرتەوە. پێویستە مافی جەستەشت بدەی، کە گەورەترین خەلاّتی خوا ـ لەدوای دین و ئیمان ـ جەستە و لاشەی تەنژدروستە، ئاگاداری بکەی و بیپارێزی.

## سەردانی نەخۆش و کاریگەری لەسەر نەخۆش

زانایانی دەروونی و پزیشکی جەستەیی دەڵێن: چەندە خێزانەکەت و هاورێ و دۆستە خۆشەویستەکانت ببینی و سەردانیان بکەیت، ئەوا بە گوێرەی ئەو سەردان و بینینە، کاریگەری زۆر گرنگ و پۆزەتیف لەسەر تەندروستیت دەبێت.. پزیشکەکان ئاشکرایان کردوە، هەندێ کات تەنیایی بۆ مێشك خراپە، سەر دەکێشێت بۆ کێشەکانی تەندروستی مێشك، وەك بێزاری، دروست بونی فشار، نیگەران بون و لەدەستدانی متمانە بەخۆبوون.. هەروەها بەتوێژینەوە سەلمێنراوە کە گۆشەگیری

هۆکارێکە بۆ زیادبوونی مەترسی تەندروستی و نەخۆشی جەستەیی. پزیشکەکان ئاشکرایان کردوە گۆشەگیری دەکرێ ببێتە هۆکاری دروست بوونی هەندێ نەخۆشی و، کەسەکان زوتر توشی نەخۆشی ببن بەهۆیەوە. لەوانەشە ببێتە هۆی مردنیان!



## تەنیای بەرەوە مردنت دەبات!

ساڵی (٢٠٠٦) لە توێژینەوەیەکدا کە لەسەر (٢٨٠٠) ژن ئەنجام درا، هەموویان شێرپەنجەی مەمکیان هەبوو، ئەوەیان خستە ڕوو، ئەوانەی زیاتر سەردانی هاوڕێ و خێزانەکانیان کردوە، ئەگەری ئەوە هەبووە نەخۆشیەکانیان نەمێنێت و بیپەڕێنن و کاریگەری لەسەر تەندروستیان هەبووە.

توێژینەوەکان باوەڕیان وایە کە تەنیایی، جەستە بەرەو نەخۆشی و مردن دەبات. دەرون ناسەکان لە زانکۆی شیکاگۆ و ئۆیا، ئاشکرایان کرد ئەو کەسانەی کە گۆشەگیرن لە کۆمەڵگادا گۆڕانکاریان لە سیستەمی بەرگری لەشیاندا گەشەدەکات. کە ئەمەش سەر دەکێشێ بۆ نەخۆشیەك کە پێی دەوترێ هەوکردنی درێژخایەن.. ماوەیەکی کەمی هەوکردن بۆ مرۆڤ پێویستە بۆ چارەسەرکردن، دوای برینێك یان کوتانێك. بەڵام ئەگەر هەوکردنەکە هەر بەردەوام بوو وە بۆماوەیەکی زۆرتر درێژەی

کێشا، ئەوا دەبێتە ڕێگا خۆشکەرێك بۆ نەخۆشی دڵ و پەیدابونی نەخۆشی شێرپەنجە.

لە زانکۆی شیکاگۆ، زانایان ئاشکرایان کردووە کە: کەسانی تەنیا و گۆشەگیر، زیاتر توشی فشار و ماندووبوون و بێزاری دەبنەوە لەکاری ڕۆژانەدا، بەبەراورد لەگەڵ ئەوانەی کە گۆشەگیر نین لە کۆمەڵگادا.. هۆرمۆنی کۆتیسلێ، هۆرمۆنێکە کاتێك مرۆڤ توشی فشار و پەستان دەبێتەوە، لە ناوچەیەکی فراوانی ناو لەشی کەسانی تەندروستدا لە بەیانیان و لە ئێواراندا دروست دەبێت و، دواتر ڕزگاریان دەبێت لێی. بەڵام لای کەسانی گۆشەگیر بە پێچەوانەوەیە، زاناکان پێیان وایە مانەوەی زیاتری هۆرمۆنی زۆر دەبێتە هۆی هەوکردن و نەخۆشی.

تازەترین توێژینەوەش لە زانکۆی: (ئۆهایۆ) تەماشای ئاستەکانی هەوکردنیان لە دەرەنجامی کاردانەوەی پەستان لە کەسانی تەنیادا، ئەویش لەسەر دەستی (د.لیزا جارکێما) کە ئەو ژنانەی کە توشی شێرپەنجەی مەمك بوبوون، لەگەڵ ژمارەیەك کەسی خۆبەخش کە تەندروستیان باش بوو بەراوردی کردن، ئەم زانایە تاقیکردنەوەی فشاری زۆر بەناوبانگی بەبەشداربوان ئەنجامدا، بەم تاقیکردنەوەیە دەوترێ: (تاقیکردنەوەی فشاری کۆمەڵایەتی)، تێیدا پێویست بوو ئەوان قسەیەکی بێ بیر لێکردنەوە بڵێن و شی بکەنەوە، کە ئایا بۆچی ئەوان باشترین پاڵێوراون بۆ

ئەزموونەکە؟ لەپێش کۆمەڵێك خەڵکی بێ هەست و ڕووگرژدا؟!
(د.لیزا) وتی: ئێمە پێویستمان بە دۆزینەوەی ڕێگاکانە بۆ یارمەتیدانی کەسانی گۆشەگیر، بەداخەوە ناتوانین بەهیچ کەسێك بڵێین بڕۆ بۆ دەرەوە و، کەسێك بدۆزەرەوە تۆی خۆشبوێت و ڕزگارت بێت لەم گۆشەگیریە..

پاشان لە تاقیکردنەوەکەدا پێویست بوو ئەوان، کارێکی بیرکاریانە و ژماریانە ئەنجام بدەن لە پێش چاوی هەمان گروپ، تاقیکردنەوە تەنیاییەکان و نمونەی خوێنی کە بۆ هەردوو گروپەکە کرابوو، ئاشکرای کرد کە: کەسانی تەنیا و گۆشەگیر، ئاستی هەوکردنیان زۆربەرزتر بوو لە کەسانی کۆمەڵایەتی.

(د.جارکێما) وتی: ئەگەر تۆ تەنیایت، ئەوا هەوکردنەکەت بێ گوێدانە ئەوەی نەخۆشی درێژخایەنت هەبێت، بەرزتر دەبێتەوە، بۆیە پێویستە پزیشك گرنگی تەنیایی لە ڕووی پزیشکیەوە بزانێت، ئەو کات دەزانێت چەندێك گرنگە تێگەیشتن لە جیهانی کۆمەڵایەتی نەخۆش.

لەمڕۆشدا بەرزبونەوەی ژمارەی کەسانی گۆشەگیر لە جیهاندا لە ئارادایە، زۆربەی ئەوانەش پیر و بەتەمەنەکانن، کە بەجێ هێڵراون لەلایەنی هاوسەرەکانیانەوە کە مردوون، یان جیابونەتەوە، یان ڕەنگە خێزانەکانیان نیشتەجێی شوێنی دیکە بن، دەست و دەمیان بەیەك ناگات. نیوە بەرەوسەرەوە لە کەسانی تەمەن (٧٥)ساڵی لە

بەریتانیا بە تەنیا دەژین! یەك لەسەر دە ئازار دەچێژن بەدەست تەنیاییەکی زۆر بەتین و بەهێز و ئازاراویەوە، هەر ئەو پزیشکە وتی: تەنیایی مانای ئەوە نی یە کە کەسێك هەستی پەیوەندی نەبێت، یان حەزی لێی نیە، تەنیایی بە جەستە نیە، بەڵکو دەکرێ دەوروبەری پڕ لە خەڵك بێت، بەلاَم ناخی تەنیا بێت.

ئێمە پێویستمان بە دۆزینەوەی ڕێگاکانە بۆ یارمەتیدانی کەسانی تەنیا، بەداخەوە ناتوانین بەهیچ کەسێك بڵێین برۆ بۆ دەرەوە و کەسێك بدۆزەرەوە تۆی خۆشبوێت، ئێمە پێویستمان بە بنیات نانی تۆڕی پشتیوانی و پشتگیریە بۆ کەسانی تەنیا و گۆشەگیر. {زانستی سەردەم، ژ: ٦١ ل١٥٢} .

بەڵێ ئاینی ئیسلام بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤ لە تەنهایی جەستەیی و دەروونی، کردویەتی بە سوننەتێکی گەورە و، پێویستی ناو موسڵمانان کە لەکاتی نەخۆشی دا سەردانی یەکتری بکەن و، دوعای خێر و دڵنەوایی بۆ یەکتر بکەن.

## نەریتە شەرعیەکانی سەردانی نەخۆش:

١) ڕەچاو کردنی داب و نەریتی سەردان کردن، وەك لەسەرخۆ لەدەرگادان و ناوهێنانی خۆت بە ئاشکرا، پاراستنی چاو لە سەیر کردنی ئەملا و لا، هەندێك جار نەخۆشەکە جەستەی بەدەر دەکەوێت، یاخود شتێکی نەخوازراو لە نەخۆشەکە ڕوودەدات. پێویست ناکات کە ئەو کەسەی سەردانی نەخۆشەکەی کردوە، ئاوڕی بەلادا بداتەوە و تەماشای بکات.

٢) سەردان کردنی نەخۆش لەکاتی گونجاودا، نەك لەکاتی بەیانی زوو، یان شەوی درەنگ و نیوەڕواندا.

٣) بردنی دیاریەك لەگەڵ خۆت کە نەخۆشەکە خۆشحاڵ بکات. خۆزگە دیاریەکە شتێك بێت کە نەخۆشەکە خۆشحاڵ بکات و، پێویستیەکی پڕ بکاتەوە و لێی سودمەندبێت. کە دەکرێ دیاریەکە کتێب یان گۆڤاری بەسود بێت، یاخود شیرینی یان میوە، یان خواردنێك کە نەخۆشەکە حەزی لێ بکات. بەلاَم هەندێ جار دەبینین کە چەپکە گوڵ بۆلای نەخۆش دەبرێت، کە زیادە ڕەویە و نەخۆش سودی لێ نابینێت. بەڵکو هەندێ لە مێژوو نوسان دەڵێن: ئەمە نەریتی کۆنی یۆنانیەکان بووە، هەتا ئێستاش مەسیحیەکان کاریگەرن بەو هەڵسوکەوتەوە، ئایا نابینیت کە چەپکە گوڵ لەسەر تابوت و گۆڕەکانیان دادەنێن؟!

٤) پرسیارکردن لەنەخۆش بە شێوەیەکی نەرم و نیان و، زۆر نەچونە ناو وردەکاری یەوە.

٥) ئەوەندە دانەنیشیت کە نەخۆشەکە بێزار بکەیت، چونکە نەخۆش پێویستی بە سەرئاو دەبێت، هەروەها گۆڕینی جل و بەرگ، هەروەها پێویستی بە خواردن و خەوتن دەبێت. ئەم کارانەش لەبەرامبەر میوانەکاندا ناڕەحەتە، مەگەر میوانەکە کەسێکی خۆشەویست و نزیکی نەخۆشەکە بێت، نەخۆشەکەش حەزبکات ئەو کەسە زیاتر لە لای بمێنێتەوە، لەم حاڵەتەدا مانەوەی لای نەخۆش قەیناکە.

٦) هەوڵدان بۆ دڵخۆشکردنی نەخۆشەکە و بەبیرهێنانەوەی بەدەست هێنانی پاداشتی خوایی هەروەها دوعاکردن بۆ نەخۆشەکە، لەو دوعایانەش خوێندنی حەوت جاری ئەم فەرموودەیە: (**أسْألُ اللهَ العَظيم، رَبَّ العَرْشِ العَظيم أنْ يَشفِيَكَ**) هەروەها خوێندنی سوڕەتی (الفاتحە) و (الإخلاص) و (النّاس) بەسەر نەخۆشەکەدا.



**بەسەرهاتێك دەربارەی سەردانی نەخۆش:**

لەهەندێك كتێب دا هاتووە كە كەسێك دەچێت بۆلای نەخۆشێك و، پێش ئەوەی كە دابنیشێت بە نەخۆشەكە دەڵێت: فلأنە كەس ڕەنگت زەردە.

نەخۆشەكە دەڵێت: الحَمْدُ للهِ عَلى كُلِّ حالٍ.

كابرا دەڵێت: زۆر هیلاك و ماندوو دیاریت.

نەخۆشەكە دەڵێت: خودا گەورەیە.

كابرا دەڵێت: نەخۆشیەكەت زۆر پێوە دیارە، كەی توش بویت؟

نەخۆشەكە دەڵێت: چەند ڕۆژێكە.

كابرا دەڵێت: هاواری چی دەكەیت؟

نەخۆشەكە دەڵێت: شتێكی وانی یە، داوای شیفا لە خوا دەكەم.

كابرا دەڵێت: نەخۆشیەكە چی یە؟!

نەخۆشەكە دەڵێت: نەخۆشی یەكی دیاری كراوە.

كابرا دەڵێت: چیە؟ ناوی نی یە!! باشە ئایا تۆ باشی؟

نەخۆشەكە دەڵێت: پێش ئەوەی كە بێیت بۆلام زۆر باش بووم.

كابرا دەڵێت: باشە من دەڕۆم، پێویستیەكت نی یە؟

نەخۆشەكە دەڵێت: با، پێویستیەكەم ئەوەیە كاتێك كە لەلای من دەڕۆیت هەرگیز مەیەرەوە بۆ لام، ئەگەر مردیشم گەردنت ئازابێت نوێژیشم لەسەر مەكە!!

بەڵێ، ئەمە زمان حاڵ و سکاڵای هەندێك لە نەخۆشەکانە، لەو کەسانەی کە سەردانیان دەکەن، هەندێك میوان، کاتێك دادەنیشن کۆمەڵە پرسیارێکی کۆتایی نەهاتوو لە نەخۆش دەکەن. پێشنیاری سەیر دەردەبڕن، خۆیان وەکو پزیشك پیشان دەدەن.

{شەیدا، د.محمد العریفی، و: هێمن محمد علی ل٦٣}.



## وانەی بیست و سێیەم

## بابەت: ئاگاداری تەندروستی دەروون و لاشەت بە

۞ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُوا۟ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾﴾ الأعراف: ٣١.

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (نِعْمَتانِ مَغْبُونٌ فيهِما كَثيرٌ مِنَ النّاسِ، الصِّحَةُ وَالفَراغُ). رَواهُ البُخاريُّ: ٦٤١٢.

۞ عَنْ أَبي سَعيدٍ الخُدْرِيِّ، أَنَّ النَبِيَّ ﷺ نَهى عَنِ النَّفْخِ في الشَّرابِ، فَقالَ رَجُلٌ: القَذاةُ أَراها في الإِناءِ، فَقالَ: أَهْرِقْها، قالَ: إِنّي لا أُرْوى مِنْ نَفَسٍ واحِدٍ؟ قالَ: فَأَبِنِ القَدَحَ إِذاً عَنْ فيكَ). حَديثٌ حَسَن، حَسَّنَهُ الأَلْباني في الصَّحيحَة: (٣٨٥).

۞ عَنْ إِبنِ عَبّاسٍ: (أَنَّ النَبِيَّ ﷺ نَهى أَنْ يُتَنَفَّسَ في الإِناءِ، أَوْ يُنْفَخَ فيهِ). حَديثٌ صَحيح، صَحَّحَهُ الأَلْباني: (١٨٨٨) في سُنَن الترمذي.

## سەرچاوەکان:

١) فتح الباري، شرح صَحيح البُخاري، إبن حَجر العَسْقَلاني، ج١١ ص٢٧٦.

٢) آياتُ الله في الإِنْسان، د.محمد راتب النابلُوسي، ص٣٥٤، ص٣٦٥، ص٣٧٥، ص٣٨٨.

٣) شەيدا، د.محمد عبدالرحّمن العريفى، و: هێمن محمد على، ل١٣.

٤) گۆڤاری: (ئاينده سازى) ژ: ٣٢، ل٢٧، ل٣٢.

٥) ڕۆژنامەی هەولێر، ژ: ٢٠٢٤، ل١٥.

٦) شرح رياض الصّالحين، إبنُ عُثيمين، ج٣، ص٩٣.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين. وَالصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ أَجْمَعِينَ:

جەستەی ساغ و لاشەی تەندروست، یەکێکە لە خەڵاتە هەرە گەورەکانی خوای پەروەردگار بۆ بەندەی خۆی، مرۆڤ لەدوای خەڵاتی دین و ئیمان کە سەرفرازی هەمیشەیی پێوەیە، خەڵاتی هاتنە بونی و ژیانی خەڵاتێکی گەورەیە، ژیانیش کاتێ خۆشە و لەزەتی لێ دەکرێ، کە مرۆڤ جەستەی ساغ بێت.

بەڵام ئەم خەڵاتە گرانبەهایە، مرۆڤ زۆرجار هەستی پێ ناکات، هەتا ئەو کاتەی کە نەخۆش دەکەوێت. بۆیە وتراوە: (لەش ساغی تاجی ئاڵتونە و لە سەری هەموو کەسێکدا، تەنها ئەوانە هەستی پێ دەکەن کە لەشیان نەخۆش و بە ئازارە و، ئەوان ئەو تاجی زێڕینە دەبینن!).

## شیکردنەوەی فەرمودەی بەخششی لەشساغی:

لە وانەکانی ڕابردوودا لە زنجیرە باسەکەمان (لە خوا غافڵ مەبە)، باسی نەخۆشی و نەخۆش و چارەسەرمان کرد، بە ویست و پشتیوانی خوا (إِنْ شاءَ الله) لەم وانەیەشدا هەندێکی تر لەسەر ئەو بابەتە گرنگە قسە دەکەین و، سەرەتای وانەکەمان بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەست پێدەکەین کە فەرموویەتی: (نِعْمَتانِ

مَغْبُونٌ فيهِما كَثِيرٌ مِنَ النّاسِ، الصِّحَةُ وَالفَراغُ). رَواهُ البُخاريُّ: (٦٤١٢).

واتە: دوو خەلاّتی زۆر گەورە هەن، کە زۆربەی خەڵکی تێیدا زەرەرمەندن و نەیانتوانیوە کەڵکی لێوەربگرن و قازانجی لیّ بکەن، ئەوانیش: لەش ساغی و دەست بەتاڵی یە.

زانایان لەسەر شەرحی ئەم فەرموودە بەنرخە گەلێك قسەی جوانیان کردووە:

زانای گەورە (إبن بَطّال) دەفەرمووێ: مانای فەرموودەکە ئەوەیە کە مرۆڤ دەست بەتاڵ نابیّ و ناتوانیّ بیّ ئیش دابنیشیّ هەتاوەکو دووشتی نەبیّ، ئەوانیش: هەبونی و دەوڵەمەندی و هاتنە دەستی پارە لە ڕێگەیەکی واوە کە خۆی دانیشتوە و، مانگانە کرێی دوکان و خانوو قازانجی بازرگانی کە پارەکە هی ئەمە، دەکەنە دەستیەوە!

چونکە ئەگەر وانەبیّ دەبیّ خۆی هەوڵبدا کاروکاسپی و کرێکاری بکات و، نان بۆخۆی و خێزان و منالّ و میوانی بەدەست بهێنیّ. بەلاّم لەم کاتەدا کە ئەم دەرفەتەی بۆ نەڕەخساوە، ژیانی مسۆگەرە و خۆی دەست بەتاڵە، هەروەها مرۆڤ کاتیّ دەست بەتاڵیەکەی بەسود و بە ئیسراحەتیەتی کە لەشی ساغ بیّ و نەخۆش نەبێت. چونکە ئەگەر مرۆڤ نەخۆش بوو، با هەموو سامان و پارەی دونیا هی ئەوبێت، چ نرخێکی هەیە؟! مرۆڤ کە نەخۆش

بوو، دەست بەتاڵ نی یە، بەڵکو لە هەموو کەس زیاتر مەشغوڵە بەخۆیەوە، بە دکتۆر و دەرمان و چارەسەر و ئازار وناڵەی لاشەیەوە!

جا هەر کەس ئەم دوانەی هەبوو: هەبونی و لەش ساغی، ئەمجا دەست بەتاڵ بوو، دەبێ بەڕاستی ئاگاداربێ کە دەست بەتاڵیەکەی نەبێتە زەرەر و زیان بۆی، ئەویش بەوەی واز لە شوکر و سوپاسی خوای گەورە بێنێ و هەمیشە بڵێ: خوایە گیان هەزاران هەزار شوکر و سوپاس، کە منت بەسەر کردۆتەوە بەوەی ژیان و گوزەرانت باش کردوم و لەشت ساغ کردوم..

ئەمجا ئەم شوکرانە بژێریە هەر بە قسە نەبێت بەڵکو لەبواری کرداریشدا جێبەجێ بکرێت ئەویش بەوەی کە: ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە و بە جەستە و بەماڵ و سامان و دارایی دەکرێت، درێغی لێ نەکات و جێبەجێی بکات. ئەوەش کە خوای گەورە نەهی لێ کردووە و گوناهـ و بێ شەرعی یە و بە جەستە و بە ماڵ و بە پارە دەکرێ خۆی لێ بپارێزێ. جا هەرکەسێ خوای گەورە دەست بەتاڵی گونجاوی بۆ ڕەخساند و لەشی ساغ کرد و لە چاکەدا بەکاری نەهێنا و شوکری خوای لەسەر نەکرد، ئەوە بەڕاستی کەسێکی خەسارەتمەندە!.

زانای بەناوبانگ (إبن الجوزی) هەر لەسەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری پێشەوومان ﷺ، دەفەرمووێت: جاری واهەیە مرۆڤ

جەستەی ساغە، بەلاَم دەست بەتاڵ نی یە، بەهۆی سەرقاڵ بونی بە بەدەست هێنانی گوزەران و ژیانی و کەسابەت کردنی. جاری واش هەیە باری ئابوری و دارایی زۆر باشە و دەست بەتاڵە و کاتی باشی هەیە، بەلاَم لەشی ساغ نی یە و هەمیشە نەخۆش و لەش بە ئازارە! جا ئەگەر هەردوکیانی بەیەکەوە بۆ کۆبونەوە (دەست بەتاڵی و لەش ساغی) بەلاَم لە ئاستی خواپەرستی و چاکەکاریدا تەمەڵ و تەوەزەل بوو، ئەوە بەڕاستی خەسارەتمەندە!

(الطيبي) زانایەکی ترە، کە یە لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرمودە گران قەدرەیدا، نمونەی مرۆڤی بە کەسێکی بازرگان چواندوە، کە پارە و سامانێکی هەیە وەکو سەرمایە و دەست مایە، ئەمیش پارەکەی و سامانەکەی دەخاتە کاروکەسابەتەوە و چاوەڕێی قازانجە، لەگەڵ ئەوەشدا خەمی گەورەی ئەوەیە: سەرمایەکەی سەلامەت بێ. جا بۆئەوەی هەم قازانجی دەست بکەوێ و هەم سەرمایەکەشی سەلامەت بێ لە تیاچون و فەوتان، پێویستە لەسەری کە بەجوانی چاو ورد بکاتەوە و بەبەرچاو ڕونیەوە کاسپی بکا، بزانێ لەگەڵ کێ معامەلە و کڕین و فرۆشتن و ئاڵ و وێر دەکات، وە پابەند بێت بە ڕاستگۆیی و وریاییەوە و فێڵباز نەبێ و نەهێڵێ فێڵی لێ بکرێ، بۆئەوەی لەزەرەرمەندبون پارێزراوبێت.

دەی بەهەمان شێوەش لەش ساغی و دەست بەتاڵی، سەرمایەی دەستی مرۆڤن، پێویستە مرۆڤ لەگەڵ پەروەردگاریدا بە ئیمان و خواناسی و تاعەت و عیبادەت معامەلە بکات، وە بەرەنگاری نەفسی بەدکرداری خۆی بکات، وە بە حیکمەت و داناییەوە بەربەرەکانی دوژمنان و نەیارانی ئیسلام بکات و بەرپەرچیان بداتەوە، بۆئەوەی قازانجی دونیا و قیامەت بەدەست بهێنی. وە بۆئەوەی سەرمایەکەی لەدەست نەچیْ و لە خەسارەتمەندی بەدوربێت، پێویستە لە بەگوێکردنی نەفسی بەدکردار بەدوربیْ و معامەلە و ئاڵوگۆڕ لەگەڵ شەیتاندا نەکات. {فتح الباري، ج١١، ص٢٧٦}.

**وتەیەکی ئیمامی علی:**

ئیمامی عەلی ـ رضی الله عنه ـ فەرموویەتی: (**أَلا وَإِنَّ مِنَ البَلاءِ الفاقَة، وَأَشَدُّ مِنَ الفاقَةِ مَرَضُ البَدَنِ، وَأَشَدُّ مِنْ مَرَضِ البَدَنِ مَرَضُ القَلْبِ**).

واتە: بەڕاستی بزانە لە بەلاّ و نارەحەتیە بۆسەر مرۆڤ، هەژاری و نەداری و موحتاجی. تاڵترونارەحەتتر و بەلاّی گەورەتر لە هەژاری و دەست کورتی، بریتیە لەنەخۆشی جەستەیی. خراپتر و سامناکتر لە نەخۆشی جەستەیی، نەخۆشی دڵ و دەرونی مرۆڤە..

ئەمجا ئیمامی عەلی دەفەرموێ: (أَلا وَ إِنَّ مِنَ النِّعَمِ سعَةُ المالِ، وَأَفْضَلُ مِنْ سعَةِ المالِ صِحَّةُ البَدَنِ، وَأَفْضَلُ مِنْ صِحَّةِ البَدَنِ تقوى القَلْبِ).

واتە: ئاگاداربە و بزانە لە خەلأت و بەخششەکانی خوای گەورە بۆ سەر مرۆڤ، بونی سەروەت و سامانی حەلألّی دونیایە. وە چاکتر و باشتر لە دەوڵەمەندی و پارەی زۆر، لەش ساغی و جەستەی تەندروستە. گەورەتر و چاکتریش لە لەش ساغی و جەستەی سەلامەت و تەندروست، دڵی خواپەرست و خواناس و لەخواترسە. {آياتُ اللهِ في الإنْسان، ص٣٤٥}.



## بەشەکانی زانستی پزیشکی لەئیسلامدا:

لە وانەی ڕابردودا، باسی چەند دکتۆرێکی زۆر بەناوبانگ و سود بەخشمان کرد، بە پشتیوانی خوا (إِنْ شاءَ الله)، لەم وانەیەشدا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەو چەند پزیشکە بەسود و کاریگەرە.

زاناکان دەڵێن: (إِنَّ الطبَّ فِي الإِسْلامِ: طبٌّ طَبيعيٌّ، وَطبٌّ نَفْسِيٌّ، وَطبٌّ وِقائيٌّ، وَطِبٌّ عِلاجِيٌّ).

واتە: بەڕاستی زانستی پزیشکی لە ئیسلامدا ئەم بەشانەیە، پزیشکی سروشتی مرۆڤ، پزیشکی بواری نەفسی و دەرونی، پزیشکی خۆپارێزی، پزیشکی چارەسەری..

١. پزیشکی سروشتی مرۆڤ:

مرۆڤ بە گشتی و مرۆڤی موسڵمان بەتایبەتی، کۆمەڵێ شتی تایبەتی هەیە، ئەگەر لەسەر ئەو سروشتیەی خۆی ڕۆشت، ئەوا جەستەیەکی ساغ و دەرونێکی ئارامی دەبێت، ئەگەر لێشی لادا، ئەوا چونکە پێچەوانەی سروشتی خۆی بۆتەوە توشی زۆر نەخۆشی سوك و قورس دەبێت، لەڕووی جەستەیی و دەرونیەوە بەپێی ئەو لادانەی کە لایداوە لە سروشتی خۆی، لەو فیطرەتەی کە خوای گەورە مرۆڤی بەگشتی لەسەر دروستکراوە، بەتایبەت مرۆڤی موسڵمان، کە خاوەنی کەسایەتی تایبەتی خۆیەتی.

بۆنمونە، مرۆڤی موسڵمان خاوەن کەسایەتیەکە: حەزی لە بەخشینە نەك وەرگرتن. هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**اليَدُ العُلْيا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلَى**) دەستی بەرز و باڵا و بەخشندە، چاکترە لە دەستی نزم و پان بۆوە و وەرگر و چاو لە دەست.

جا هەرکات مرۆڤ بەخشندە بوو، دەرونێکی ئارامی هەیە و جەستەش کە بەرهەمی دەروونە، تەندروست و ساغ دەبێت، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر لە سروشتی خۆی لایدا و، هەر خەریکی وەرگرتن و دەست پان کردنەوە بوو ـ بەبێ عوزرێکی تایبەت و بارودۆخێکی نەخوازراوی پێشهاتوو ـ ئەوە بەڕاستی دەرونی نائارام دەبێ و، جەستەی نەخۆش و ڕەنگی زەرد و زەبون دەبێت!..

هەروەها سروشت و کەسایەتی مرۆڤی موسڵمان وایە، کە هەمیشە لە جموجوڵ و بەرهەم هێناندا بێت، نەك بخۆری بەرهەمی خەڵکی بێ و خۆی تەوەزەلانە لێی پاڵ کەوتبێ، وە مرۆڤی موسڵمان بڕوای بە کردار و کارکردنە، نەك تەنها هەر خۆزگە و ئاوات خواستن بەبێ کارکردن!.

کەسایەتی و سروشتی مرۆڤی موسڵمان لەسەر ئەوەیە کە: خۆی بکات بە قوربانی لەپێناو خۆشبەخت کردنی کەسانی تردا، نەك تەماع و چاوچنۆکی وای لێبکات، خەڵکی بکاتە قوربانی بەرژەوەندیەکانی خۆی! وە سروشتی مرۆڤی موسڵمان وایە کە: خۆی بەلاوە گەورە و گرنگ نی یە تا ئەو ڕادەیەی کە بگاتە ئاستی کیبر و خۆبەزل زانین ـ کە خۆی گەورە نیە، بەڵام خۆی بە گەورە دەزانێ، نەك خەڵکی بە گەورەی بزانن! ـ وە ئەوەندەش خۆی لا بێ نرخ نی یە، کە خۆی بە هیچ بزانێ و وەکو داشی دامە خەڵکی بە ئارەزووی خۆیان بیجوڵێنن.

جا هەر تێکچوون و لە جێگە ترازانێك بۆ ئەم چەمکانەی سروشتی مرۆڤ بە گشتی و مرۆڤی موسڵمان بەتایبەتی، وای لێدەکات کە لە ڕووی دەرونیەوە ناساغ بێ، ئەمەش کاردەکاتە سەر ناتەواوی بواری جەستەی و نەخۆش کەوتنی!.

زانایانی بواری پزیشکی دەڵێن: (جوڵان و کارکردن کە لە سنوری توانای مرۆڤ نەچێتە دەرەوە، مایەی لەش ساغی و تەندروستی یە).

لە هەندێ کۆنگرەی پزیشکیدا، کە لەلایەن پزیشکانی پسپۆڕی بواری (دڵ)ەوە گیرا، بۆ قسەکردن و توێژینەوە لەسەر نەخۆشیەکانی دڵ و هۆکار و چارەسەرەکانی، هەموو ئامادەبوانی ئەو کۆنگرەیە سووربوون لەسەر ئەوەی کە: (تەندروستی و ساغی دڵ پەیوەستە بە جموجۆڵ و کارکردن و جوڵان). وە زۆربەی نەخۆشیەکانی دڵ لە زۆربەی وڵاتانی پێشکەوتووی بواری ماددی و خۆشگوزەرانیدایە و، پەیوەستە بە تەمەڵی و نەجوڵان و خواردنی باش و چەور و یەکسەر خەوتن بەسەریدا.. زۆربەی کات دانیشتن و نەڕۆیشتن بەپێ و وەرزش نەکردن و، پاشان دڵەڕاوکێ و خەفەت و قەلەقی یە.

## جوڵە و تەندروستی:

فەرموودەیەك: (پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ حەزی کردوە خۆی و هاوەڵانی بجوڵێن).

لەیەکێ لە غەزاکاندا، ژمارەی وڵاخی سواری موسڵمانەکان کەمتربوو لە ژمارەی خۆیان، بۆیە لەم کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا و ڕێنمایی هاوەڵانی کرد: کە هەرسێ کەس یەك وڵاخی

سواری وەربگرن و بەنۆرە سوارببن و پشوش بدەن بە ولآخەکە!
ئەمجا فەرمووی: (أَنا وَعَلِيٌّ وَ أَبُو لُبابَةَ عَلى راحِلَةٍ)، من و عەلی
و ئەبو لوبابە لەسەر پشتی یەك ولآخ سوار دەبین بە نۆرە. خۆشی
خستە ڕیزی خەڵکەکەوە کە دەبێ لەسێ بەشی ڕێگاکە دوو بەشی
بە پێ ببڕێت! جاکاتێ سەرەی پێغەمبەری خوا ﷺ هات، کە بەپێ
بڕوات و یەکێ لە دوو هاوەڵەکەی سواری پشتی ولآخەکە ببێ،
بەلایانەوە زەحمەت بوو کە قبوڵی بکەن، پێغەمبەری خۆشەویست
و نوری چاویان بەپێ بڕوات و ئەوان لەسەر پشتی ولآخەکە
سواربن.

بۆیە عەرزیان کرد: (يارَسُولَ اللهِ، ارْكَبْ وَنَحْنُ نَمْشِي عَنْكَ)، ئەی پێغەمبەری
خوا ﷺ دامەبەزە و هەر بە سواری لەجێی خۆت بمێنەوە و ئێمە
بەپێ دەڕۆین. لەم کاتەدا پێغەمبەری دڵسۆز، وتە بەناوبانگەکەی
فەرموو، لە وەلآمیاندا فەرمووی: (**ماأَنْتُما بِأَقْوَى مِنِّي عَلى السَّيْرِ، وَلا أَنا بِأَغْنى مِنْكُما عَلى الأَجْرِ**). نە ئێوە بەتواناتر و
بەگوڕ و هێزترن بۆ ڕۆیشتن بە پێ و، نە منیش لە ئێوە بێ ئاتاج تر
و دەوڵەمەندترم لەسەر وەرگرتنی پاداشتی بەپێ ڕۆیشتن. {ئەم
فەرموودەیە: رَواهُ أحمد في المُسْنَد: (٣٩٠١). وَالنِّسائي في السُنَن
الكُبرى: (٨٨٠٧)}.

بەڵێ، جولآن و کارکردن و بەپێ ڕۆیشتن، تەندروستی دڵ و
ڕیخۆڵەکان و ماسولکەکان و هەموو کۆئەندامی لاشەی مرۆڤی

پێوەیە. هەروەکو لە خەڵکانی زەمانی زوو بینیومانە و بیستومانە کە هەرچەندە خواردنی زۆریان خواردبێ، ڕۆنی خۆماڵی و چەوریان خواردبێ، چونکە زۆربەی کارەکانی ژیانیان بەدەستی خۆیان ئەنجامداوە و، ڕۆشتنیان بەپێ بوە و هەموو جەستەیان لە جوڵەدا بوە، لەگەڵ ئەو هەموو ماندوبون و زەحمەت کێشانەدا، کەچی زۆر لەشیان ساغ بوە و بەدەگمەن بیستراوە کەسێ نەخۆشی دڵ و شەکرەی هەبێ، یان چەوری خوێن و فشاری بەرزی خوێنی لەگەڵ بێت!

چونکە هەموو ئەو خواردنەی دەیخوارد بە جوڵان و کارکردن دەیسوتاند و بەڕۆژ زۆر ماندوو بوو، بەشەویش زوو خەوی لێ دەکەوت و بەیانی ڕۆژی دوایی بە جەستەیەکی خۆش و لاشەیەکی تەندروست و دڵێکی خۆشەوە هەڵدەستا بۆ نوێژی بەیانی!. بەڵام ئەمڕۆ مرۆڤ کە لە (پزیشکی سروشتی) خۆی لایداوە و، زۆربەی کارەکانی بە ئامێر جێبەجێ دەکات و هەر دەخوات و دادەنیشێ و دەخەوێت و، بە ئۆتومبێل بۆ نزیکترین شوێن دەڕوات و بەپێ ناڕوات و وەرزش ناکات.

ئیتر هەموو ئەو خۆراك و ووزەی وەریگرتوە، ناسوتێ و لە ناوشانەکانی لاشەی و بۆریەکانی خوێن و جگەریدا، چەوری و شیرینی کەڵەکە دەبێ و سەرەنجام وەختێ کتوپڕ بەلادا دێ و دەڵێن نەخۆشی دڵ و جگەر و شەکرە و گیرانی بۆری خوێنیەتی!

### ٢. پزیشکی ئارامی دەرونی:

زانایانی پزیشکی کۆکن لەسەر ئەوەی کە: هۆکاری سەرەکی بۆ توشبوون بە نەخۆشی دڵ و گەدە و ڕیخۆڵە و گورچیلە، دەگەڕێتەوە بۆ نائارامی دەرونی مرۆڤ و خەم و خەفەت خواردن.

وتەیەکی جوان هەیە کە دەڵێ: (أَنَّ ضغطَ الدَّمِ هُوَ فِي حَقيقَتِهِ ضَغْطُ الهَمِّ). بەرزی فشاری خوێن، خۆی لە ڕاستیدا بریتیە لە بەرزی فشاری خەم و خەفەت! بەڵێ، چاوەڕێ کردنی ناڕەحەتی و موصیبەت و بەترس و دڵەڕاوکێ ژیانەوە، لە خودی ناڕەحەتی و موصیبەتەکە گەورەترە. مرۆڤ ئەگەر هەمیشە لە هەژاری ترسا، هەر ئێستا هەژارە باپارەشی زۆر هەبێ، وە مرۆڤ ئەگەر هەمیشە لە ترسی نەخۆش کەوتندا ژیا، ئەوا ئێستا نەخۆشە!.

خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا ۝١٩ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ۝٢٠ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ۝٢١ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ۝٢٢ ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ ۝٢٣﴾ المعارج.

واتە: لە ڕاستیدا ئادەمیزاد بە شێوازێك دروست کراوە، ئەگەر دوور لەخوابێت، توشی هەر نەخۆشی و ناخۆشی و تەنگانەیەك بوو، زوو تەنگەتاو دەبێت و سەری دنیای لێ دێتەوە یەك و شپرزە دەبێت. کاتێك توشی نەخۆشی و ناخۆشی و کێشە دەبێت، زۆر

بێزار و ناسوپاس و دەم بەهاوارە. کاتێکیش خێر و بەرەکەت و خۆشی ڕووی تێدەکات، ئەو کاتەش ئەگەر دوور لە خوابێت، دەست نوقاو و ڕەزیل دەبێت و قەدەغەی چاکە دەکات لە خۆی و خەڵکی. جگە لە نوێژ خوێنان کە ڕەفتاریان بەو جۆرە نی یە، بەو شێوازە نی یە، ئەوانەی کە لەسەر نوێژەکانیان بەردەوامن، بەجوانی و ڕێك و پێکی لە کاتی خۆیدا، تابتوانن بە کۆمەڵ ئەنجامی دەدەن، هەوڵ دەدەن بیروهۆشیان لەلای بێت.

بەڵێ، نەفسی مرۆڤ ئاوا هەمیشە لە قەلەقی و ڕاڕایی و نائارامیدایە. بەڵام بەخواناسی و بەندایەتی ڕاستەقینەی خوای گەورە ڕزگاری دەبێت و دەرونێکی ئارامی دەبێت.

**فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئارامی:**

پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ دەفەرمووێت: (**مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ آمِناً فِي سِرْبِهِ، مُعافًى فِي جَسَدِهِ، عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ، فَكأَنَّما حِيزَتْ لَهُ الدُّنيا**). رَواهُ الترمذي: (٢٣٤٦ ).

واتە: هەرکەسێ بەیانی کردەوە و دوژمنایەتی لەگەڵ کەسدا نەبوو، لەماڵ و گەڕەك و شوێنی کار و شار و وڵاتەکەیدا، جەنگ و شەڕ و ترس و تۆقاندن نەبوو، بەدڵنیایی و ئەمینیەوە لەخۆی و ماڵ و سامانی دەهات و دەچوو، وە جەستەی تەندروست و ساغ بوو، لەگەڵ نان خواردندا کۆمەڵێ حەبی نەدەخوارد، وە نان و

بژێوی ژیانی ئەو ڕۆژەی هەبوو، ئەوە بابزانێ دونیا هەمووی هی ئەوە)..

بەڵێ مرۆڤ ئەگەر بەم دەروونە ئارامەوە ژیا و قەناعەتی بەبەشی خۆی بوو، دەرونی ئاسودە دەبێت و دوور دەبێت لە ڕق و بوغز و حەسودی و بەخیلی، کە مرۆڤ دادەڕزێنن و لەناوی دەبەن.

زانایانی پزیشکی دەڵێن: (**إنَّ الرَّحْمَةَ النَّفْسِيَّة كافِيَةٌ لِإعادَةِ ضَرَباتِ القَلْبِ السَّريعَةِ إلى إعْتِدالِها، وَضَغْطِ الدَّمِ المُرْتَفِعْ إلى مستواه الطَّبيعيِّ**).

واتە: ئارامی دەرونی بەسە بۆگێڕانەوەی دڵ بۆ بارودۆخی ئاسایی خۆی، لە دوای توشبوون بەدڵە کوتێ و خێرا لێدانی دڵ، هەروەها ئارامی دەرون و نەفس بەسە بۆ نزم کردنەوەی فشاری بەرزی خوێن بۆ ئاساتی ئاسایی خۆی.

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە ئوممەتەکەی هان دەدات لەسەر ئارامی دەرونی و خۆپاراستن لە دڵەڕاوکێ و ڕاڕایی و قەلەقی، کە زۆربەی نەخۆشی یە جەستەییەکان بەدوای خۆیدا دێنێت، هەروەکو لە فەرموودەیەکدا دەفەرموویت: (**إحْرِصْ عَلى ما يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ باللهِ، وَلا تَعْجَزْ، وَإنْ أصابَكَ شَئٌ فَلا تَقُلْ: لَوْ أنِّي فَعَلْتُ كانَ كَذا وَ كَذا، وَلكِنْ قُلْ: قَدَرُ اللهِ وَما شاءَ فَعَلَ، فَإنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطانِ**). رَواهُ مُسْلِم: (٢٦٦٤).

واتە: سوربە لەسەرئەوەی سودت پیێ دەگەیەنیێ. لە ئەنجامدانی کاری چاکدا پاڕاو دوودڵ مەبە، پشتت بەخوا ببەستە و دۆش دامەمێنە، ئەگەر شتێکت تووش بوو مەڵێ: ئەگەر من ئاوام بکردایە ئاوا و ئاوا دەبوو، بەڵکو بڵێ: بڕیاری خوایە و هەرچی خوای گەورە بیەوێ هەر ئەوە دەبێت. چونکە ووشەی (ئەگەر) کرداری شەیتان دەکاتەوە. {آياتُ اللهِ في الإِنْسان، ص٣٤٥ - ٣٥٦}.



## هەرکات ویژدانت ئارام و ئاسودەبوو، جەستەشت ئارام دەبێت:

**بەسەرهات:**

بانگخوازی ناودار مامۆستای زانکۆ (د.محمد عبدالرحمن العريفي) دەفەرموێت: هاوڕێیەکم بەناوبانگە لە خوێندنی دوعا و پاڕانەوەی شەرعیدا، بەسەر ئەو کەسانەدا کە توشی نەخۆشی دەروونی بوون، هەندێك جاریش دوعا بەسەر ئەو کەسانەشدا دەخوێنێت کە توشی چاو و جادوو بوون. ئەو هاوڕێیەم پێی وتم: ڕۆژێك یەکێك لە گەورە بازرگانەکان هات بۆلام و سکالای ئازارێکی بەهێزی دەکرد لە دەستی چەپیدا، شوێنەواری ئەو ئازارە بەهێزەی بەڕوونی پێوە دیاربوو، ڕوخساری چرچ و لۆچ ببوو، چاوەکانی لار ببوون، لەبەر دەستمدا دانیشت و پاشان وتی: یاشێخ دوعام بەسەردا بخوێنە.

وتم: هاوار و سكاڵای چی دەكەیت؟!.

وتی: ئازارێكی بەهێز، هۆكارەكەشی نازانم.. سەردانی چەندان پزیشكم كردووە و شیكاری زۆریشم ئەنجامداوە و هەموویان پاك و بێ كەم و كوڕین.. نازانم توشی چی بووم؟! بەڵكو چاوم لەسەر بێت ـ بەچاوەوە بووبم ـ. دوعام بەسەردا خوێند و بۆی پاڕامەوە.

ڕۆژی دووەمیش هاتەوە و دوعام بەسەردا خوێند، بۆ ڕۆژی سێهەم و چوارەمیش بەهەمان شێوە درێژەی كێشا و ئازارەكەشی هەر زیادی دەكرد!!

ڕۆژێك هاوارم كرد بەسەریدا و وتم: ئەی فلانەكەس، لەوانەیە ئەو ئازارەی توشت بووە هۆكارەكەی دوعای ستەم لێكراوێك بێت كە ئازارت دابێت، ستەمت لێكردبێت، لەماڵیدا یان لە دەروونی دا یان لە هەر شتێكی تردا..

ڕەنگی گۆڕا و هاواری كرد: ستەم؟!! بۆچی ستەم؟!! من پیاوێكی چاكم، من.. من.. لە تووڕەییەكەی ئارامم كردەوە و دوای لێبوردنم لێكرد و پاشان ڕۆیشت!

لەدوای (دە) ڕۆژ هاتەوە بۆلام، لە تەندروستیەكی زۆر باشدا بوو، زۆر سوربوو لەسەر ئەوەی كە سەرم ماچ بكات. دەیوست دەستم ماچ بكات و پاشان وتی: سوێند بە خوا لەدوای بەزەیی خودا تۆ هۆكاری شیفای من بوی، وتم: چۆن؟! خۆ دوعاكانم ئازارەكانی كەم نەكردی!!.

وتی: لەدوای ئەوەی لەلای تۆ ڕۆیشتم ئازارەکەم زیادی کرد و ووشەکانی تۆ لە گوێمدا دەزرنگایەوە.. بەڵێ لەوانەیە ستەمم لە کەسێك کردبێت.. یان ئازاری کەسێکم دابێت.. بیرم لەو کاتە کردەوە کە ویستم کۆشکەکەم دروست بکەم. زەویەك بە تەنیشت زەویەکەمەوەبوو، ویستم بیکڕم بۆئەوەی بیکەم بە باخچە بۆ کۆشکەکەم، ئەو زەویەش هی چەند بێ باوکێك و دایکیان بوو. داوام لە دایکی ئەو منداڵە هەتیوانە کرد کە پێم بفرۆشێت.. بەڵام ڕازی نەبوو، وتی ئەگەر بیفرۆشم پارەکەی چی لێبکەم؟!

واز لە زەویەکە بێنە باوەك خۆی بێت، هەتا منداڵەکانم گەورە دەبن و خۆیان شتێکی لێ دەکەن. ویستم ڕازی بکەم، پارەی زۆرم خستە بەردەست.. ڕازی نەبوو.. بەڵام زەویەکە بۆ من زۆر گرنگ بوو، زۆر بە بایەخ بوو.

وتم: ئەی چیت کرد؟!

وتی: زەویەکەم لێسەند بەڕێگەی تایبەتی خۆم، مۆڵەتی دروست کردنی بیناشم بۆ دەرهێنا، ئەمەشیان هەر بەڕێگەی تایبەتی خۆم و بینام تێدا دروست کرد.

وتم: ئەی منداڵەکان، ئەی دایکیان؟!

وتی: هەواڵم پێگەیشت دایکیان دەهات و سەیری کرێکارەکانی دەکرد، کە کاریان دەکرد لە زەویەکەدا و قسەی پێ دەوتن و دەگریا، کرێکارەکانیش وایان دەزانی شێتە، لەبیرمە کەدەستەکانی

بەرزکردەوە و دەپاڕایەوە و دەگریا، ئالەو کاتەدا ئازارەکە لە دەستمدا دەستی پێکرد!! بەشەو خەوم لێ نەدەکەوت، بەڕۆژ ئاسودە نەدەبووم.

وتم: باشە چیت بۆ کرد؟!

وتی: چووم بۆلای و داوای لێبوردنم لێکرد و گریام. لە شوێنێکی تردا زەویەکی باشتر لە زەویەکەی خۆیم پێدا، ئەویش ڕازی بوو، دوعای بۆ کردم و داوای لێخۆشبونی لەخودا بۆ کردم. لەلای ئافرەتەکە هاتمە دەرەوە و پەنام بۆ خودا برد و لێی پاڕامەوە، هەتا ئازارەکەم بەرە بەرە کەم دەبۆوە و نەما، سوپاس بۆ خوا ئازارەکەم نەما!!.. {شەیدا، محمد العریفی، و: هێمن محمد علی ل١٣}.

بەڵێ لایەنی دەروونی ئارام و هێمن و دڵی خۆش و زەردەخەنە و قسەی خۆش، کاریگەری زۆر گەورەیان هەیە لەسەر چاك بونەوەی مرۆڤ لە نەخۆشی. وەهەروەها دروست بوونی بەرگری دژی نەخۆشی.

**توێژینەوەکان دەڵێن:** کاتێك کەسێك گەشبین و دڵخۆشە (١٥٠٠) یەکەی خڕۆکە سپی یەکانی زیاد دەکات و، ڕەشبینی و ڕق و کینەش (١٥٠٠) یەکەی خڕۆکەی سپی کەم دەکات!!

کەواتە: با هەمیشە گفتمان شیرین و دڵمان خۆش و ڕومان بەخەندە و گەشبین و لێبوردەبین بۆئەوەی بەویستی خوا، لەش

ساغ و دەرون سەلامەت و دڵخۆشبین.{ ئاینده سازی، ژ: ٣٢، ل٢٧}.



### ٣. پزیشکی خۆپارێزی:

پزیشکی خۆپارێزی بەبراگەورە و ڕابەری هەموو پزیشکی مرۆیی دێتە ژماردن، چونکە هێزی نەتەوە و ئومەتێك لە هێز و توانای تاکەکانیدا ڕەنگ دەداتەوە، وە داهاتی گەل و نەتەوە و ئوممەتێك بە داهاتی تاکەکانی بەراورد دەکرێت. هەر گەل و نەتەوەیەك نەخۆشی و ئازار و مەینەتی تێدا بڵاوبۆوە، بەرەو لەناوچوون و دواکەوتن دەڕوات.

لەلایەکەوە بەهۆی لەکارکەوتنی هێزی بازوی ئەو هەموو کەسە نەخۆشانەی کە بەهۆی نەخۆشی و ئازارەوە لە بەرهەم هێنەوە بونە بەکاربەر، کە ئەگەر ئەوانە نەخۆش نەبونایە بەشداریان لە بەرهەم هێنان و ئاوەدان کردنەوەی وڵاتدا دەبوو.. لەلایەکی تریشەوە بەهۆی نەخۆشی یەوە ئەو هەموو پارە و سامانەی گەل و میللەت، لە چارەسەری ئەو نەخۆشیانەدا خەرج دەکرێ و، پارەی کاشی خۆمان دەخەینە دەستی وڵاتانێك کە ئەو دەرمانانەمان بۆ دەنێرن، کە بەبڕی ئەو پارەیە وڵات ئاوەدان دەبۆوە و دەیان پڕۆژەی بەرهەمهێنان دروست دەکرا، کە سودەکەی بۆ هاوڵاتیان و وڵاتەکەمان دەگەڕایەوە. ئەوەی جێگەی تێبینی و تێڕامانە ئەوەیە

کە: زۆربەی ئەو نەخۆشیانەی کە جگە لەوەی مرۆڤە نەخۆشەکە لەناودەبات، هەموو ژیانی بە ئێش و ئۆف و ناڵە و هاوار، ژیانی کەسوکار و بنەماڵەکەشی لەڕوی ماددی و مەعنەوی و دەروونیەوە لەناودەبات و، سەروەت و سامانی وڵاتمان بەشی زۆری بۆئەوە دەڕوات..

زۆربەی بەهۆی کەمتەرخەمی مرۆڤ خۆیەوەیەتی. ئەویش یان بە: نەکوتانی مناڵ لە کاتی خۆیدا دژی نەخۆشیەکان. یان ڕانەگرتنی پاك و خاوێنی جەستە و خۆراك و ژینگەی دەوروبەرمان، یاخود بەزۆرخۆری و زیادەڕەوی لەخواردندا. کە مرۆڤ لەزیادە ڕەوی کردن لەخواردن و خواردنەوەدا لەیەك جارەوە توش دەبێت و، دواتر زۆر بە زەحمەت وەکوخۆی لێدێتەوە.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٣١﴾الأعراف: ٣١.

بخۆن و بخۆنەوە لە حەڵاڵ و پاکو خاوێن، بەڵام زیادەڕەوی مەکەن، چونکە بەڕاستی خوای گەورە زیادە ڕەوانی خۆش ناوێت.

## بۆ دوربوون لەنەخۆشی زیادەڕەوی مەکەن..

بەڕاستی ئەمڕۆ کە خەڵکی بەهۆی خۆنەپاراستن و زیادەڕەوی لەخواردن و خواردنەوەدا توشی دەیان نەخۆشی بووە. پزیشکێکی بەڕێز و موسڵمان بەناوی (د.هەڵگورد فتح الله) بابەتێکی زۆر بەسودی نوسیبوو بە ناونیشانی: (زێڕی ڕەش بۆ شەکرەی سپی) لەبەر گرنگی بابەتەکە و پەیوەندی بەبابەتەکەی ئێمەوە، وەکو خۆی دەینوسینەوە:

(کوردستانی خۆشەویستمان پڕاوپڕیەتی لە زێڕی ڕەش، ژێر خانمان دەیایەکی ڕەشە، سوپاسگوزارین، خۆشحاڵین، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەم خەڵاتە نەکەینە بەڵا و نیقمەت. بەکارهێنان و دەستاودەست کردنی شتەکان لە دەستی مرۆڤ وایکردووە، هەر هۆکارێك لە ڕێچکەی سودبەخشی لابدا، ئەوە مرۆڤەکانن چەکی ئەتۆمی و.. و.. و.. بۆ تێکشکاندنی مرۆڤ و وڵات بەکاردەهێنن، هۆکار خۆی لەخۆیدا شتێکی دوو سەرەیە: بەباشە بەکاربێت خۆشگوزەرانیە بەسودە، بەلاڕێدا ببرێت دەرەنجامی کارەساتە.

دوونمونەی پەند ئامێز بۆ کوردستانیان:

١) دور گەری ناوڕۆ: دورگەیەکی باڵایە. چونکە لەناو زەریایی هێمن نزیك ئوستوڕالیا، ژمارەی دانیشتوانەکەی (٩٠٠٠) کەسە، پەنجا ساڵ بەر لە ئەمڕۆ خەڵکەکەی زۆر ناشارستانی بوون. ژیانێکی ڕاوشکاری و شوانکاریان دەبردە سەر، ڕێژەی نەخۆشی

شەکرە تیایاندا (٨٠٠٠٪) بوو. لەم دورگەیە زێڕ دۆزرایەوە، خەڵکەکەی چونە ژیانێکی خۆش گوزەران، خواردنی ئامادەکراوی تام خۆش، زۆر خواردن بێ ماندووبوون، کارنەکردن، دانیشتن، نەجولانەوە.. وازیان لە زەوی کێڵان و ڕاو و ئاژەڵداری هێنا، هەر دانیشە و بخۆ، ئێستا لە هەموو جیهان دوورگەی (ئاورۆ) پلەی یەکەمە لە زۆری ڕێژەی نەخۆشی شەکرە (٣٣٪)، لە هەرسێ کەس کەسێك شەکرەی هەیە!! ئەی ئافەرین مرۆڤ بەڕاستی زێڕیان هەیە!.

٢) میرنشینی ئیماراتی عەرەبی: ئەم وولاتە لە ساڵی (١٩٦٣) عێراق هاوکاری دارایی پێشکەش کردووە زۆر هەژار و دواکەوتووبووە، زێڕی ڕەش (نەوت)ی تێدا دۆزرایەوە، ئێستا دەوڵەمەندن، زۆر خۆرن، قەڵەون، خزمەتکار و کارگوزاریان هەیە. لەسەر ئاستی جیهان بە پلەی دووەم دێن لە زۆری ڕێژەی نەخۆشی شەکرە، (١٨.٩٪)ی خەڵکەکەی بەدەردی شەکرەوە دەتلێنەوە.

کە دیارە ئە کەسانە ناتوانن خواردنی چەور و شیرینی و خۆش بخۆن، دەبێ وەکو هەژار بژین!! سەرباری ئەمەش بەرکەوتەن کە توشی مامەکانی شەکرە ببن لە (چاوکوێربوون، قاچ بڕینەوە، نۆرەی دڵ و مێشك، وەستانی گورچیلە).

وڵاتی سعودیەش پلەی سێهەمی بۆ خۆی داگیرکردوە، لە زۆری ڕێژەی شەکرە لە جیهان (١٨.٣٪)، ئەوانیش زێڕی ڕەشیان هەیە و

بە شەکرەی سپی دەیخۆن. دەرەنجامەکەی ئەو کارەساتەیە: (تەنها لە ساڵی (٢٠١٣) بەهۆی نەخۆشی شەکرە (٥.١) ملیۆن کەس مردوون!! ئایا تیرۆر ئەوەندەی کوشتوە؟! شەکرە لە هەر شەش چرکەیەك کەسێك دەکوژێت!.



لایەنی پارە بە هەدەردان: ئەمڕۆ گشت جیهان شەڕی ئابوریانە، دەیان وڵات کێشەی بودجە و داراییان هەیە، تەنها لە ئەمریکا بۆ ساڵی (٢٠١٣) (٥٩٦) ملیۆن دۆلار، قورگە زەبەلاحەکەی شەکرە حەپەلوشی کرد و قوتیدا.

کوردستانی خۆشەویستمان خوای گەورە زێڕی ڕەشی بە شایەنی ئێمە زانیوە، ئێستا خەڵك گوزەرانی باش بووە، خۆشحاڵین، خۆزگە هەر کوردێك، هەر هاونیشتیمانیەکی ئەم کوردستانە لە خۆشگوزەرانیدا دەبوو. بەڵام دەبێ ئاگاداری تەندروستیمان بین، ئێمەش هەمان هەڵەی (ئاوڕۆ) و (ئیماڕات) و (سعودیە) دوبارە نەکەینەوە، زۆر خواردن، خواردنی ناتەندروست، دانیشتن، پاڵدانەوە، باپیرانمان هەژاربوون، لە گوند کاریان دەکرد، بەری ڕەنجیان لە قورگی کێڵگە دەردەهێنا، سەوزە و میوەی سروشتیان دەخوارد، ئێمە ئەمڕۆ بە گوند و شارەوە هەر لێی دانیشتوین، بەپێ ناڕۆین، بۆ کڕینی پێداویستی ڕۆژانەمان لە نزیك

خۆمان بە ئۆتومبێل دەڕۆین، خواردنی خێرا و فرە وزە و پڕ لە ماددە پارێز (الحافظة) دەخۆین، کارگوزاری بیانی لەماڵ، شەقام و ئۆفیس لەبەردەستمان کارمان بۆ دەکەن، ئاخۆ دەرەنجامی چی بێت؟!!

بەداخەوە شەکرە دوژمنێکی کوشندەیە، بکوژێکی دڕندەیە، سەرکڕی بنبڕە، ئاگری بن کایە، بەڵام چارەسەری بە (خۆپارێزی) زۆر ئاسانە، ڕێکخستنی خواردنێکی تەندروست، وەرزش کردن، ژیانێکی سروشتی گوند نشینی جاران بژین، بگەڕێینەوە باوەشی سروشت، جوانی ئەم کوردستانە دڵگیرە نەگۆڕینەوە بە دزێوی قەڵەوی دوژمنکاری شەکرە و چەوری و فشاری خوێن و مامەکانیان.. بەڕاستی پیرۆزترین سامانی کوردستان دەستی کاری هاونیشتیمانیانیەتی.. {ڕۆژنامەی هەولێر، ژ: ٢٠٢٤، ل١٥}.

زانستی پزیشکی دەڵێ: زۆر نەخۆشی هەیە لە ڕێگەی ڤایرۆس و میکرۆبەوە دەگوازرێتەوە و بڵاودەبێتەوە، لەبەرئەوە پێویستە لەسەرمان خۆمان بپارێزین و پشت بەخوا ببەستین.



## خۆپاراستن سوننەتێکی گەورەیە!

- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **(إذا سَمِعْتُمْ بالطّاعُونِ بِأَرْضٍ فَلا تَدْخُلُوها، وَإذا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِها فَلا تَخْرُجُوا مِنْها)**. رَواهُ البُخاريُّ: (٥٣٩٦) وَمُسْلِم: (٢٢١٨) .

واتە: ئەگەر بیستان نەخۆشی تاعون - کۆلێرا - لە شوێنێك هەیە، مەچنە ناوی و سەفەری بۆ مەکەن. وە ئەگەر لە شارێکدا بون و نەخۆشی تاعون بلاوبۆوە، تێیدا بمێننەوە و لێی دەرمەچن - چونکە ڕەنگە بەرگری پەیدا بکەن و توش نەبن. وە ئەگەر توش بوبن با بەهۆی ئێوەوە نەچێتە شار و ئاوەدانیەکی ترەوە کە پێشتر ئەو نەخۆشی یەی تێدا نەبووە.

- لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی خۆپارێزی لە نەخۆشیەوە فەرموویەتی: **(فِرَّ مِنَ المَجْذُومِ فِرارَكَ مِنَ الأَسَدِ)** رَواهُ البُخاريُّ: (٥٣٨٠) وَ أحمد في مُسْنَدِه: (٩٧٢٠).

واتە لەبەرگول(نەخۆشی گولی) ڕاکە و خۆتی لێ دوربخەرەوە، هەروەکو لەبەر شێر ڕادەکەی..

پرسیار کرا لە زانایانی میکرۆب ناسی **(جَراثیم)** ئایا چ شوێنێك لە جەستەی مرۆڤ زۆرترین ڤایرۆس و میکرۆب پێوەی دەنوسێ و نەخۆشی لێوە دەگوازرێتەوە؟! وتیان: چوار پەلی مرۆڤ و دەم و چاوی، یانی هەردوو دەست و هەردوو قاچ و دەم و چاو.. دەی

ئەوەتا ئاینی پاکی ئیسلام دەست نوێژی داناوە بۆئەوەی مرۆڤ ڕۆژی پێنج جار ئەم شوێنانەی خاوێن بکاتەوە !

- وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەفەرمودەی موبارەکیدا، فەرمانی پێکردووین کە ئەگەر ویستمان خۆمان بە ئاوێك بشۆین، یان دەست نوێژی پێبگرین کە لە تەشتێکدایە، یەکەمجار دەبێ دەستمان پاك بشۆین ئەمجا دەست بخەینە ئاوەکەوە، بۆئەوەی ئەگەر میکرۆبێك بەدەستمانەوە بێ لێ ببێتەوە و بەپاکی دەست بخەینە ئاوەکەوە و میکرۆبەکە لە دەستمانەوە نەچێتە ئاوەکەوە.

وە هەروەها زانایان دەڵێن: ئەو کونانەی کە لە جەستەدان وەکو: لوت و دەم و گوێ، میکرۆب و ڤایرۆس تیایاندا کۆدەبێتەوە، لەدەست نوێژەکەماندا بە سوننەت دانراوە کە ئاو لە دەم و لوت ڕابدەین ـ بەڵام زیادەڕەوی نەکەین ـ وە بە پەنجەمان گوێچکەمان پاك بکەینەوە ـ نەك ئاو لە گوێمان بکەین! ! ـ .

- وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووین بەبەکارهێنانی سیواك کە زانایان دەڵێن: لەناو سیواکدا ماددەیەك هەیە کە میکرۆبێك دەکوژێ. وە زۆرێك لە مەعجونی ددان شتنی ئەمڕۆ سوود لە سیواك وەردەگرن و وەکو پێکهاتەی ناو دەرمانەکە بەکاری دەهێنن. بۆ کوشتنی بەکتریای زیان بەخشی ناو دەم و ددان..

- هەروەها پێغەمبەرمان ﷺ فەرمانی پێکردووین کە لەکاتی خواردنەوەی ئاودا، هەناسە لە ناو ئاوەکەدا نەدەین و لە دەمی بکەینەوە و بەسێ جار بیخۆینەوە، بۆئەوەی ئەو جەراثیم و میکرۆبەی کە لەگەڵ هەناسەدانەوەدا دێتە دەرەوە، تێکەڵ بە خواردنەوەکە نەبێ! هەروەکو نەهی لێکردووین کە فوو لە خواردنی گەرم بکەین. بەڵکو لێی گەڕێین تاخۆی سارد دەبێتەوە.

- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لايُورَدُ مُمْرِضٌ عَلى مُصِحٍّ) رَواهُ مُسْلِم: (٢٢٢١) وَ أحمد: (٩٢٥٢).

واتە: نەخۆش و ساغ بابەیەکەوە نەبن و لەیەکتریان جیابکەنەوە. جائەم فەرموودەیە مرۆڤ و ئاژەڵ و پەلەوەر و باڵندە دەگرێتەوە، کە نابێ نەخۆش و ساغ بەیەکەوە لەیەك شوێندا بن، بۆئەوەی ساغەکە لە نەخۆشەکەوە توشی نەخۆشی نەبێت.

**بەڵام:** لەگەڵ ئەوەی کە خۆپارێزی لە نەخۆشی شتێکی پێویست و فەرمان پێکراوە، بەڵام نابێ لە سنور دەربچێ و مرۆڤ بەناوی خۆپاراستن لە نەخۆشی، هەموو ژیانی بە ترس بەسەر ببات و قیز و بێز لە هەموو شتێ بکاتەوە، وە هەموو ماڵ و کەسێکی جگە لە خۆی پێ پیس بێ، وە لەکاتی دەست نوێژ شۆردن و کەلوپەل شۆریندا دڵی پاك نەبێتەوە و سەرەنجام خۆی توشی

بەلای گەورەی وەسوەسە بکات. کە نەخۆشیەکی دەرونی و نەفسی گەورەیە !.

بەڵێ هەرکەسێ خۆپارێزی لە نەخۆشی لە سنوری شەرع و زانست چوە دەرەوە، ئەوە هەمیشە کەسێکی نەخۆش و لاشە ناتەندروست دەبێت. وە بەبینین و مەرحەبایی و تەوقە لەگەڵ کردنی نەخۆشێك نەخۆش دەکەوێت. تەنانەت کەسی واهەبووە، هەر کەباسی نەخۆشێك و خراپی نەخۆشیەکەی کراوە، بەبێ ئەوەی ئەم ببینێ، یان لەلای بێ، یەکسەر نەخۆش کەوتووە ! !

لەبەرئەوە دەبێ ئاگاداربین، پاکوخاوێن بین، خۆپارێز بین لە نەخۆشی، بەلام دڵنیابین بەوەی کە هەموو نەخۆشی و شیفایەك هەر بەدەست خوایە و نەخۆشی گرتنەوەش بەبێ ویستی خوا نابێ. هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ، ئەمەشی بۆ ڕوونکردوینەتەوە و فەرموویەتی:

**(لا عَدْوَى، وَلا صَفَرَ، وَلا هامَةَ، فَقالَ: أَعْرابِيٌّ: يا رَسُولَ اللهِ: فَما بالُ إِبْلي تَكوُنُ في الرَّمْلِ كَأَنَّها الظِّباءُ، فَيَأْتِي البَعيرُ الأَجْرَبُ فَيَدْخُلُ بَيْنَها فَيُجْرِبُها؟ فَقالَ: فَمَنْ أَعْدى الأَوَّلَ؟) رَواهُ البُخاري وَ مُسْلِم.**

واتە: نەخۆشی و تەنینەوە و لەیەك گرتنەوە ڕاستەوخۆ بەبێ ویستی خودا ڕونادات، وە شومی مانگی ـ سەفەر، کە عەرەب وایان

دەزانی یەکەم چوارشەممەی مانگی صەفەر شومە و نابێ هیچ کارێك بکەی ـ فەرمووی: ئەوە بناغەی نی یە و خوڕافیاتە و ڕاست نی یە.. لێرەدا کابرایەکی دەشتەکی هەڵی دایە و پرسیاری لە پێغەمبەری خودا کرد و، داوای ڕوونکردنەوەی کرد..

(ئەمەش کرانەوەی ئیسلاممان نیشان دەدات، کە ئەگەر کەسێك تێبینی هەبوو لەسەر قسە و بیروڕایەك ـ پەیوەندیدار بە ژیانی دونیاوە، نەك مەسەلەی عەقیدە و بیروباوەڕی غەیبی ـ بۆی هەیە قسە و پرسیاری هەبێ، با قسەکەریش پێغەمبەری خوا بێ ﷺ).

کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جەنابت فەرموت نەخۆشی تەنینەوە نی یە، ئەی چی دەفەرمووی دەربارەی حوشترە ساغە جوانەکانی من، کە دەتگوت ئاسکە کێوین لە گورج و گۆڵی و ساغی و سەلامەتیدا، کەچی ڕۆژێکیان حوشترێکی گەڕ لەولاوە هات و تێکەڵ بە حوشترەکەم بوو، ئەویش نەخۆشی یەکەی گرت و گەڕ بوو؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەی باشە ئەی کێ حوشتری یەکەمی توشی گەڕی کرد؟!

واتە: حوشتری یەکەم کە گەڕ بوو، لە کێوە گرتیەوە؟ ئەگەر بڵێی لە حوشترێکی ترەوە ئەی ئەو لەکێ یەوە. بێگومان دەبێ بگاتە سەرەتایەك کە نەخۆشی یەکە نەبوە و ساغ بووە.

{زانستی زیندەوەر و ڤایرۆس ناسی (عِلْم الجَراثيم) . پشتگیری لە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات}.

**زانستی تازە دەڵێ:** بەڵێ ڕاستە نەخۆشی گرتنەوە مەرج نی یە ڕاستەوخۆ لە نەخۆشەوە بۆ ساغ بڕوات و، ساغەکە لە نەخۆشەکەی بگرێتەوە. چونکە ڤایرۆس و میکرۆبی زیان بەخشی نەخۆشی، جاری واهەیە لە نەخۆشێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ ساغێك، بەڵام ساغەکە نەخۆش ناکەوێ بەڵکو ئەم بەرگری پەیدا دەکات دژی ئەو ڤایرۆس و میکرۆبە و، ئەمجارە لەم ساغەوە دەگوازرێتەوە بۆ ساغێکی تر و ئەم ساغەیان نەخۆش دەکەوێت!

جاری واش هەیە ڤایرۆسی نەخۆشیەکە لە نەخۆشێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ لاشەی ساغێك. بەڵام ئەم ساغە بەرگری جەستەی بەهێزە و، هەر زوو بەرگری بەرامبەر ئەم ڤایرۆسە پەیدا دەکات و نەخۆش ناکەوێ و، لەم ساغەوە دەگوازرێتەوە بۆ ساغی دووەم.. ئەویش بەهەمان شێوە بەرگری پەیدا دەکات دژی و، دەگوازرێتەوە بۆ ساغی سێهەم و، بەم شێوەیە تاوەکو ساغی نۆیەم.. هەموویان ڤایرۆسەکە چۆتە لاشەیانەوە. بەڵام بەرگریان دژی پەیدا کردووە و نەخۆش نەکەوتون تاوەکو دەگوازرێتەوە بۆ ساغی دەیەم، ئەم بەرگری جەستەی لاوازە و نەخۆشیەکە لە جەستەیدا دەمێنێتەوە و نەخۆش دەکەوێت!!

**کەواتە:** ئەمە ڕێك فەرموودەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە فەرمووی: نەخۆشی گرتنەوە و گواستنەوە لە نەخۆشەوە بۆ ساغ ڕاستەوخۆ نییە. بەڵکو گواستنەوەی نەخۆشی و تەنینەوەی

هۆکارەکە ئامادە دەکات. هەروەکو ساغی دەیەم لە نەخۆشیێکەوە نەیگرتەوە. بەڵکو دوای گواستنەوەی بۆ (نۆ) ساغ، ئەمجا لەمدا دەرکەوت!! {آياتُ الله في الإِنْسان، ص٣٤٧}.

کەواتە: خۆپارێز بە لە نەخۆشی، پاکو خاوێن بە، بەلاّم لە سنور مەیە دەرەوە، وات لێ بێت هەموو شت و هەموو کەست پێ پیس بێت. بەچاوپێکەوتنێکی دەرزی و دەرمانی نەخۆشێك نەخۆش بکەویت. بەڵکو کە خۆت پاراست پشت بەخوا ببەستە و، دڵنیابە بەبێ ویستی خوا نەخۆشی لەخۆیەوە ناگوازرێتەوە.



## ٤. پزیشکی چارەسەری (طُبٌّ عِلاجِيٌّ):

لەوانەی پێشودا باسی ئەوەمان کرد، کە خوای گەورە بۆهەموو نەخۆشی یەك دەرمانێکی دروست کردوە و، زانایانی دەرمانسازی دەبێ بەدوایدا بگەڕێن و، بەویستی خوا چارەسەری نەخۆشیەکان بکەن.

بەلاّم دەبێ ئەوەش بڵێین: ئەمە مانای ئەوە نی یە کە لەگەڵ بچوکترین ئازار و نەخۆشی دا، خێرا ڕابکەینە عەیادە لاکۆلاّنیەکەی ماڵمان و، داوای حەب و دەرزی و دەرمان بکەین.

بەڵکو: پێویستە هۆشیاری تەندروستیمان زیاد بکەین و، بزانین: مەرج نی یە هەموو سوکە ئازار و تالیٚ هاتنێك، چ هی جەستەی خۆمان بێت، یان هی منداڵەکانمان بیٚ پێویستی بەخواردنی دەرمان هەبێت، بەڵکو زۆر جار جەستە خۆی ئەم ئازارە حەل دەکات. ئەگەر زۆر گوێی پیٚ نەدەی لەبیرت دەچێتەوە، بەڕاستی پێویستە لەسەر وەزارەتی تەندروستی کە گرنگی بەبواری ڕۆشنبیری تەندروستی هاوڵاتیان بدات.

ئەمەش پێویستی بە هەڵمەتێکی بەرفراوان هەیە، وە پێویستی بەوە هەیە کە کاتێك کوڕ و کچێك بڕیاری هاوسەرگیری دەدەن، سەنتەرێکی تایبەت بە هۆشیاری هەبێت و، تێیان بگەیەنیٚ کە چۆن ڕووبەڕووی نەخۆشیەکان دەبنەوە؟ ئەو نەخۆشیانە چین کە سەرەتا ڕوو لە ئافرەتان دەکات؟

پاشان کاتی سکپڕی پێویستە چی بکات؟

چۆن سەردانی پزیشکی پسپۆڕ بکات؟

نەك پیرەژن و عیادەی لاکۆڵان!! ئەمجا دوای هاتنە دنیای کۆرپەکەشی پێویستە زانیاری لە پزیشکێك وەربگرێت، نەوەك هەر کەسەی خێزانەکەی بۆخۆی ببێتە پزیشکێك و، لەگەڵ هەر گریانێکی منداڵەکە بڕیاری پێدانی دەرمان بە کۆرپەکە بدەن! دواتر ئەو ڕێچکە و پلانە پێویستە بۆ هەموو قۆناغەکانی ژیان بچێتە بواری جێبەجیٚ کردن، تاببینە خاوەنی کۆمەڵگایەکی لەش ساغی..

## ڕوونکردنەوەیەکی زۆر پێویست و گرنگ:

خوای حەکیم و کاربەجێ کە خۆراکی بۆ دروست کردوین و، سەرچاوەی ژیان و زیندوبونمانە و گەشەی پێ دەکەین و، ووزەی جەستەمان بۆ جولآنی ڕۆژانەمان لەو خۆراکانەوە وەردەگرین کە دەیخۆین. خوای گەورە و میهرەبان، لەو خۆراکانەدا هیچ شتێکی زیاد و بێ کەڵکی دانەناوە کە ئێمە فڕێی بدەین. بەڵکو هەمووی بۆ جەستەی ئێمە پێویستە و بەلابردن و بەکارنەهێنانی خۆمان توشی نەخۆشی دەکەین. لە کاتێکدا ئەگەر بەکارمان بهێنایە وەکو ئەوەی خوای گەورە دروستی کردووە، خۆمان لەزۆر نەخۆشی دەپاراست و توش نەدەبووین.. بۆڕوون کردنەوەی زیاتری ئەو قسانەی کردمان با نمونە بێنینەوە:

خوای گەورە کە گەنمی کردوە بە خۆراکی سەرەکی و نانی ڕۆژانەمان و ناتوانین بەبێ نان بژین، ئەم گەنمە لە ئاش دەکرێ و دەکرێ بە ئارد، بێگومان ئەو ئاردە کە پەکی پێوەیە کە توێکڵی گەنمەکەیە و لەکاتێکدا ئاردەکە بە هێڵەك دادەبێژرێ، ئەو کەپەکە ـ توێکڵی گەنمەکە جیادەکرێتەوە و، بەم شێوەیە ئاردەکە سپی و جوان دەبێ و نانەکە سپی و گەورە دەردەچێ!.

هەروەها خوای گەورە میوەی بۆ دروست کردووین، سەرچاوەی وەرگرتنی هەموو جۆرەکانی ڤیتامینە و پێویستی لاشەمان بە ڤیتامینەکان لە ڕێگەی میوەکانەوە پڕدەکرێتەوە.

جائەم میوانە زۆربەیان توێکڵەکەی دەخورێت وەکو: سێو، خەیار، قۆخ، قەیسی.. کەچی ئێمە دێین توێکڵەکەی لێ دەکەینەوە و پاکی دەکەین ئەمجا دەیخۆین. یان دەیکەین بە شەربەت و تەنها ئاوەکەی دەهێڵینەوە و تڵپەکەی فڕێ دەدەین. وەکو شەربەتی پرتەقاڵ، کە لەسەرەتادا زانایان وایان دەزانی کە خواردنی توێکڵی میوە، نەسودی هەیە نەزیان! بەڵکو هەرس نابێ و لەگەڵ پاشەڕۆدا فڕێ دەدرێتە دەرەوە..

هەندێك لە زانایانیش ڕەئیان وابوو کە توێکڵی میوە هەرس قورس دەکات و، ئازاری گەدە و ڕیخۆڵە دەدات. لەبەرئەوە میوە پاك بکرێ و بکرێ بەشەربەت ئەمجا بخورێ!

بەڵام دوای پێشکەوتنی زانستی پزیشکی و پشکنینی ورد بۆ هەرسی خۆراك، زانایان گەیشتنە ئەو ڕاستیەی کە: خواردنی ئاردی سفر و گرتنی کەپەك توێکڵی گەنم و دانەوێلە بە (هێڵەکی ئاڵەت بێژ)، کە هەموو زبری ئاردەکە لادەبات و ئاردی سفری سپی لێ دێڵێتەوە. وە خواردنی میوە بەپاك کراوی و بەشەربەت و، فڕێ دانی توێکڵەکەی و ناوەکەی، زەرەرێکی گەورە لە تەندروستی مرۆڤ دەدات، وەکو:

١) توشبونی مرۆڤ بە قەبزی و درەنگ دانیشتن و، دواکەوتنی فڕێ دانی پاشەڕۆ لەلاشە و، ڕزگاربوون لێی. چونکە خانەکانی ڕیخۆڵە بە ئاردی زبر و کەپەکی گەنم و دانەوێڵە و توێکڵی میوە،

تازە دەبێتەوە! خۆئەگەر ئاردی سفر بەکاربهێنین و تەنها شەربەت بخۆینەوە لەجیاتی خواردنی میوە بە توێکڵ و ناوەکەیەوە، ئەوا ڕیخۆڵە لوس دەبێت و هەرس دوادەکەوێ و قەبزی و مایەسیری توشی مرۆڤ دەبێت..

٢) توێکڵی میوە و کەپەکی دانەوێڵە، مادەی (سلیلۆزین) ئاو دەمژن و هەڵدەگرن و هەرس ئاسان دەکەن.

٣) ئاردی زبر بەکەپەکەوە ـ بەبێ بێژانەوە، وە خواردنی میوە بە توێڵکەوە، یان بە ڕیشاڵی میوەکەوە، مادده چەوریەکانی ناو ئەو خۆراکەی کە دەیخۆین ـ کۆلیسترۆڵ ـ ەکەی، دەمژن و ناچنە ناو بۆری خوێنەوە و، مرۆڤ توشی تەسك بونەوەی بۆریەکانی خوێن نابێت. لە کۆنیشەوە وتراوە: (**إنَّ عُمْرَ الإنسانِ مِنْ عُمْرِ شَرايِنِه**). بەڕاستی تەمەنی مرۆڤ پەیوەستە بە تەمەنی بۆریەکانی خوێنیەوە، تا بۆریەکان پاك و خاوێن بن و چەوری نەیانگرێ، بەویستی خوا تەمەنی ئەو مرۆڤە درێژترە و لاشەی تەندروسترە.

٤) زانایان دەڵێن: نەخۆشیەکانی مایەسیری، شێرپەنجەی کۆلۆن، چاوکزی، بەردی زراو، بەرزبونەوەی ڕێژەی چەوری لەناوخوێنی مرۆڤدا، بەرزبونەوەی فشاری خوێن، دەوالی و ئەژنۆ هێشان، توشبوون بە ئیلتیهابی درێژ خایەن.. بەشێکی یەکجار زۆر لەهۆی توشبوون بەم نەخۆشیانە، هی ئەوەیە نان و خواردنمان کە

پەك و توێكڵی پێوە نەماوە و ئاردی سفرە! وە میوەكان، بەبێ توێكڵ و ڕیشاڵە خانەكان دەخۆین و هەر ئاوەكەی دەگرین!! دەی لەخوا غافڵ مەبە و دەستكاری كاری خوامەكە و، دڵنیابە ئەوەی خوای گەورە دروستی كردووە هەمووی بۆ بەرژەوەندی تۆی مرۆڤە و، تۆش سوپاسگوزار و گوێڕایەڵی ئەو خوایە بە. {آياتُ الله في الإِنسان. د.محمد راتب النابلُسي ص٣٨٨}.

## ئاگاداری ئاو خواردنەوەت بە!

شتێكی ئاشكرا و ڕوونە كە مرۆڤ بەبێ ئاو ناژی و هەمیشە پێویستی بەئاو خواردنەوەیە، جابۆ ڕێكخستنی دروستی كاتەكانی خواردنەوەی ئاو، بۆئەوەی لە سودەكانی بەهرەمەندبین و بتوانین سوود لە كاریگەریە باشەكانی وەربگرین، پێویستە لەم كاتانەدا ئاو بخۆینەوە:

١) دوو پەرداخ ئاو دوای نەخۆشی، یارمەتی چاك بوونەوەی ئۆرگانەكانی لەش دەدات.

٢) پەرداخێك ئاو (٣٠) خولەك بەر لەنان خواردن، هەرس كردنی خۆراك كارا دەكات.

٣) پەرداخێك ئاو بەر لەخۆشتن، یارمەتی دابەزینی پەستانی خوێن دەدات.

٤) پەرداخێك ئاو بەر لە نوستنن ڕێگە لە جەڵتەی مێشك و دڵ دەگرێت.

**پرسیارێکی گرنگ:** ئایا ئاوی سارد خواردنەوەی دوای نان خواردن خراپە؟!

وەلآم: خواردنەوەی یەك پەرداخ ئاوی سارد لەدوای نان خواردن، لەوانەیە لای هەندێك کەس زۆر خۆش بێت، بەلآم کاتێك دوای نان خواردن کە ئاوی سارد دەخۆیتەوە، وادەکات ئەو چەوریانەی کە لەگەڵ خواردنەکەدا خواردوتە بمەیێت ـ بیبەستێت ـ! بەم کارەش پرۆسەی هەرس کردن لەگەدەدا دوا دەخات و، کاتێکیش لەگەڵ ترشەڵۆکی گەدەدا یەك دەگرن، دادەڕزێت و بەخێرایی لەلایەن ڕیخۆڵەکانەوە دەمژرێت.

تەنانەت خێراتر لەخواردنی ووشك، هەروەها ئەم مادەیە ڕووی ڕیخۆڵەکان دادەپۆشێت و ئەمەش هۆکارێکی بەهێز دەبێت بۆ نەخۆشی شێرپەنجە، هەر بۆیە باشتر وایە کە دوای نان خواردن لەجیاتی ئاوی سارد، شلە یان خواردنەوەیەکی گەرم بخۆینەوە! {ئایندە سازی، ژ: ٣٢، ل٣٢ لە نوسینی: د.نەسرین محی الدِّین}.



## وانەی بیست و چوارەم

## بابەت: پزیشکی بەڕێز: دڵسۆزبە بۆ نەخۆشەکان

۞ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ۝٢﴾ المائدة.

۞ وَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنيا، نَفَّسَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ القِيامَةِ، وَمَنْ يَسَّرَ عَنْ مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اللهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنيا وَ الآخِرَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِماً سَتَرَهُ اللهُ فِي الدُّنيا وَالآخِرَةِ، واللهُ فِي عَوْنِ العَبْدِ ما كانَ العَبْدُ فِي عَوْنِ أَخيهِ). رَواهُ مُسْلِم: (٢٦٩٩).

### سەرچاوەکان:


١) شەیدا، د.محمد عبدالرحمن العریفی، و: هێمن محمد علی، ل٤٦، ل٥٨.

٢) ڕۆژنامەی (باسك) ژ: ٥٢٣، ل١٢.

٣) هەڵبژاردەی چیرۆکی زیرەکان، إبن الجوزی، و: حبیب محمد سعید، ل٨١، ل٨٣.

٤) گۆڤاری (متمانە) ژ: ٣٦، ل٣٩.

٥) موسوعَة أسْماءُ اللهُ الحُسْنى، د.محمد راتب النابلُسي، ج١، ص١٨٥.

٦) خود پەسەندی، فاتح مەلا رسول شارستێنی، ل٢٢.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ:

لەوانەکانی ڕابردوودا باسی نەخۆش و نەخۆشیمان کرد، بەویست و پشتیوانی خوای گەورە لەم وانەیەشدا باسی ئەو کەسە دەکەین، کە نەخۆش هیچ کەسێکی تر شك نابات لەکاتی ئازار و ناڕەحەتیدا، پەنای بۆ بەرێت و داوای عیلاج و دەرمانی لێبکات، کە بە ئومێدی خوا، ئازارەکەی لەسەر لاچێ یان سوك ببێ، ئەو کەسەش پزیشکە (دکتۆر).

پزیشك: ئەو کەسەیە کە ساڵانێکی زۆری تەمەنی لە خوێندندا هەمیشە بە پلەی بەرز و باڵا بڕیوە. تا کۆلێژی پزیشکی گشتی تەواو کردووە. پاشان پسپۆڕی لە بەشێکی جەستەی مرۆڤدا پەیدا کردوە، لەدوای مامۆستای ئاینی کە ڕێنمایی و ڕێنیشاندەری ئاینە بە خەڵکی و، کەسی دیندار و خواناس ناتوانێ بەبێ مامۆستای ئاینی بژی، هەمیشە پێویستی بە ڕێنماییە گرنگەکانیەتی، هیچ خاوەن پیشەیەکی زانستی وەکو پزیشك خەڵکی بە گشتی پێویستیان پێی نیە.

لەبەرئەوەی دەگونجێ مرۆڤ تامردن خانوەکەی بەقوڕ و بەرد لە گوندێکدا دروست بکات و، هەر خۆی نەخشەدانەری بێت و پێویستی بە نەخشەی ئەندازیار نەبێت! یان کەسێکی پاك و

سەلامەت بێت و، تامردن دیوانی دادگا و دادوەر نەبینیّ و ئیشی پێی نەبێت. یاخود لە خوێندن بێبەش بێت و، چاوی بە هیچ قوتابخانە و پەیمانگا و زانکۆ و مامۆستا و فێرکارێك نەکەوێت و ژیانیشی بەسەر بەرێت. بەڵام کەسێك نابینی مەگەر یەگجار دەگمەن، ئەگەر بۆ جارێکیش بێت پێویستی بە پزیشك و نەخۆشخانە نەبێت. ئەگەر بۆ خۆشی نەبیّ. خێزان و منالّی، دایك و باوکی، خزم و دراوسیّ و دۆستی پێویستی دەبیّ. ئەم هاودەم و هاوڕێی دەبیّ و ئاشنا دەبیّ بە نەخۆشخانە و پزیشك.

جالێرەدا دەوری گرنگ و گرانی پزیشك دەردەکەوێت، کە هەموو کەس پێویستی پێی دەبێت.. ئەویش چاری ناچارە کە دەبیّ هەڵسوکەوت لەگەڵ جۆرەها کەسایەتیدا بکات.

بانگخواز و مامۆستای زانکۆ (د.محمد العریفی) دەفەرموویێت: دانیشتبووم و زۆر بیرم دەکردەوە لە حالّی پزیشك لەگەڵ نەخۆشەکانیدا، هەروەها بەراوردکردنی پیشەی پزیشکی لەگەڵ کاروپیشەکانی تردا، زانیم کە مامۆستا هەڵسوکەوت لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکی دیاریکراودا دەکات. کەلەبۆچون و هەڵسوکەوت و مامەڵەیاندا تارادەیەك لێك نزیکن، هەروەها زۆریش لەگەڵیاندا هیلاك و ماندوو نابێت.. هەروەها ئەندازیاریش لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکی ئاست لەیەك نزیکدا هەڵسوکەوت دەکات. لەبەرئەوە زۆر بیروهۆشی

ماندو نابێت. هەروەها خاوەن پیشەکانی تریش بەهەمان شێوە، وەکو فڕۆکەوان و وەستای دروستکردنی خانوو بەرە و ئاسنگەر و دارتاش و.. هەروەها.

بەڵام پزیشك لە نۆڕینگە ـ عیادە ـ کەی دادەنیشێت و نەخۆش دێتە ژوورەوە بۆلای.. نەخۆش هەیە زیرەکە و زوو لە مەبەستی پزیشك تێدەگات و پزیشکیش تێدەگات. هەیانە بە ئاسانی تێناگات و خۆی و پزیشکیش ماندوو دەکات.. لێت تێناگەم !! نا.. تۆ لە مەبەستی من تێنەگەیشتیت !! زیاتر بۆم ڕوونبکەرەوە!!

هەیانە گومانی خراپ بە پزیشك دەبات و بە قسەکانی خەریکی دەکات، ئەوە چی یە؟! لە خودا بترسە و ماڵ و سامانم لەدەرمان و دەرزیدا بەفیڕۆ مەدە، ئەو هەموو پشکنینە چی یە؟! تۆ دانیشتوی و دزیمان لێ دەکەیت!

هەشیانە گومانی باش بە دکتۆر دەبات.

نەخۆشی واهەیە توڕەیە و بە قسەکانی پزیشك بێتاقەت دەکات، وەك: دەڵێت: تۆ تێناگەیت! چەندجار دەرمانت بۆ نوسیم و چاك نەبوومەوە؟! ئەگەر نازانی چارەسەری نەخۆش بکەیت عیادەکەت دابخە..

هەیانە زۆر نەرم و نیان و لەسەر خۆیە.. هەیانە بەخشندەیە، هەیانە ڕەزیلە، هەیانە گەورە و بەتەمەنە و هەیانە بچوك و مناڵە. هەیانە دەوڵەمەندە و هەیانە هەژارە. کەواتە: پێویستە پزیشك لە

هەڵسوکەوتیدا خۆی بگونجێنێت لەگەڵ هەر یەکێکیاندا، لەکاتی چارەسەری نەخۆشدا ئارامبگرێت. بەتایبەت لەگەڵ کەسە بەتەمەنەکاندا وەك ڕێزێك بۆیان. هەروەها لەگەڵ منداڵدا وەك بەزەییەك بۆیان.. هەروەها لەگەڵ لێقەوماوانی ڕوداوە کتوپڕەکاندا وەك سۆزێك بۆیان.

ئیمانی بە حەقیقەتی ئەو فەرموودە زێڕینەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەبێت کە دەفەرمووێت: ئەو ئیماندارەی کە تێکەڵی خەڵکی دەبێت و لەسەر ئازار و ناڕەحەتیەکانیان ئارام دەگرێت، لەلای خوای پەروەردگار چاکتر و خۆشەویسترە لەو ئیماندارەی کە تێکەڵی خەڵکی نابێت و ئارام ناگرێت..

بەڵێ کاری پزیشك کارێکی پیرۆزە، عیسا پێغەمبەر ـ علیه السَّلام ـ چارەسەری خەڵکی دەکرد، چاوی نابینا و نەخۆشی بەڵەکی چاك دەکردەوە، بەڵکو بەیارمەتی خوا مردووشی زیندوو دەکردەوە !



پزیشکی کارێکی زۆر پیرۆزە، پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکات:

**١) پاراستنی نهێنی یەکانی نەخۆش:**

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (**مَنْ سَتَرَ مُسْلِماً سَتَرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنيا وَالآخِرَةِ**) رَواهُ مُسْلِم. واتە: هەرکەسێك کەموکوڕی موسڵمانێك بپۆشێت، ئەوا خوای گەورە کەموکوڕیەکانی لە دونیا و قیامەتدا دەپۆشێت.

بەڵێ، هەندێ کەس بەهۆی کاروپیشەکانیانەوە نهێنی کەسانی تر دەکەوێتە بەرچاویان، وەك پزیشك، یان ئەو کەسانەی موفتی و شارەزای ئاینن، ئەم کەسانە نهێنی خەڵکان بپارێزن، تەنها کاتێك نەبێت کە خاوەنی نهێنی یەکە ڕێگە بە بڵاوبونەوەی نهێنیەکە بدات.

بەڵام دروستە لەبەرژەوەندی گشتی نهێنی ئاشکرا بکرێت. وەك ئاگادار کردنەوەی لایەنی پەیوەندیدار بەوەی کە نەخۆشەکە توشی نەخۆشی یەك بووە کە تەشەنە دەکات.. یان یەکێك لە ژن و مێرد ئاگادار بکاتەوە، لەو کاتەدا کە ئەوی تریان توشی نەخۆشی یەکی ڕەگەزی بۆبێت وەك ئایدز.

## ٢) بەکارنەهێنانی کارەکەی بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی:

(د. محمد العریفی) دەفەرمووێ: ڕۆژێك لەدوای پێشکەشکردنی وتار و ئامۆژگاریەك، دەرچوم بڕۆم، کەسێك هات بۆلام و گوتی: یا شێخ من بەرپرسم لە کۆمپانیایەکی گەورەی بەرهەمهێنان و دابەشکردنی دەرمان، کۆمپانیاکە بە ملیۆنەها ڕیاڵ خەرج دەکات بۆ پڕوپاگەندەی بانگەشەی فرۆشتن، ساڵانە ملیۆنێك ڕیاڵ لە ژێر دەستی مندا دادەنێن بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ پزیشکەکاندا!!

وتم: چۆن؟! وتی: نمونەیەك لە بەرهەمەکانمان بۆ پزیشك دەنێرین، هەروەها دیاری وەك کاتژمێر و قەڵەم و شتی تریشی لەگەڵدا دەنێرین. یاخود ئەرك و خەرجی ئامادەبونی لە کۆنگرە پزیشکیەکاندا دەگرینە ئەستۆ. یان ئەرك و خەرجی خۆی و ماڵ و منداڵی بۆ گەشت و گوزار دەگرینە ئەستۆ.. هەرکاتێك ئەو نەخۆشخانەیەی کە پزیشکەکە کاری تێدا دەکات، بەرهەمەکانی ئێمەیان زیاد بەکارهێنا، ئەوا دەزانین ئەو پزیشکە زیاتر دەرمانەکانی ئێمە بۆ نەخۆشەکان دەنوسێت. ئێمەش زیاتر دیاری بۆ دەنێرین!!

بە گشتی ئێمە ڕێگای تایبەتی خۆمان هەیە بۆ ناسینی پزیشکی چالاك! پێم وت: ئایا یارمەتیدانتان بۆ پزیشکەکان زەرەر و زیان لە

نەخۆشەکان دەدات؟! وتی: پزیشکەکە، کەدەرمانەکانی ئێمە بۆ نەخۆشەکان دەنوسێت، بەهۆی ئەو دیاریانەوە نرخی دەرمانەکان بەرز دەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پزیشکەکە دەتوانێت دەرمانی کۆمپانیایەکی تری بۆ بەکاربهێنێت، کە دەرمانەکە هەمان کاریگەری هەیە و نرخەکەشی کەمترە.

هەروەها وتی: جاری واهەیە پزیشکەکە کۆمەڵە دەرمانێك بۆ نەخۆش دەنوسێت، کە زەرور و پێویست نین، وەك دەرمانی هێورکەرەوە و ڤیتامینات، لەگەڵ ئەوەی زۆربەی جار نەخۆشەکان پێویستیان پێیان نییە. بەڵام بۆئەوەیە کە ئێمەش و پزیشکەکەش سودمەندبین!

وتم: قوربانیەکەش نەخۆشی هەژارە و پارە و سامانەکەش عارەقی ناوچاوانیەتی؟!

وتی: بەڵێ، بەڵام نەخۆش چاری نی یە و دەبێت دەرمان بکڕێت، ئێمەش وای لێدەکەین کە تەنها لە ئێمەی بکڕێت، وتم: بەڵام پارەیەکی زیاتر دەدات بۆ کڕینی دەرمانەکانتان، کڕینی هەندێ دەرمان کە پێویستیان پێیان نی یە و ئێوەی پێ سودمەند دەبن، وانی یە؟! وتی: بەڵێ وایە.

لێرەوە دەتوانین بەڕاشکاوی بە خوشك و برا پزیشکەکانم بڵێم: ئەو تاوانەی کە هەندێ لە کۆمپانیاکانی دەرمان دەیکەن، پێویستە

بە دەم داواکاریەکانیانەوە نەچن و هاوکاریان نەکەن، بەڵکو دەبێت بەرەنگاریشی ببنەوە، هەندێك لە کۆمپانیاکانی دەرمان، وەسفێکی زۆر سەیر و سەمەرەی دەرمانەکانیان دەکەن و دەیدەن بە پزیشکەکان، بەڵام پزیشکی زیرەك زیادەڕەوی ناڕاست و وەسفی زۆری دەرمانەکان کارناکەنە سەری، لە دڵسۆزی و ڕاستگۆیی پزیشك ئەوەیە کە دەرمانی باش بەکاربهێنێت بۆ نەخۆش. ئەگەر دەرمانەکە هی کۆمپانیایەکیش بێت کە پەیوەندیشی لەگەڵدا نەبێت. یان ئەگەر هی ئەو کۆمپانیایەش نەبێت کە دیاری پێدەدات، یان پەیمانی پێداوە کە گەشتی دەرەوەی وڵاتی پیێ بکات و کرێی فڕۆکەکەی بۆ بدات.

جاری واهەیە دەرمانێك هی کۆمپانیایەکی جیاوازە و کاریگەری و باشی دەرمانەکەش هاوشێوەی دەرمانی کۆمپانیاکەی ترە، بەڵکو هەرزانتریشە، ئیتر بۆچی دەرمانە گرانەکە بۆ نەخۆش بەکاربهێنرێت؟! ئەمە ناپاکی و خیانەتە لە سپاردە و ئەمانەت، کەیەك دەرمانن و لە کاریگەریشیاندا هاوشێوەن.

## ٣) خۆبەکەم زانین لەبەرخوا و، نەرم و نیانی لە هەڵسوکەوتدا:

ئای نەخۆش چەند دڵخۆشە بەوەی کە دکتۆر قسەی نەرمی لەگەڵ بکات و ڕێزی بگریێ، دڵخۆشی بداتەوە کە بەویستی خوا چاك

دەبێتەوە. چەند جوانە پزیشك چارەسەری بواری دەروونی و جەستەیی نەخۆش بەیەکەوە بکات.

## دکتۆری دڵسۆز و بە ویژدان، کوڕی خەڵکی بەهی خۆی دەزانێت!

بەسەرهات

لە نەخۆشخانەیەکی فریاکەوتندا، پزیشکی نەشتەرگەری گەیشتە نەخۆشخانە، پاش ئەوەی پەیوەندیان پێوە کردبوو کە بەپەلە بگاتە نەخۆشخانە، بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکی کتوپڕ بۆ نەخۆشێك. پێش ئەوەی دکتۆر بچێتە هۆڵی نەشتەرگەریەوە، باوکی نەخۆشەکە چوە بەردەمی و هاواری کرد بەسەریدا و پێی وت: ئایا تۆ هەستت نی یە؟!

نازانی کوڕەکەم چەند حاڵی خراپە و بارودۆخی نەخۆشیەکەی مەترسیدارە، بۆ خێرا نەهاتی و ئەوەندە دواکەوتی؟!!

پزیشکەکە زۆر بە شێوەیەکی ئاسایی و بەبزەیەکی شەرمەزاریەوە وتی: هیوام وایە کەمێك هێور بیتەوە و ڕێگەم بدەی کارەکەی خۆم بکەم. دڵنیاشبە کوڕەکەت لەژێر چاودێری خوای گەورەدایە.

باوکی کوڕە نەخۆشەکە وەڵامی دایەوە: چەند سارد و ئاسایت برا، ئەگەر کوڕەکەی خۆت وابوایە و لەو حاڵەتەدا بوایە و ئاوا لە مەترسیدا بوایە، تو خوا ئاوا ئاسایی دەبوی؟! چەند ئاسانە ئامۆژگاری خەڵکی. پزیشکەکە هیچی تر وەڵامی باوکی

نەخۆشەکەی نەدایەوە و بەجێی هێشت و چوە ژوری نەشتەرگەریەوە..

پاش دوو کاتژمێر بەپەلە هاتە دەرەوە و بەباوکی نەخۆشەکەی وت: نەشتەرگەریەکە سەرکەوتوو بوو، سوپاس بۆ خوا کوڕەکەت سەلامەتە، بمبورە من کارێکی گەورە و گرنگی بەپەلەی ترم هەیە. ئیتر بەپەلە ڕۆیشت بەبێ ئەوەی چاوەڕێی هیچ قسە و وەڵامێکی باوکی نەخۆشەکە بێت. پاشان پەرستارەکە لە ژووری نەشتەرگەریەکە هاتە دەرەوە و باوکی کوڕەکە پێی وت: ئەم پزیشکە لەخۆبایی یە چییەتی؟ وابەبێ گوێدان ڕۆیشت و نەیهێشت دوو قسە و پرسیاری لێبکەم!

پەرستارەکە وتی: ئەمڕۆ کوڕی ئەو پزیشکە بەیانیەکەی زوو لە ڕووداوێکی دڵتەزێنی هاتوچۆدا کۆچی دوایی کردوە، بەلاّم لەگەڵ ئەو هەموو ناڕەحەتی و جەرگ سوتان و خەمە گەورەی خۆیدا، کە ئاگادارمان کرد کوڕەکەی تۆ لەمەترسیدایە و، ئەم نەشتەرگەریە قورسەش بەو نەبێ ناکرێ و، هیچ پزیشکێکی تر جگە لەو توانای ئەنجامدانی نی یە. یەکسەر جەنازەی کوڕەکەی خۆی بەجێهێشت و هات بۆ ئێرە!!

تۆش ئاوا پێشوازی و بەخێرهاتنت کرد!! بەلاّم ئەو بەدڵە گەورە و پیشە پیرۆزەکەی خۆی، کاری خۆی بە پشتیوانی خوا

بەسەرکەوتوویی ئەنجامدا و، بەپەلە گەڕایەوە بۆ بەخاك سپاردنی کوڕەکەی چونکە چاوەڕێی ئەویان دەکرد!!

ئیتر باوکی کوڕە نەخۆشەکە عەرەقی خەجاڵەتی و شەرمەزاری لێ هاتە خوارەوە و، گەورەیی دڵی ئەو پزیشکە خۆڕاگرە و بچوکی خۆی دەهاتە بەرچاو!. {ڕۆژنامەی باسك، ژ: ٥٢٣، ل١٢}.

## ٤) ڕەخنە نەگرتن لە پزیشکانی تر، لەبەرامبەر نەخۆشدا:

زۆرجار پزیشك هەوڵ و ماندووبون و تێکۆشانێکی زۆر دەدات و هیلاك و ماندوو دەبێت، هەتا دەگات بە شارەزاییەکی زۆر لە کارەکەیدا، لەگەڵ ئەمەشدا پێویست ناکات کە زۆر باس کارە جوان و باشەکانی خۆی بکات. یان باسی وردی و زیرەکی خۆی بکات. لەبەرامبەریشدا لەکاروپیشەی پزیشکە هاوڕێکانی کەم بکاتەوە، بۆ ڕاکێشانی نەخۆشی پزیشکەکانی تر. چەندجار نەخۆش لەناخ و دەروونەوە بێ ئومێد بووە لە دکتۆر و دەرمان، کاتێ کە لەلای پزیشکێ چارەسەری ناکرێ و دەچێتە لای پزیشکێکی تر، ئەم دکتۆرەیان یەکسەر دەڵێ: ئەو دەرمان و عیلاجانەی پێشوو هەمووی فڕێ بدە، تەنانەت تەماشایان ناکات و زۆرجار داوای پشکنینی تاقیگەی خۆی و ئەشیعەی تازە دەکات و، گوێ بەوانە نادات کە پزیشکی پێشوو بۆی وەرگرتووە، هەندێ جار پێشی

دەڵێ: بەڕاستی ئەو دەرمانانە نەك هەر سوودیان پێ نەگەیاندووی، بەڵكو زیاتر نەخۆشیان خستوی!!

ئیتر بەمە نەخۆش ورەی دەڕوخێ و متمانەی بە پزیشك كەم دەبێ. دەی چەند جوانە پزیشك بڵێ: ئەو دەرمانانە كاریگەری باشیان هەبوە و منیش هەندێكی ترت بۆ دەنوسم، بەویستی خوا ئەو كەمە نەخۆشیەی ترت كە ماوە بەیەگجاری چارەسەر دەبێت. وە پێویستە پزیشك ئەوە بزانێ كە ئەو عیلم و زانستەی فێری بووە فەزڵی خوایە و هی ئازایەتی خۆی نی یە و ئەمیش چەند شارەزا و پسپۆڕ بێت، بێگومان لەویش شارەزاتر هەیە. ﴿وَفَوۡقَ كُلِّ ذِي عِلۡمٍ عَلِيمٞ ٧٦﴾ یوسف.

## ٥) كاری پزیشكی و بانگەواز بۆ لای خوا و ڕێنمای نەخۆشەكان بۆ خواناسی و دینداری:

بەڵێ بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت لەبواری پزیشكیدا بانگەواز بكرێت بۆ بەرنامەی خودا و، نەخۆشەكانیش زەویەكی زۆر بە پیتن بۆ بانگەواز، لەبەرئەوەی پزیشك پەیوەندیەكی پتەو و بنەڕەتی لەگەڵ خەڵكیدا هەیە، هیچ كەسێك نیە نەخۆش نەكەوێت و پێویستی بە پزیشك نەبێت.

بۆیە دەبینین خەڵکی بەگەرم و گوڕیەوە پەلەدەکەن لە چونیان بۆلای پزیشك، بەهیوای شیفا و چاك بوونەوە. لەو پێناوەشدا پارەیەکی زۆر خەرج دەکەن، هەوڵیش دەدەن کە پەیوەندیەکی پتەو لەگەڵ پزیشکدا دروست بکەن، چونکە دەزانن کە پێویستیان پێیەتی.

دەی کەواتە: پێویستە پزیشك سود لەم هەلە وەربگرێت بۆ ئامۆژگاری کردنی ئافرەتێك تا ببێت بە باڵاپۆش، یان ئامۆژگاری کەسێك بکات کە دڵی باوك و دایکی دەڕەنجێنێت. یان کەسێك نوێژ ناکات، یان کەسێك کەوتۆتە نێو زەلکاوی تاوان و گوناهەوە.. ئامۆژگاری کردنی نەخۆش زۆر گرنگە، بەتایبەت لەبواری بیروباوەڕدا. لە نوشتە و دوعادا، نەخۆشیش زۆرجار لەبەرئەوەی لە حاڵەتێکی لاوازدایە، بەگوێی پزیشك دەکات و باوەڕی پێ دەکات. لەوانەیە بەهۆی تەنها ووشەیەکەوە کەسێك لە تاریکی تاوانەوە بەرێت بۆ ڕووناکی ئیمان.

یەکێك لەو ڕاپۆرتانەی کە بۆ بەگاورکردن داڕێژرابوو، تیایدا هاتبوو کە دەڵێت: (لەهەر شوێنێك مرۆڤ هەبوو، ئازار هەیە، کاتێك کە ئازار هەبوو، پێویستی بە بوون بە پزیشك سەر هەڵدەدات. کاتێکیش کە پێویستی بە پزیشك دێتە ئاراوە، ئالەوێدا هەلێکی گونجاوە بۆ بەگاورکردنی خەڵکی)..

ڕەحمەتی خوا لە ئیمامی شافیعی بێت کە دەفەرمووێت:

(موسڵمانان سێیەکی زانستیان لەدەستدا و دایان بەگاور و جولەکە و ئەوانیان کرد بە جێگری خۆیان!).

## ٦) ئەی پزیشکی بەڕێز ئاگاداربە و لەخوا غافڵ مەبە و شایەتی درۆ مەدە:

زۆرجار لایەنە حکومیەکان پشت بە ڕاپۆرتی پزیشکی دەبەستن، دەربارەی سەلماندن یان نەفی کردنی نەخۆشییەك بۆ پێدانی مۆڵەت بۆ فەرمانبەرەکانیان، یان خانەنشین کردنیان. یان پێدانی یارمەتی و هەروەها هەندێ کاری تر..

لەم کاتەدا لەسەر پزیشك پێویستە ڕاپۆرتەکەی لەسەر بنەمای ڕاستی و ڕاستگۆیی بنوسێت. پێویستە لە نزیکی و خزمایەتی و دۆستایەتی و خۆشەویستی وای لێ نەکات، کە ڕاپۆرت و شایەتی ناڕاست بدات. چونکە یەکێك لە گەورەترین تاوانەکان بریتی یە لە شایەتیدانی درۆ. هەروەکو لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە. ئەم ڕاپۆرتی پزیشکی یەش، هەر ناڕاستی یەکی تێدا بێ دەچێتە خانەی خیانەت و شایەتی درۆوە.

**٧) پزیشك پێویستە وا لەگەڵ پیشەکەی ڕەفتار بکات کە هەمیشە لەخێر و چاکەدایە:**

پێویستە واهەست بکات کارەکەی بە عیبادەت حیسابە، لەبەرئەوە دکتۆری بەڕێزی موسڵمان دەبێت وای دابنێیت، کە کاتی ڕۆژانە سەردانی نەخۆشەکان دەکات پاداشتی بۆ هەیە و خێری دەگات. چونکە هەر موسڵمانێك سەردانی نەخۆشێکی موسڵمان بکات و ببێتە هۆی دڵخۆشکردنی و سوك کردنی ئازار لەسەری، ئەوە لە میوە چنینی بەهەشتدایە هەتا دەگەڕێتەوە!

هەروەها لەگەڵ نەخۆشدا زەردەخەنە و ڕووی خۆش بێ، لەبەرئەوەی زەردەخەنە کردن و ڕووخۆشبوون بەڕووی موسڵماناندا خێر و چاکەیە. پاشان ڕێ نیشاندانی نەخۆش دەربارەی ئەو شتانەی پرسیاریان لێ دەکات و پێویستیان پێیانە، هەر کەسێکیش خەریکی جێبەجێ کردنی پێویستی موسڵمانێك بێت، خوای گەورە پێویستیەکانی بۆ جێبەجێ دەکات..

هەروەها پزیشك دەبێ یەقینی بەوە هەبێت کە مانەوەی لە ژووری ئێشك گرتندا بەتەنها و بەجێ هێشتنی ماڵ و منداڵ و کەس و کار، بەخێر و چاکە بزانێت و چاوەڕوانی پاداشتی خوای پەروەردگار بێت.

بەڵێ، کاری پزیشکی نابێ وەکو فەرمانبەرێکی موچەخۆر تەماشا بکرێت، بەڵکو بەنیەتی پاك و چاوەڕوانی پاداشتی خوایی

لەسەر ئەو خزمەتەی کە پێشکەش بە نەخۆشی دەکات، هەموو کاتەکانی ئەو پزیشك و پەرستار و برینپێچ و دەرمانساز و کارمەندانی تەندروستی بەگشتی، خوا پەرستی و چاکەیە.



## ٨) پەلە نەکردن لەزوو دیاری کردنی نەخۆشیدا:

نابێت نەخۆشی زوو دیاری بکرێت، هەروەها پەلە نەکردن لە دیاری کردنی دەرماندا، هەر پزیشکێك چارەسەری خەڵك بکات و شارەزایی تەواوی نەبێت، ئەوا لە ڕوودانی هەر کارەساتێك بەرپرسیار دەبێت.

**بەسەرهاتێك:** زانای ناودار (إبن الجوزی) لە کتێبی ـ زیرەکان ـ دا، ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: یەکێ لە پزیشکە متمانە پێکراوەکانی بۆمانی گێڕایەوە: کە پیاوێکی خەڵکی (بغداد) دەچێت بۆ شاری (ڕەی)، لە ڕێگادا نەخۆش دەکەوێت و خوێن هەڵدێنێتەوە، دەنێرێ بەدوای مامۆستای پایە بەرز و پزیشکی شارەزا و بەناوبانگ (ئەبوبەکری ڕازی)دا و، خوێنەکەی پیشان دەدا و باسی نەخۆشی یەکەی بۆ دەکات..

دکتۆر سەیری لێدانی دەمار و ڕەنگی میزی کرد و سەرنجی تەندروستی گرت، هیچ نیشانەیەکی نەخۆشی سیل و برینی گەدەی هەست پێ نەکرد و هیچ نەخۆشی یەکیشی بۆ نەدۆزرایەوە. داوای

لە نەخۆشەکە کرد پەلە نەکات تا بەچاکی سەرنجی حاڵی بگرێ.
بەڵام حاڵی جار لەدوای جار خراپتر ئەبوو، ئازاریشی زیاتر دەبوو، (ڕازی) بیری کردەوە.. پاشان هاتەوە بۆلای و پرسیاری کرد لە چ ئاوێك ئاوی خواردۆتەوە؟!

کە هەواڵی داپێی، ڕازی بە زیرەکی و بیرتیژیی خۆی لە دڵیدا ئەوە سەلما: کە زەروییەك لە ئاوەکەدا بوە و چۆتە گەدەیەوە و، ئەو خوێن هێنانەوەش ئەوەیە کە ئەو (زەروە) گاز لە دیواری گەدەی دەگرێت و خوێنی لێ دێنێ.. بۆیە وتی: بۆ بەیانی چارەسەرت دەکەم. بەڵام بەو مەرجەی فەرمان بە خزمەتکارەکانت بدەی، کە هەر فەرمانێکم بەسەریاندا دا بیبیستن..

وتی: بەڵێ، ڕازی هەڵسا و ڕۆشت دوو مەرکانەی ئاو هێنان و هەردووکیانی لە قەوزە پڕکرد و بۆ بەیانی هێنانی و بە نەخۆشەکەی وت: ئەبێ هەرچی قەوزە وا لەم دوانەدا هەیە قوتی بدەی!! نەخۆشەکە کەمێکی لێ قوتدا و پاشان وەستا.

وتی: قوتی بدە، وتی: ناتوانم، بەخزمەتکارەکانی وت: بیبەن و پاڵی بخەن. ئەوانیش بردیان و خستیان و پەپشتا و دەمیان دادڕیی، ڕازیش هات و قەوزەی ئەکرد بەدەمیا و بەزۆر ئەی شێلا و فەرمانی بەسەردا دەدا قوتی بدا و هەڕەشەشی لێ دەکرد، تائەوەبوو بە ناچاری قەوزەی ناو مەرکانەیەکیانی کرد بە دەمیەوە و کابراش هەر هاواری بوو!!

دوای ئەوە دڵی تێکچوو پاشان ڕشایەوە و ڕازی سەرنجی دا وا ئەڵقەیەك وەك کرم وا لەگەڵ ڕشانەوەکەیدا هاتۆتە دەرەوە!! دوای ئەوە نەخۆشەکە هەستایەوە و چاك بۆوە!. {زیرەکان، إبن الجوزی، و: حبیب محمد سعید، ل٨١}.

## زیرەکی دکتۆرێك!

بەڵێ پزیشکی لێهاتوو، ئەوەندە ئەزمون لەسەر نەخۆش و نەخۆشی کۆدەکاتەوە، کە بەچاوپێکەوتنی ڕوخساری نەخۆش لەزۆر بواری نەخۆشەکە حاڵی دەبێت. تەنانەت لەم بارەیەوە شتی سەیروسەمەرە لەناو پزیشکاندا دەگێڕنەوە: یەکێ لەو بەسەرهاتانە پێشەوا (إبن الجوزی) لە کتێبەکەیدا (الأذکیاء) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ: ئەبولحەسەن مەهدی قەزوێنی بۆمانی گێڕایەوە و وتی:

دکتۆرێکمان لەلابوو کەناوی (ئیبن نوح) بوو، منیش توشی سەکتە (زمان بەستران)ێك بووم، ئیتر کەسوکارەکەم گومانیان نەما لە مردنم، ئەوە بوو شۆردمیان و کفنیان کردم و لەدارجەنازەدا بەسەر شان هەڵیان گرتم!!

لەو کاتەدا کە ئافرەتان بەدوامەوە شیوەنیان دەکرد، جەنازەکەم بەلای ئەو دکتۆرەدا تێپەڕی کردوە و، ئەویش بە خەڵکەکە دەڵێ: ئەم کەسە زیندوە و لێم گەڕێن با چارەسەری بکەم. خەڵکەکەش هەموو هاوار دەکەن بە سەریاو، هەندێ کەسیش

بە کەسوکاری مردوەکەیان وت: وازی لیّ بێنن باچارەسەری بکات.
ئەگەر چاك بۆوە ئەوا چاکە و ئەگەر نا هیچ زیانێکتان لیّ ناکەویّ..

وتیان: دەترسین حەیامان بچێت! وتی: ئەوە لەسەر خۆم.

وتیان: ئەی ئەگەر عەیبەمان بەسەردا هات؟ وتی: سوڵتان فەرمانم بۆ دەربکات، بەڵام ئەی ئەگەر چاك بۆوە؟!

وتیان: هەرچیت بوێت.. وتی: خوێنی پیاوێك. وتیان: ئەوەمان لەدەستدا نیە. بەڵیّ دکتۆر لەگەڵ کەسوکارەکەمدا لەسەر مەبلەغێك ڕێك کەوتن، هەڵیگرتم و بردمیە حەمامەوە و دەستی بە چارەسەرم کرد، تا ئەوەبوو دوای بیست و چوار سەعات چاوم کردەوە و موژدە بە کەسوکارم درا و پارەکەی پێدرا و چاك بومەوە!!

دوای ئەوە بەدکتۆرم وت: ئەمەت چۆن زانی؟!

وتی: کە چاوم بە هەردوو پێت کەوت لەناو کفنەکەدا قنج وەستابوون، یەکسەر بیرم لەوە کردەوە کە تۆ نەمردوی، چونکە پێی مردوو پاڵ دەکەون و نابیّ قنج بوەستن، بەوەدا زانیم کە تۆ زیندویت و وام دانا کە لەزمان کەوتویت، جا بەتاقیکردنەوەت بۆم سەلما کەوایە و بەڕاستی بۆچونەکەم دەرکەوت!..{زیرەکان، حبیب محمد سعید، ل٨٣}.

**٩) نابێ پزیشك بەبێ پسپۆڕی، نەخۆشی دیاری بکات:**

ئەگەر پزیشك زانستی پێ نەبوو لەو بوارەدا کە نەخۆشێکی دیاریکراو دەچێتە لای، دەبێ شەرم نەکات و ڕاشکاوانە بڵێ: من لەم نەخۆشیەی تۆدا پسپۆڕ نیم و ئەوە کاری فلان دکتۆرە. کە بەڕاستی ئەم لایەنە لە وڵاتی ئێمەدا کەمتەرخەمی پێوە دیارە و، دەبینی لەسەر عیادەی زۆر پزیشك نوسراوە، پزیشکی گشتی، یان نەشتەرگەری گشتی!!

کە بەڕاستی پێویستە بوارەکان لە یەکتری جیابکرێنەوە، تەنانەت پێویستە پسپۆڕیەکان ورد بکرێنەوە. بۆ نمونە: ڕاستە قورگ و لوت و گوێ پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە. بەڵام چاکترە بوترێ ئەم پزیشکە پسپۆڕە لەبواری تەنها گوێدا، نەك بنوسرێ قورگ و لوت و گوێ!

هەروەها لەبواری چاودا. ڕاستە چاو هەمووی یەك ئەندامە، بەڵام پێویستە لەجیاتی بوترێ فلان دکتۆر پسپۆڕی چاوە. بوترێ پسپۆڕە لەبواری گلێنەی چاودا، شەبەکەی چاودا، پێڵوی چاودا، یان لەبواری چاوکزیدا، یاخود پسپۆڕی نەشتەرگەری چاوە.. ئەو کاتە نەخۆش دەزانێ ڕووبکاتە کێ و، دکتۆریش لەبوارەکەی خۆیدا ئەزمونی زیاتر بەدەست دێنێ و، وردتر دەبێ و داهێنانی زیاتری دەبێ! هەربۆیە وەرگرتنی پسپۆڕی تایبەت لەیەك بەشی تایبەتدا زۆر گرنگە. هەر لەم خاڵەشدا پێویستە ئەوەش باس بکەین کە

ئەمڕۆ دکتۆری لاکۆلآن زۆربووە، هی واهەیە یاریدەدەری پزیشکە و پەیمانگای تەواو کردووە، یان تەنها بەشی برینپێچی خوێندوە. کەچی عیادە و دەرمانخانەی کردۆتەوە و، بەهیچ نەخۆشیێ نالێ من لەمە نازانم و بڕۆ بۆلای پزیشکی پسپۆڕ. بەڵکو دەرمان بۆ هەموویان دەنوسیێ!

چەندین کەس لە ئەنجامی خواردنی دەرمانی ئەمانەدا، توشی نەخۆشی گەورە و گران بووە. کە لەسەرەتادا نەخۆشییەکی سادەی هەبوە، بەلاّم ئەم بەناو دکتۆرە ئەوەندەی دەرزی و دەرمان داوە بەم داماوە، نەخۆشی خستوە و لەماڵ و گیانی خستوە!!

یاخود کەسانێك پەیدا بوون، بەبێ هیچ شارەزایی و ئەزمونێکی پێشتر، یان خوێندنێك، نەخۆش بە دەرمانی گیایی چارەسەر دەکەن. کە زۆرجار زەرەری زۆر لە قازانجی زیاترە، چونکە لە ڕێی زانستیەوە ئەم کارە ناکەن. کە بەڕاستی پێویستە وەزارەتی تەندروستی لێپێچینەوە لەم کەسانە بکات!.

لێرەدا دەبێ ئەو ڕاستییە بڵێین کە: پزیشکی میللی و چارەسەر بە گژوگیا شتێکی چاکە و بەسودە، ئەگەر لەسەر بنەمای زانین و ئەزمون و پێشینەی لەمێژینەی ئەم کارەوە بێت و، گەلێ کەس سودی لێ بینیوە و بەویستی خوای گەورە شیفای نەخۆشی یەکەی بۆ هاتووە.

**بەسەرهاتێك:**

(بشیری کوڕی فەضل) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: جارێکیان لەسەفەری حەجدا بوین، لەڕێگادا گەیشتینە ئاواییەك کە باسی سێ ئافرەتیان کرد، کە خوشکن و هەرسێکیان خەریکی دەرمان کردن و چارەسەری نەخۆشن بە گژوگیا و دەرمانی گیایی خۆماڵی. ئێمەش وەکو ناومان بیستن و باسی شارەزاییان لە پزیشکی دا سەرنجی ڕاکێشاین، ویستمان لە نزیکەوە بیان بینین و تاقیان بکەینەوە. بۆیە بەچیلکەیەکی ئەو دەشتە قاچی یەکێ لە هاوەڵەکانمان ڕوشاند هەتا خوێنی لێهات، ئەمجا بەدەست هەڵمان گرت و وتمان: ئەمە مار گەستویەتی ئایا کەسێك هەیە چارەسەری بکات؟

کچە بچوکەکەیان هاتە دەرەوە و هاتە سەری و سەرنجی داو وتی: ئەمە مار نەیگەستوە ! !

وتمان: چۆن؟ !

وتی: چونکە چیلکەیەك زامداری کردووە کە ماری نێرینە میزی کردوە بەسەریدا، بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستی قسەکەم، بەیانی کە خۆرهەڵهات دەمرێت. مەگەر ئەجەلی نەهاتبێ! !

بەڵێ، کەخۆری ڕۆژی داهاتوو هەڵهات مرد و ئێمەش یەکجار سەرسام بوین!. {زیرەکان، حبیب محمد سعید، ل٨٤}.

### ١٠) ئەی پزیشك سوپاسی خوا بکە، بەرزترین کۆلێژت تەواو کردوە!

ئەی پزیشکی بەرێز لەخوا غافڵ مەبە و هەمیشە سوپاسی خوای گەورە بکە، کە لەناو ئەو هەموو خوێندکارەی هاورێتدا کە ساڵانێکی زۆر بەیەکەوە خوێندوتانە، تۆ بویت بە پزیشك و بەرزترین کۆلێژت تەواو کردوە. ئەمە بە فەزڵی خوا بزانە و شوکرانەی بکەو، شوکرانە بژێریشت بەرامبەر بە خوای باڵادەست، بابەوە بێت کە یارمەتی ئەو کەسانە بدە کە ڕۆژێ لەکاتی خوێندکاری و هەژاریتدا هاوکارت بوون، بە قسەیەك هاندەرت بوون، ئەمڕۆ ئەوانە دێنە بەردەستی تۆ، تۆش قۆڵی مەردایەتی لێ هەڵبکە و قەرەبووی چاکەکانیان بۆ بکەوە، نەك خوا نەکردە خۆیان لێ نەناسیاو بکەیت.

**بەسەرهاتێك:** کوڕێکی هەژار بۆ دابین کردنی خەرجی خوێندنەکەی دەست گێڕی دەکرد و، بە کۆڵان و شەقامەکاندا دەسوڕایەوە و شتی دەفرۆشت. ڕۆژێك برسیەتی زۆری بۆ هێنا بۆیە لەدەرگای نزیکترین ماڵی دا، کچێك دەرگاکەی لێکردەوە و فەرمووی لێکرد، جل و بەرگی هەژارانەی کچەکە برسیەتی لەبیربردەوە! بۆیە داوای پەرداخێك ئاوی کرد، بەڵام کچەکە هەستی بە ڕووخساری برسی کوڕەکە کرد و پەرداخێك شیری بۆ

هێنا، كوڕەكە سوپاسی كرد و ویستی پارەی شیرەكە بدات بەڵام كچەكە وتی: دایكم واپەروەردەی كردووم كە لەبەرامبەر كاری چاكەدا هیچ وەرنەگرم!.

سالْ هات و سالْ ڕۆیشت كچەكە تووشی نەخۆشیەكی كوشندەی زۆر دەگمەن بوو، ڕەوانەی نەخۆشخانەی پایتەخت كرا، خرایە بەردەستی پزیشكێك بەناوی (د.هاوەرد كیلْی)، كە مەلەفی نەخۆشەكەی هاتە بەردەست و ناوی شارۆچكەكەی دیت، خورپەیەك بەدلْیدا هات و چووە ژوری نەخۆشەكە و بە دیتنی ڕوخساری و ناوی و شوێنی مالْەكەیان، تەواوی ڕووداوی پەرداخە شیرەكەی بیرهاتەوە!

چەند مانگێك كچەكە لە نەخۆشخانەكەدا مایەوە، (دكتۆر هاوەرد) تەواوی هەولْی خۆی خستە گەڕ بۆ چارەسەركردنی، بەبێ ئەوەی خۆی ئاشكرا بكات.. دوای تەواو چاك بوونەوە، ڕۆژی چوونە دەرەوەی لە نەخۆشخانە، دكتۆر هاوەرد داوایكرد مەلەفی ئەو كچەی بۆ بهێنن. لە ژێرەوەی مەلەفەكە نوسی: پارەی چەند مانگی مانەوەی ئەو نەخۆشە لەبەرامبەر پەرداخێك شیر واصل كراوە!

كاتێك كچەكە مەلەفەكەی وەرگرتەوە لە ترسی زۆری پارەی خەرجی نەخۆشخانەكە نەیدەوێرا سەیری ناوەوەی بكات. لەدلْی خۆیدا دەیگوت: ئەبێ چەند سالْ كارەكەری مالاْن بكەم تاوەكو ئەو

پارەیە دەدەمەوە حکومەت؟! بەلآم کاتیٚ تەماشای کرد و تێبینی دکتۆرەکەی خوێندەوە، سوپاسی خوای کرد بەرامبەر ئامۆژگاریەکانی دایکی و هەستی مرۆڤە ویژدان زیندوەکان.
{گۆڤاری متمانە، ژ: ٣٦، ل٣٩}.

**دکتۆر دەتوانێت زۆرترین چاکە بکات!**

بەڵیٚ ئەی پزیشکی بەڕێز، کە خوای گەورە ئەو خەلآتە گەورەی داوە پێت و ئەو زانستەی پیٚ بەخشیوی، وەرە زەکاتی زانست و شەهادەکەت بدە، وەرە وەکو چۆن لەپارە و ساماندا (چل یەك) دەدریٚ. تۆش با لە چل نەخۆش کە پارەیان لیٚ وەردەگری و حەقی خۆتە، بایەکیان کە هەژار و نەدارە و گیرفانی بەتاڵە و نەخۆشیەکەی درێژخایەنە، باپارەی عیادەکەت لەو وەرنەگری و، عەمەلیات و چارەسەری بەخۆڕایی بکەی. کە سوپاس بۆ خوا پزیشکی موسڵمان و بەهەڵوێستی لەو جۆرەمان زۆرە، خوای گەورە پاداشتیان بداتەوە.

بەلآم: ئامان ئاگاداربە لەخوا غافلٚ نەبی، بلٚێی جا من حەقم چیە بەسەر هەژاری و نەداری نەخۆشەوە، ئەوە کەی کێشەی منە، نەخێر دلٚنیابە ئەگەر تۆ بەزەیی و ڕەحمت بەدلٚدا نەبیٚ و، گیانی هاوکاری و یارمەتیدانت تێدا نەبیٚ بەرامبەر بە فەقیر و هەژاران، ئەوە ڕۆژێك دادیٚ تۆش لەو مەکانەت و پێگەیەتدا نامێنیتەوە و توشی نەدامەتی دەبیت.

**بەسەرهاتێك:**

بانگخواز و نوسەری ناودار، (د.محمد راتب النابلُسی) لە كتێبە بەناوبانگەكەیدا (موسُوعَة أسْماء الله الحُسْنی) لە ج١ ص١٨٥دا، دەفەرمووێ: حەفتا هەشتا ساڵێك لەمەوبەر، لە دیمەشقی سوریا، دكتۆرێكی پیاو هەبوو، ئەم پزیشكە هەرچەندە پیاو بوو، بەڵام پسپۆڕیەكەی لەبواری ژنان و منداڵبوندا بوو. جگە لەو لەشاری دیمەشق و دەوروبەریدا هیچ دكتۆرێكی بواری ژنان نەبوو!

جا ئەم پزیشكە ئەمەی بەهەل دەزانی و هەر كاتێ ئافرەتێك پێوستی پزیشكی هەبوایە و، نەیتوانیایە بەپێی خوای بێت بۆ عیادەكەی و ئەم بچوایە بۆ ماڵیان، دەبوایە هاوسەری ژنەكە عەرەبانەیەكی بۆ بەكرێ بگرتایە، كە وەكو تەكسی ئێستا وابووە، وە لیرەیەكیشی بدایە، حەقی ئەوەی كە دكتۆر ئەو ماوەیە عیادەكەی بەجێهێشتووە و لەماڵی نەخۆش نەخۆشەكەی بینیوە، ئەمە بێجگە لەپارەی دەرمان و حەق دەستی تایبەتی خۆشی!

ئەمجا هەر چەندە ماڵی نەخۆشەكە بپاڕانایەوە كە هەژارن و پارەیان نییە، دەیگوت: ئەوە گرفت و كێشەی خۆتانە، من حەقم بەسەر ئەوەوە نی یە هەتانە یان نا، بڕۆن قەرزی بكەن! بڕۆن شتێكی ماڵەكەتان بفرۆشن!

بەڵێ، (د.محمد راتب النابلُسی) كە ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە، دەفەرمووێ: بۆیان باسكردوم كە ئافرەتی نەخۆشی

وا هەبووە، کە ڕاخەری ژێر نەخۆشەکەیان فرۆشتوە و نەخۆشەکەیان لەسەر زەوی ڕاکێشاوە، تەنها بۆئەوەی لیرەکەی بۆ پەیدا بکەن و دکتۆرەکە بێننە سەری و، ئەم ژنە داماوە لەو ئازارە ڕزگاری ببیّ!!

بەڵێ دوای چەندین ساڵ لە کاری پزیشکی و کۆکردنەوەی پارەیەکی زۆر، لە خۆشترین جێگای شاری دیمەشق، جوانترین و سەرنجڕاکێشترین خانووی کرد، ئەم کۆشکە هەتا ئێستاش لە دیمەشقی سوریا ماوە. بەڵێ کاتێ چووە ناو خانووە بێوێنەکەیەوە، سبحان الله هەر ئەو شەوەی کە چووە ناوی جەڵتەی دەماغ لێی دا و تووشی شەلەل بوو! ماوەیەکی کەم ژنەکەی خزمەتی کرد و بەدەوریەوە بوو، بەلآم کەزانی تازە ئومێدی چاك بونەوەی لێناکریّ، داوای لە منالەکانی کرد کە بیبەنە هەورەبانی خانوەکەیانەوە و خزمەتکارێکی بۆ بگرن کە خواردنی بداتێ و پاکی بکاتەوە!!

بەڵێ ئەم پزیشکە کە بەو بێ ویژدانیە، تەواوی تەمەنی خۆی پارەی بۆ ژن و مندالەکانی کۆکردبۆوە، لەپێناوی ئەوەی زیاتر دەوڵەمەند بیّ و، کۆشك و تەلاری جوانتر و خواردنی خۆشتر بۆ ژن و منالەکەی ئامادە بکات. بەو هەموو زانستەی کە لەبواری پزیشکی ئافرەتاندا هەیبوو، تەنها یەك خزمەتیشی لەبەر خاتری خوا بە نەخۆشێکی هەژار نەکرد!!.

بۆیە وای دەزانی کە ژن و منداڵەکانی لەم نەخۆشیەدا لەسەر چاوی دادەنێن، بەلأم کە سەیری کرد وا خزمەتکاریان بۆ گرتووە و ژنەکەی ناچێ بەلایدا، داوای خێزانەکەی دەکرد.

خزمەتکارەکە هەموو جارێ لە هەورەبانەکەوە دەهاتە خوارەوە و، دەڕۆیشتەوە بۆ سەرەوە بۆلای و ڕووی نەدەهات بڵێ، دکتۆر گیان ژنەکەت دەڵێ حەزناکەم بیبینم!!

بۆیە دەیگوت: پێم وتووە بێت بۆلات، بەلأم نازانم بۆچی نایەت؟! تا دوای چەندین جار ئەم پزیشکە پەککەوتە تێگەشت کە ژنەکەی ئیتر ئامادە نییە لەلای بێت و، تەنانەت گوێی لە قسەی زۆر سارد و سوك بوو، کە ژنەکەی پێی دەوت و بێزاری خۆی لەم پەککەوتەیە دەردەبڕی!!

بەڵێ ئەم پزیشکە ماوەی هەشت ساڵ بەم شێوەیە مایەوە! تەواوی ئەو هەشت ساڵە تەنها ئەو کەسەی بە مانگانە وەکو خزمەتکار بە کرێیان گرتبوو، خواردن و خواردنەوەی دەدایە و پاکی دەکردەوە.. بۆیەك جاریش ژنەکەی و منداڵەکانی نەچونە لای قسەیەکی لەگەڵ بکەن! نەك هەرئەوە بەڵکو لەئەنجامی ئەو بۆگەنە ناخۆشەی کە لە لاشەی دەهات و، لە هەورەبانەکەوە بۆ ناو ماڵەکە دەگەڕایەوە، ژنەکەی بڕیاریدا ئەو بۆگەنە لەماڵەکەی دوربخاتەوە، ئەم خانوە پاك و بۆن خۆشە بەم بۆگەنیە پیس نەبێ. بۆیە

لەدووری ماڵی خۆیان خانویەكی بۆ بەكرێ گرت و لەگەڵ خزمەتكارەكە ناردیە ئەوێ!.

بەڵێ هەر ئەم خانوەی ئەم پزیشكە بەڕەنجی چەند ساڵەی و پارە كۆكردنەوەی لە ژنانی نەخۆشی هەژار دروستی كردبوو، ئێستا لێی دەكرێتە دەرەوە و نایانەوێ بەبۆنی لاشەی و ناڵە ناڵی شەوانی لەبەر ئازار، هێمنی و پشوویان تێك بچێ!!

سبحان الله، ئەو پزیشكەی كە بەزەیی بەژنێكی هەژاردا نەدەهاتەوە و، ڕاخەری ژێر نەخۆشەكەی پێ فرۆشتن بۆ وەرگرتنی لیرەیەك! ئەم دكتۆرە خۆپەرستە، ئەنانیە، بەوەی كە دەیزانی غەیری ئەو دكتۆری تر نیە تا خەڵكی بچنە لای، ئاوا خەڵكی نەخۆشی زەلیل دەكرد.

خوای گەورە ئاوا زەلیلی كرد، ئاوا ئەو كۆشك و تەلارەی كە بەو پارانە دروستی كرد، بوو بە حەسرەت و داخ و مەراق و ژوورێكیان پێ ڕەوا نەبینی و سەرەنجام هەورەبانەكەشیان پێ ڕەوا نەبینی كە بەنەخۆشی تێیدا بژێ هەر ئەو ژن و مناڵەی كە بۆ ئەوان پارەی كۆدەكردەوە، هەر بەدەستی ئەوان لە ماڵەكەی كرایە دەرەوە و، هەر بەو پارەیەی كە خەڵكی پێ زەلیل دەكرد، خوای گەورەش زەلیلی كرد و كردی بە پەند و عیبرەت بۆ هەركەسێ كە پەند وەرگرێ!. {خودپەسندی، فاتح شارستێنی، ل٢٢}.

## چەند ووشەیەك بۆ ئەوانەی لای نەخۆشن

هەندێك کەس کاتێك لای نەخۆشێکی نزیکیان دەبن، سۆز و بەزەیی بەسەریاندا زاڵ دەبێت، بەردەوام لە نەخۆشخانە لەگەڵ نەخۆشەکە دەبێت و، هەڵدەستێت بە خزمەتکردن و جێبەجێ کردنی پێویستیەکانی، هەندێك جار ئەم هاودەمی نەخۆشە شەو ناخەوێت، بەڵام نەخۆشەکە دەخەوێت..

شەونخونی ئیماندار، لەبەر برایەکی نەخۆش یان لەبەر خوشکێکی نەخۆشی موسڵمانی، هۆکارێکی گەورەیە بۆ نزیك بوونەوە لەخودای گەورە، خۆ ئەگەر نەخۆشەکە کەسێکی نزیکی بێت: وەك باوك یان دایك یان خوشك و برا، ئەوا بەدڵنیاییەوە پاداشتی گەورەتر دەبێت..

پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵمان پێدەدات و دەفەرمووێت: (هەر کەسێك سەردانی نەخۆشێك بکات، ئەوا بەردەوام وەکو ئەوە وایە خەریکی میوە چنین بێت لەبەهەشتدا، هەروەها حەفتا هەزار فریشتە داوای لێخۆشبونی بۆ دەکەن).

ئەم موژدە گەورەیە بۆ سەردان کردنی نەخۆشە، ئەی ئەگەر بەردەوام لەگەڵ نەخۆشەکەدا بێت و خزمەتی بکات؟!

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لەو کەسانەی کە لەلای نەخۆشن لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو هەموو پاداشت و چاکەیە بەهۆی هاودەمبونی

نەخۆشەوە کۆدەکەنەوە، پاشان بەهۆی چەند هەڵە و تاوانێکەوە بەفیڕۆی دەدەن!

## کاتمان لای نەخۆش چۆن بەسەر بەرین؟

هەموومان پێویستە بپرسین: ئایا ئەو کەسانەی لەلای نەخۆشن، کاتەکانیان لەچیدا بەسەر بەرن؟ لەوەڵامدا دەڵێین با کاتەکانیان بەم شێوەیە بەسەرببەن:

١) خوێندنەوەی بەسود، قورئان خوێندن بێت، یان کتێب و نوسراوی تری بەسوود.

٢) دوورکەوتنەوە لە ڕووبەڕووبوونەوە و چاوپێکەوتن لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەمدا، یان ئافرەتان لەگەڵ پیاوانی نامەحرەمدا، چونکە لەکاتی دەست بەتاڵیدا شەیتان دەست دەکات بەهاندانی خراپە و تاوان لەنێوان ئەو نامەحرەمانەدا. بەشێوەیەك کە بەڕوانینی نارەوا سەیری یەکتری بکەن. یان ژمارە تەلەفۆن و مۆبایلەکانیان بگۆڕنەوە و، سەرەنجام دوای دەرچون لە نەخۆشخانە توشی داوای بەناو خۆشەویستی و دەست بڕینی یەکتری دەبن!.

٣) چەند جوانە هاوەڵی نەخۆش کاتی خۆی لەشتی بەسووددا بەسەر بەرێت. بەڵکو وا لە نەخۆشەکەش بکات کە ئەویش لەشتی بەسووددا کاتەکانی بەسەر ببات. کاتەکانی لەخوداپەرستیدا بەسەر

بەرێت، کاسێتی بەسود و قورئان و ئامۆژگاری لە مۆبایلەکەتدا بێت. ئاگای لەکاتی نوێژەکان بێت و جێبەجێیان بکات. دورکەوێتەوە لە هەموو کارێك کە توشی تاوان و سەرپێچی خوای گەورە بکات.

٤) ئەی هاودەمی نەخۆش لەخوا غافڵ مەبە، ئارامگر و خۆڕاگربە، لەرزۆك و بیٚ ئارام مەبە، زۆرجار جێگەی سەرزەنشت نی یە ئەگەر گوێمان لە ئاهو ناڵەی نەخۆش بێت، چونکە زۆربەی مرۆڤەکان سنورێکی دیاریکراویان بۆ ئارامگرتنیان هەیە.

بەڵام جێگەی سەرسوڕمان ئەوەیە: کاتێك کەسێك دەبینی کە لەلای نەخۆشێکە و خەریکی گریانە و بیٚ ئارامە، لەگەڵ ئەوەدا کە چاوەڕوانی ئەوە لەو کەسە دەکرێت، کە نەخۆشەکە ئارام بکاتەوە و دڵی بداتەوە و، بێتە پێشەنگ لە ئارامگرتن و ڕەزامەندیدا بۆ نەخۆشەکە.

بەڵام لەحاڵی نەخۆشەکەوە زۆر نزیکە.. زۆرێك لە هاودەمانی نەخۆش و ئەو کەسانەی نەخۆشیان هەیە و لەلای نەخۆشەکەن یان سەردانی دەکەن، سکاڵای ئەوە دەکەن کە گریان و دڵتەنگی بەسەریاندا زاڵ دەبێت، منیش دەڵێم: بەڵیٚ ئەمە ڕاستە، بەڵام ئارامگرتن زۆر چاکتر و جوانترە بۆ خۆتان و، بۆ دڵ و دەروونی نەخۆشەکەش. چونکە ئەویش بەبینینی ڕوخساری پڕ لە خەم و چاوی پڕ لە فرمێسك، زیاتر ئازاری بۆ دروست دەبیٚ و لەوەرەی

دەڕوخێت. لەبەرئەوە بەسەر خۆتاندا زاڵ بن و نزا و پاڕانەوە بکەن و پەنا بۆ خوای گەورە بەرن. {شەیدا، و: هێمن محمد علی، ل٥٨}.

خوای گەورە شیفای هەموو نەخۆشیەکانمان بنێریٚ و پاداشتی گەورەی پزیشکە دڵسۆزەکان بداتەوە. آمین.



# وانەی بیست و پێنجەم:

## هێمنی و ئاسایش

## خەڵاتی خوایە مەیشێوێنەو

## لە خوا غافڵ مەبە

- بەشی یەکەم -

# وانەی بیست و پێنجەم

## بابەت: هێمنی و ئاسایش خەڵاتی خوایە مەیشێوێنە و لەخوا غافڵ مەبە

**- بەشی یەکەم -**

۞ **قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:** ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾﴾ النَّحل.

۞ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (المُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ المُسْلِمُونَ مِنْ لِسانِهِ وَيَدِهِ، وَالمُؤمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النّاس عَلى دِمائِهِمْ وَأَمْوالِهِمْ). صَحيحٌ ــ رَواهُ الترمذيُّ: (٢٦٢٧)، صَحيح الجامِع لِلْأَلْباني: (٧٦١٠).**

**سەرچاوەکان:**


١) البَشارات النَبَويَّة ـ صالح بن طه عبدالواحِد، ص١٧٥.

٢) تەفسیری زمناکۆیی، مەلا سەعیدی زمناکۆیی، ب١٢، ل٢٢٣. وە ب١، ل٣١٣.

٣) تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین، ل٤٠٩، ل٤٣.

٤) هەزار و یەك، ئەندازیار عثمان، ب٢، ل٣٤١، ل٢٩١.

٥) بالآنس، ئەندازیار عثمان، ل٩٨، ل٩٩.

٦) تەفسیری کوردی، مەلای گەورەی کۆیە، ب١، ل١٩٧.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ لله رَبِّ العالَمين. وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعينَ:

بەڕاستی خەڵات و بەخششەکانی خوای پەروەردگار بەسەرمانەوە ئەوەندە زۆرن، کە مرۆڤ ناتوانێ بیانژمێرێ و تەنانەت بیر لەهەمووشیان بکاتەوە. یەکێ لەو خەڵاتە هەرە گەورانەی کە خوا پێی بەخشیوین، بەڵام زۆرمان وەکو پێویست سوپاسی خوامان لەسەر نەکردووە، بریتیە لە خەڵاتی هێمنی و ئاسایش و ئەمن و ئەمان. لەدڵنیایی و ئاسودە ژیان بەبێ ترس و لەناو ماڵ و شار و وولاتی خۆتدا. کە بەڕاستی پێویستە مرۆڤ بەرامبەر بەم شاخەڵاتەی خوای گەورە هەمیشە سوپاس گوزاربێت و لەخوا غافڵ نەبێت..

## مانای ئارامی و ئەمان:

بەڵێ ئێمە کە باسی ئەمن و ئەمان و ئاسایش و دڵنیایی دەکەین، ڕەنگە زۆرمان بیرو خەیاڵمان هەر بۆ ئەوە بچێ، کە شەڕ و ئاژاوە و تەقە و تەقینەوە لە وڵاتدا نەبێت. بەڵێ ئەمە ڕاستە، بەڵام مانای ئەمن و ئەمان، مانای زۆر فراوانترە و لەچەند شتێکدا خۆی دەبینێتەوە:

### ١. ئەمن و ئاسایش لەناو جەستە و لاشەی خۆتدا:

بەڵێ گەورەترین سەلامەتی و ئاسایش وا لەناو جەستەی خۆتدایە، چونکە ئەگەر بتوانی ولاتی پڕ لە شەڕ و ئاژاوە بەجێ بهێڵی و بچیتە ولاتێکی ئەمین و ئارام، خۆ هەرگیز ناتوانی جەستەی خۆت و ناخی خۆت بەجێ بهێڵی و لێی ڕابکەی..

بۆیە گەورەترین بواری ئەمن و ئەمان، بریتیە لە ناو جەستە و ناخی خۆت. ئەویش بەوەی کە خوای گەورە بەلوتفی خۆی جەستەت بەساغی بهێڵێتەوە و، دوربی لە نەخۆشی لەناوبەر و پرۆکێنەر، کە لەبەر ئازار وات لێ بێ هەموو شیرینیەکانی ژیانت لێ تاڵ ببێ. هەروەها لەناو ناخ و دەرونیشتدا ئارام و دڵیابی، لە نەخۆشی نەفسی و دەرونی بەدوربیت، چونکە مرۆڤی واهەیە لە جەستەدا زۆر ساغ و سەلامەتە، بەڵام لە دەروندا وێرانە!

تەنانەت کەسی واهەیە ڕقی لە خودی خۆیەتی، کە بەڕاستی ئەمە کارەساتە، یان کەسی واهەیە لەگەڵ ئەوەدا کە لەهیچی کەم نی یە لەڕووی ماددیەوە، باشترین خۆراك دەخوات و گرانترین و جوانترین جلوبەرگ دەپۆشێ و لە خۆشترین خانوودا دەژی، کەچی هەمیشە دڵی توندە و خەمبارە و زەردەخەنە لە لێوی تۆراوە و، وائەزانێ دونیا لەگەڵیا لە جەنگایە و هەموو ئەوانەی لەدەوری دەژین نارەحەتن بەدەستیەوە. کەواتە: ئەگەر جەستەت ساغ بوو،

دەرونت سەلامەت بوو، دڵت خۆش و گوشاد بوو، ئەوە بەڕاستی تۆ لە ئەمن و ئەمانی ڕاستەقینەدا دەژی و، لەخوا غافڵ مەبە و شوکری خوای گەورە بکە.

### ٢. ئاسایش و سەلامەتی لەناو خێزانەکەی خۆتدا:

بەڵێ لەدوای جەستە و لاشە و دەرونی خۆت، گەورەترین ئاسایش و ئەمان: بریتیە لەوماڵەی کە دەبێ هەر تێیدا بژی، ناتوانی بەجێی بهێڵی و شوێنی حەوانەوە و ئارامگرتنە. بەڕاستی ماڵ و خێزانی پڕ لە ئاشتی و قەدر و حورمەت، دور لە شەڕ و ئاژاوە خەڵاتێکی گەورەی خوایە، بەرەکەتی خوایە..

بەڕاستی ئەگەر نانی شەوت نەبێ، نانی جۆ بخۆیت بە ئاوەوە، ئەگەر سفرەی نان خواردنت خواردنێکی هەست بزوێنی لەسەر نەبێ، لەبەر بێ جێگە و ڕێگەیی لەسەر خاك بخەوی و سەرینت بەردبێ، پارە و پولێکی دانراوت نەبێ، ناوت لەناو ناواندا دیار نەبێ، بەمەرجێ لەگەڵ ژن و منداڵەکەی خۆتدا تەبا و کۆك بی. حورمەت و ڕێزتان لەنێواندا بێ و بەخۆشەویستیەوە بەیەکەوە بژین، هەمیشە دەمە بۆڵە و پرتە و شەرە دەنوکتان نەبێ، ماڵێکی هێمن و ئارام لە ئامێزتان بگرێ و ماندوبون و خەم و پەژارەی دەرەوەی ماڵتان لەبیر بەرێتەوە.

بەڕاستی ئەوە تۆ پاشای و ماڵەکەت کۆشکە و قسەی خۆش و زەردەخەنە و خۆشەویستی نێوانتان، گەورەترین سفرە و خوانی ڕازاوەیە و دەوڵەمەندترین کەسی..

بەڵام خوانەکردە ئەگەر بەپێچەوانەوەبووی، لەکۆشك و ڤێلladا دەژیای، کام ئوتومبێلی گرانبەهایە لەژێرتابوو، ناوت دەنگی دابۆوە، پارەت هێندە زۆربوو خاوەنی چەند کارگە و کۆمپانیا بووی! لەشت ساغبوو، سفرەت ڕازاوە بوو، لەدەرەوەی ماڵ دۆست و هاوڕێت زۆربوو، ئەگەر لەناو ماڵەکەی خۆتدا ئاژاوەی خێزانیت هەبوو، هەمیشە شەڕ و فەرتەنە و بەگژیەکدا چوون و، دەنگ بەرزکردنەوە و پەلاماردانی یەکتر بوو، خۆشەویستی و ڕێز لەو ماڵە باری کردبوو، ئەوە بەڕاستی داماوترین مرۆڤ و هەژارترین خێزان ئەو ماڵ و خێزانە پڕ لە شەڕ و ئاژاوەیە..

بۆیە پێویستە لەسەرمان کە هەمیشە لەخوا بپاڕێینەوە و، داوای ئەوەی لێبکەین کە ماڵێکی بێ کێشە و ئاژاوەمان بداتێ، وە ئەگەر خوای گەورە ماڵێکی تەبا و پڕ لە ئاشتی پێ خەڵات کردین، لێی غافڵ نەبین و شوکری بکەین و بێ شەرعی تێدا نەکەین. هەر لە کەناڵی تەلەفزیۆنەکەتەوە تا قسە و باسی دونیای دانیشتنی نێوانتان، با دوربێ لەو شتانەی کە شەرع ڕێگەی پێ نەداوە، بۆئەوەی ئەم ماڵە پڕ لە بەختەوەریەت هەر ئارام بێ.

### ٣. شاری نیشتەجێبوونت پڕ لە ئاسایش و ئارامی بێت:

بەڵێ دوای جەستەی ئارام وماڵی پڕ لە ئاشتی و خۆشی، ئەمجا ئەو گەڕەك و گوند و شارەی كە تێیدا دەژی، ئەگەر ئەمن و ئارامی هەبێ و خەڵكێكی هێمن و دور لە شەڕی تێدابێ و، ناوبانگی بەشارێكی دور لە شەڕ و ئاژاوە ڕۆشتبێ و، دانیشتوانی دڵسۆزبن بۆیەكتر و بۆ شارەكەیان و ڕێز لە یەكتر بگرن، ئەوەش بەڕاستی جێگای خۆشحاڵی و سەرفرازی مرۆڤە.

هەریەك لە ئێمە بینیومانە و بیستومانە كە شار و دەڤەر و ناوچەی وامەیە: بەبیستنی ناوەكەی مرۆڤ وێنای شەڕ و چەك و كوشتن و تەقە لەیەك كردن و، ڕومانە و نارنجۆك فڕێدانە ناو ماڵی یەكتری، دێتە بەردیدە و ئەندێشەی! بۆیە ئەگەر كەسێك كە دانیشتوی ئەو شار و ناوچە و دەڤەرەیە، لەگەڵ ئەوەشدا كە لەژیانی خۆیدا مەلەفی لە پۆلیس و ئاسایش نەبووە، كێشەی لەگەڵ كەسدا نەبووە، كەچی هەر بەوەندەی كە خەڵكی ئەو شارەیە و نیشتەجێی ئەوێیە. خەڵكی شارێكی تر ئامادەنەبوون كچی خۆیانی بدەنێ!

ئەگەر چی كچەكەشیان دڵی بەو كوڕەوە بوبێ و بۆی سوتابێ، هەرچی كەموكوڕیش بێ لەو كوڕە باشەیان نەدۆزیوەتەوە، تەنها

ئەوە نەبێ کە خەڵکی فلاَن شوێن و ناوچەیە و خەڵکەکەی شەڕانی و بەئاژاوە و چەك هەڵگر و تورە و توندن! !.

هەر بۆیە پاراستنی ئەمن و ئاسایش و هێمنی ئەو گوند و شارەی لێی دەژین، لەئەستۆی هەموماندایە و، نابێ بڵێین: من حەقم نی یە و هەر کەس کەیفی خۆیەتی، چونکە خراپەی خراپەکاران و شەڕی شەڕخواز و شەڕفرۆشان، هەمومان دەگرێتەوە.. وەکو وتمان لانی هەرەکەمی ئەوەیە کە: ناوبانگمان پێی لەکەدار دەبێ و پێی ناشیرین دەبین لەلای خەڵکی.

هەر ئەمەشە حیکمەتی فەرمودە بەڕێز و بەپێزەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمووی: (**أُنْصُرْ أَخاكَ ظالماً أَوْ مَظْلُوماً، قالَ: يارَسُولَ اللهِ هذا نَنْصُرُهُ مَظْلُوماً، فَكَيْفَ نَنْصُرُهُ ظالماً؟! قالَ: تَأْخُذُ فَوْقَ يَدَيْهِ**). رَواهُ البُخاريُّ: (٢٤٤٤).

واتە: پشتیوانی لە براکەت بکە ئەگەر ستەمکار بێ یان ستەم لێکراوبێ، یەکسەر کەسێك پرسیاری کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باشە ئەگەر ستەم لێکراو و مەزڵوم بوو، پشتیوانی لێبکەم و داکۆکی لێ بکەم ئەمە بەجێیە و جوانە، بەلاَم ئەی ئەگەر ستەمکار و زاڵم بوو، چۆن پشتیوانی لێبکەم، چۆن پشتیوانی لە ستەمکار و زاڵم دەکرێ؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ستەمکار بوو هەردوو دەستی ببەستە و مەهێڵە ستەم بکات. ئەمەش یارمەتیدان و پشتیوانی کردنە بۆی.

**ڕوونكردنەوەيەك:**

بڕگەی یەکەمی ئەم فەرموودەیە: (**أَنْصُرْ أَخاكَ ظالِماً أَوْ مَظْلُوماً**)، ئەمە قسەی عەرەبی پێش ئیسلام بوو، کە هەمیشە ئەمە دروشمیان بوو، براکەی و خزمەکەی و هۆز و قەوم و عەشرەتەکەی ستەمکار بوایە یان ستەملێکراو، هەر پشتیوانی لێ دەکرد و لەسەری دەکردەوە و شەڕی لەسەر دەکرد، جا حەق بوایە یان ناحەق!

پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانی ئەم دروشمە چەندە کاریگەری هەیە لەسەر خەڵکەکە! بە درێژایی هەزاران ساڵە بەم یاسایە کاردەکەن، بۆیە یەکسەر ڕەتی نەکردەوە. بەڵکو وەریگرت و چاوەڕێی ئەوەش بوو کە لەلایەن موسڵمانێکی تێگەیشتوو لە ئیسلامەوە، پرسیار و ڕەخنەی ئاڕاستە بکرێ. بۆیە وەڵامی پرسیار کاری دایەوە و ئەم بڕگەیەی دواوەی بۆ زیاد کرد و ڕاستی کردەوە و فەرمووی: ئەگەر براکەت، خزمەکەت، هاوشاری و هۆز و قەوم و عەشیرەتەکەت، ستەمی لە خەڵك دەکرد و شەڕی بە خەڵك دەفرۆشت. ڕێگای بە خەڵکی دەگرت و ماڵی خەڵکی داگیر دەکرد. دەست درێژی دەکردە سەر خەڵکی..

ئەوا تۆ دەستی بگرە و مەنعی بکە، مەهێڵە لەسەر ئەم کارە ناڕەوایەی بەردەوام بێ و، کەسایەتی نەك هەر خۆی بەتەنها بەڵکو بنەماڵە و هۆز و قەوم و گوند و شارەکەشی پێوە ناشیرین ببێ،

وببێتە پەڵەیەکی ڕەش و ناشیرین بەنێو چەوان و تەوێڵی بنەماڵە و هۆز و دەڤەر و شارەکەیانەوە، بە هەمیشەیی و ناو و ناوبانگیان پێی لەکەدار ببێ، بۆیە فەرمووی: (تَأْخُذُ فَوْقَ يَدَيْهِ). دەستی بگرە و مەهێڵە ستەم بکا و سنوری بۆ دابنێ.

لەم فەرموودەیەوە ئەوەش تێدەگەین: کە دروستە کلتوری وڵاتانی کافر، یان کلتوری سەردەمی جاهیلی وەربگرین و بەپاشکۆیەك چاکسازی تێدا بکەین و بیکەین بە موڵکی موسڵمانان. بەڵێ، شاری هێمن و پڕ لە ئاسایش و دور لە شەڕ و ئاژاوە، خەڵاتی خوایە و دەبێ سوپاسی خوای لەسەر بکەین و بیپارێزین و دەستی شەڕانگێز و خراپەکاران بگرین.

## ٤. وڵاتی پڕ لە ئاسایش و دوور لە تەقینەوە و خوێن ڕشتن:

بەڵێ وڵاتی ئەمان و سەلامەت مایەی بەختەوەری مرۆڤە. لەبەرئەوەی ئەگەر تۆ لە ناخی خۆشتدا هیچ کێشە و گرفتێکی جەستەیی و دەرونیت نەبێ و، شادمان بی و لە ناو ماڵ و خێزانەکەتدا بەبەختەوەری بژی، لە ڕووی حورمەت و ڕێز و لەڕووی دارایی و ئابوریەوە خۆشگوزەران بی، وە شارەکەشت خەڵکی باش و چاك و پاك بن، بەڵام ئەگەر وڵاتەکەت شەڕ و ئاژاوەی تێکەوت.

ئیتر تۆش لەبەلای ئەو جەنگە بێ بەش نابی و، لانی هەرەکەمی دوکەڵی ئەو جەنگە ئەچێ بەدڵ و سینەتدا.

بۆیە لە قورئاندا خوای گەورە، وەکو خەلات و بەخشش بۆ مرۆڤ، باسی ولاتی پڕ ئەمانی کردووە و دەفەرمووێ: ﴿وَهَـٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ۝٣﴾ التين. واتە: سوێند ئەخۆم بەو شارەی خاوەنی ئاسایشە بۆ دانیشتوان.{تەفسیری زمناکۆیی، مەلا سەعیدی زمناکۆیی ب١٢، ل٢٢٣} .

هەر لەبارەی ولاتی ئەمین و دور لە شەڕ و جەنگەوە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ۝١١٢﴾ النّحل.

واتە: خوای گەورە نمونە دەهێنێتەوە بۆ ئەو شار و ولاتەی کە بەهرەمەندن لە ئاسایشی ولات و ڕزق و ڕۆزی فراوان، ئەوانە وەك دانیشتوانی شار و ولاتێکن کە ژیانیان بە ئارامی و ئاسودەیی دەبردە سەر{هەزار ڕەحمەت لە مەلای گەورەی کۆیەبێ کە لە تەفسیرەکەیدا دەفەرمووێ: ﴿ءَامِنَةً﴾ بەمانای ئەوەیە: ئەو ولاتە هێرشی دوژمنانی دەرەوەی لەسەر نەبوو، شەڕی لەگەڵ ولاتانی

دەرەکی نەبوو، ﴿مُّطْمَئِنَّةً﴾ بەمانای: لەناوخۆشدا جەنگی نەبوو، شەڕی نەگریس و ماڵ وێرانکەری ناوخۆی نەبوو} . لەگەڵ ئەو ئەمن و ئەمانەشدا، لەهەموو کون و کەلێنێکی دونیاوە، ڕزق و ڕۆزی هەمەجۆر و هەمەچەشنیان بۆ دەهات و بەسەریاندا دەباری. بەڵام ئەوان لەجیاتی سوپاسگوزاری ناشکور و سوپاس ناپەرێز بوون، بەئازایەتی خۆیانیان دەزانی. هەستیان نەدەکرد بەو هەموو خەڵاتە گەورەیە! ئیتر ئەوەبوو کتوپڕ خوای گەورە پۆشاکی برسێتی کرد بەبەریاندا و، بەرگی ترسی کردە کاڵای باڵایان، لە دەرەنجامی ئەو کاروکردەوە و ڕەفتارە ناپەسەندانەی کە ئەنجامیان دەدا. {تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین ل٤٠٩} .

لێرەدا جێگەی خۆیەتی کە شوکری خوا بکەین، واماوەی چەند ساڵێکە هەرێمی کوردستانی خۆشەویستمان بەبەراورد لەگەڵ حکومەتی ناوەندی عێراق و، وڵاتانی دەوروبەرمان و جیهان بەگشتی، وڵاتێکی پڕ لە ئاسایش و ئەمانە. وە شەڕی بەدی ناوخۆش سوپاس بۆ خوا لەناوماندا نەماوە، خوای گەورە خەڵاتی ئەمن و ئاسایشی وڵاتمان بۆ زیاد بکات و باری ئابوریمان زیاتر ببوژێنێتەوە.

بەڕاستی ساڵانێکی یەکجار زۆربوو، دەوڵەتی عێراق ـ ئێستاشی لەگەڵ بێ ـ بەوڵاتی پڕ لە شەڕ و کوشتار ناسراوە و، ئەو هەموو

خەڵكە زیرەك و بلیمەت و داهێنەرەی عێراق، بەكورد و عەرەب و توركمان و هەموو پێكهاتە نەتەوەیی و ئاینی یەكانیەوە، لەترسی ستەمی دەسەلآتداران و نائارامی ولآت، ڕوویان لەهەندەران كرد و سەری خۆیان هەڵگرت و، هەموو وزەی فیكری و زانستی و جەستەیی خۆیان بۆ ئاوەدانكردنەوەی ولآتانی تر بەكارهێنا، تەنها بۆ ئەوەی بە ئاسایش و هێمنی بژین!

مێژوو دەڵێ: ساڵی (١٩٥٨) كە نیزامی پاشایەتی لە عێراق ڕوخا و نیزامی كۆماری هاتە كایەوە، خەڵكی هەمووی لەبەر دەركی سەرای سلێمانی، چەپڵەیان لێ ئەدا و ئاهەنگیان دەگێڕا، گوایە لە نیزامی بۆگەنی پاشایەتی ڕزگاریان بووە، تەنها پیاوێك نەبێ دەگریا، وتیان: ئەرێ نەگبەت بۆ دەگریت؟ وتی: ئێوە نازانن بەخوا خراپتر دەبێت!!

بەڵێ ئەو پیاوە بە ئەزمونە دنیا دیدە ڕاستی كرد، خراپتر بوو، عبدالكریم قاسم هات و خەڵكانێكی زۆر لەناوچوون و دواتر خۆشی لەناوچوو، لەوە لەولاتر چێ! دوای ئەو عبدالسَّلام هات و بەتەمابوو كورد و كوردستان بسوتێنێ، بەلآم خوا لە سوڵتان مەحمود گەورەترە، لە فڕۆكەدا لە ئاسماندا سوتا! دەڵێن: لەو كاتەدا ژنێك لە خەستەخانە كچێكی بوو، لە خۆشیاندا ناوی نا (ڕزگار) وایان زانی ئیتر ڕزگاریان بوو. پاشان عبدالرحّمن عارفی برای هات و ئەویش بەجێی هێشت.. ئەحمەد حەسەن بەكر هات و پاشان بە

پلانێکی دڕندانە صدَّام حسین چوە جێی، ئەمیش سی ساڵێك حکومی کرد و دوو جەنگی گەورەیان پێ بەرپا کرد و، عێراق و ئێران و کوەیتی تیا ماڵوێران بوو، ئەویش ڕیسوا بوو. لەچاڵ دەریان هێنا و لەسێدارەیان دا! بەداخەوە هەتا ئێستاش لە عێراقدا دەسەلاَت بەدەست کەسانێکەوەیە، کە کوشتن و دزی و گەندەڵی هەر بەردەوامە ! !

نازانم کەی ولاَتم ئەبێ بەولاَت؟ نازانم تۆ بڵێی ئەو خەوەمان بێتە دی، کە خەڵکی لەژێر چەتری دادپەروەری و یەکسانی دا هەناسەیەك بدات؟!. {هەزار و یەك، ئەندازیار عثمان ب٢ ل٣٤١}



## وڵات بەبێ ئاسایش وێرانەیە!

بەڵێ هەر ولاَتێك ئەمن و ئەمانی تێدابێ، ئاین و ماڵ و گیان و سەروەت و سامان و ڕەنج و ماندووبون و کەرامەت و ڕێزی مرۆڤی تێدا پارێزراوە، خەڵکی هەروەکو ئەرکیان لەسەر شانە، مافی هاولاَتی بونیشی پێ ڕەوا بینراوە، هەر بۆیە لە قورئاندا ئەمن و ئەمان لەپێش (نان)یشەوەیە، ڕاستە نان و خۆراك سەرچاوەی بژێوی ژیانە، بەلاَم ئەگەر نانەکەت بە ئەمینی نەخۆی چ تام و چێژێکی هەیە؟!

هەروەها ئەگەر هێمنی و ئاسایشی وڵات تێکچوو، شەڕ و جەنگ بەرپابوو، یەکسەر نانیش دەبڕێ. چونکە هەر کە جەنگ و کوشتار کەوتە وڵاتێکەوە، یەکسەر دەرگای هەژاری و نەخۆشی و بەدبەختی دەخرێتە سەر پشت. هەر بۆیە سیاسەتی وڵاتانی زلهێزی جیهانی ئەوەیە: کە ئەگەر بیانەوێ خێروبێری وڵاتێك ببەن، بەروبوم و بەرهەمی بۆ خۆیان بێ و وەکو خێر پێکردن شتێکی لێ بدەنەوە بەهاوڵاتیانی ڕەسەن و، خاوەنماڵ خۆی، دێنن جەنگێك دروست دەکەن و، ئەمجا لە ڕێگەی ئەو جەنگەوە دەبێ دانیشتوانی ئەو وڵاتە خۆیان، بە مەمنونیەوە دەرگای وڵاتیان بۆ هێزی بێگانە بکەنەوە و، داوای کۆمەك و هاوکاریان لێبکەن. ئەوانیش هەر بەپارەی خۆیان چەك و تەقەمەنیان پێ دەفرۆشن و خۆیان بەخێو دەکەن!.

بەڵێ لە قورئاندا ئەمن و ئەمان و ئاسایشی ووڵات لەپێش نان و خۆراکەوە هاتووە، هەروەك حەزرەتی ئیبراهیم لەخوا پاڕایەوە ـ لەو کاتەدا کە هاجەرەی خێزانی و ئیسماعیلی کوڕی کە مەلۆتکە بوو. لە دەشتی چۆڵی بێ ئاوی بێ کەسی مەککەدا، بە فەرمانی خوا بەجێی هێشت، ڕووی لەخوا کرد و فەرمووی: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ البقرة: ١٢٦.

واتە: ئیبڕاهیم ـ علیه السَّلام ـ لەخوا پاڕایەوە و فەرمووی: ئەی پەروەردەکەری من، تۆ ئەم جێگە چۆڵەی بێ کشتوکاڵە بکە بە

شارێکی هێمن و بێ ترس بۆ دانیشتوانەکانی و، دور بێ لە خوێن رێژی و ستەم لەیەکتری کردن، بیپارێزە لە بومەلەرزە و گێچەڵوکە، وە تۆ ئەی خوایە ڕۆزی و خواردەمەنی ببەخشە بە دانیشتوانەکەی لە هەموو میوە و دانەوێڵەیەك.. {تەفسیری زمناکۆیی، مەلا سەعید زمناکۆیی ب١، ل٣١٢}.

بەڵێ ئەمن و ئاسایش و دڵنیایی لە ژیاندا کە مرۆڤ خوێن و ماڵی سەلامەت و پارێزراوە، ئەوەندە گرنگە لە ئیسلامدا. کە خوای گەورە باسی فەزڵی (کەعبە) ڕووگەی ملیار موسڵمان دەکات، بەوە ستایشی دەکات کە شوێنێکە پڕە لە ئاسایش و سەلامەتی و پارێزراوی. هەروەك دەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا﴾ البقرة: ١٢٥.

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست ـ محمد ـ ﷺ، تۆ بیری ئەو کاتە بکەوە کە ئێمە ئەو خانووەمان ـ کەعبە ـ کرد بە جێگەی گەڕانەوەی ئاواتی ئادەمیزاد، کە بچن بۆلای بەکۆمەڵ کۆمەڵ بۆ بەجێهێنانی حەج و عومرە و پەرستنەکانی تری خوا و، بگەڕێنەوە بۆلای ئەو خانووە ـ کەعبە ـ ساڵ لەدوای ساڵ هەتا ڕۆژی دوایی و، بگەڕێن بەهەر چوار لایدا و، بپارێنەوە بۆ گەل و نیشتمانی خۆیان و خودی خۆیان. ﴿وَأَمْنًا﴾ وە کەعبەمان کرد بە جێگەی

ئاسایش و نەترسان، یانی کاتێ ئادەمیزاد چونە ئەو جێگە و فەرمانەکانی خوایان بەجێ هێنا و، پەشیمان بونەوە و گەڕانەوە بۆلای خوا بەنیازی پاکەوە، ترسیان لە سزای دوا ڕۆژ نامێنێ. هەروەها جێگەی ئەمان و نەترسانی ئەو کەسانەیە کە دانیشتوی لای ئەو خانوە پیرۆزەی کەعبەن، خوای گەورە پێویستی کردووە هیچ کەسێ لەو جێگەیەدا پەلاماری نەدرێ.

ئەو شوێنە بەجۆرێ ڕێزی لێ دەگیرێ ئەگەر باوك کوژرا و باوك کوژی خۆی لەپەنای کەعبەدا بینی، پشتی لێ هەڵئەکا وەکو هیچ نەقەومابێ لەنێوانیاندا..

دەبێ ئەوەش بزانین ئەگەر تاوانبارێك چوە ناو کەعبەوە، کە شایەنی کوشتن و تۆڵە لێکردنەوە بوو، پێویستە تەنگی پێ هەڵبچنرێ و نان و ئاوی نەدرێتێ، هەتا خۆی ئەدات بەدەستەوە، یان ئەمرێ. وە نابێ یەکەمجار پەلاماری بدرێت لەبەر ڕێزی ئەو ماڵە پیرۆزە کە (کەعبە)یە.. {تەفسیری زمناکۆیی، مەلا سەعید زمناکۆیی ب١، ٣١١}.



## ئەمن و ئاسایش بەچی دەچەسپێ؟

ئایا کە ئەمن و ئاسایشی ولآت ئەوەندە گرنگە بەچی دەچەسپێ؟ ئەو هۆکارانە چین کە هێمنی و ئاسایش لە ولآتدا بلآودەکەنەوە و شەڕ و ئاژاوە کۆتایی پێ دێنن؟ ئایا:

١) بەزەبری هێز و داپلۆسین و توندوتیژی لەلایەن دەسەلآتەوە پەیدا دەبێ، بەشێوەیەك کە هەر کەس سەر بزێوی کرد سەر کوتی بکا و هەمیشە ترس و تۆقاندن بخاتە دڵی خەڵکیەوە، کە ئەمە لەمڕۆدا پێی دەوترێ: دکتاتۆریەت؟.

٢) یان بە ڕێگە پێدانی خەڵکی کە بەشێوەیەك لەکەس نەپرسرێتەوە و، ئازادی لەسنور بترازێ و بگاتە ئەوەی هەر کەس چۆنی پێ خۆشە ئاوا بژی و ڕەفتار بکا و بڵێ و بخوا، با سنوری ئازادی کەسەکانی تریش پێشێل بکات. کە ئەمەش لەڕاستیدا ئازادی و سەربەستی و ئاسایش نی یە. بەڵکو بەرەڵایی و بێ سەروبەری یە.

٣) یان ئارامی و هێمنی و ئاسایشی ولآت بەوە دەستەبەر دەبێ، کەهەموو جێگاکان بەکامێرای چاودێری زۆر ورد چاودرێری بکرێن، کە هەموو کەس لەهەموو فەرمانگە و بانق و بازاڕ و شوێنە گشتی و تایبەتیەکاندا، بزانێ کە بەکامێرا چاودێری دەکرێ و

نەتوانێ خراپە و دزی و تاوان بکات، چونکە دەزانێ وێنە و دەنگ و ڕەنگی دەگیرێ و لەدەستی یاسا ڕزگاری نابێ؟!

٤) ئایا چەسپاندنی ئەمن و ئارامی و ئاسایشی وڵات بەوە دەبێ کە: دەرگای ماڵەکان توند و تۆڵ و قایم بن و پارە و ئاڵتون و شتە بەنرخەکان لەناو قاسەی گەورە و قورس و بەهێزدابن؟ کە دز و دەستی پیس نەتوانێ پێی بگات؟! وە دەروازەی شارەکان بە بازگە (سەیطەرە)ی بەهێز و چاوکراوە بپارێزرێن، کە ڕێگە بگیرێ لە کەسی نامۆ و تاوانکار و گێرە شێوێن، کە بێتە وڵات و شارمانەوە؟ یان پۆلیس و ئاسایشی زۆرمان هەبێ و بەتەواوی وڵات بەهێزی چەکدار بپارێزرێ؟!

ئایا بەمانە ئاسایش و هێمنی وڵات دەپارێزرێ و، ئەمانە بەسن بۆ ئەمانی وڵات و گەل و میللەت؟!

**لەوەلامدا دەڵێین:** ڕاستە ئەمانە هەریەکەیان دەورو کاریگەری خۆیان هەیە، بۆ دابین کردنی ئاسایشی وڵات و خەڵکی، بەلام هەموو ئەم ڕێگایانە نەیانتوانی کە ببنەمایەی بەرقەرار بوونی ئاسایشی وڵات. بۆ ڕاستی ئەم قسەیەش تەماشای وڵاتێکی وەکو ئەمریکا بکە، لەشاری نیۆرك دا، لەکۆتایی ساڵی (٢٠١٤)دا، ڕاگەیاندنەکان بلاویان کردەوە کە ماوەی (١١) ڕۆژە هیچ کەس لەو شارەدا نەکوژراوە!

بەلایانەوە جێگەی سەرسوڕمان بوو کە بەدرێژایی چەندین ساڵ هەمیشە ڕۆژانە خەڵکی کوژراوە و پارەی بڕدراوە. ئەو چەند ڕۆژە نەبێ! هەروەها لەگەڵ بەکارهێنانی ئەوپەڕی توند و تۆڵی لە چاودێری کامێرا و هێزی پۆلیس و فڕۆکەخانەکان، کەچی بەنوێژی نیوەڕۆ بانقەکان هێرشیان دەکرێتە سەر و کارمەندەکانی بە بارمتە دەگیرێن و تالآنی دەکەن و زۆرجار لەدەستی پۆلیسی ئەو وڵاتە ڕزگاریان دەبێ!

چەندجار لەخەڵکی بازرگانمان بیستوە، کە کاتێ خەڵکی ئەمریکی و ئەڵمانیایی و بەریتانیان لەگەڵ بوە لەشاری سلێمانی و هەولێردا و، بازاڕی دۆلاریان نیشان داون کە فەردە دۆلار و دینار دانراوە، تەنانەت لەسەر شەقامەکان سەفتە دۆلار بەدەست خەڵکەوەیە و ئاڵوگۆڕی پێ دەکات و، کەسیش پەلاماری نادات و نایکوژێ و تالآنی ناکات! زۆر بەلایانەوە سەیر و سەمەرەبوە و وتویانە: ئەمە لەلای ئێمە بێت، لەنیوەڕۆدا بەبەرچاوی پۆلیسەوە پەلامار دەدرێ و دەفرێندرێ! کە بەڕاستی ئەم ئەمن و ئەمانە سوپاسی خوای دەوێ و، بەرهەمی ئیمان و خواناسی و ئەخلاق بەرزی میللەتی کوردە.



## هۆكارەكانی بلاَوبونەوەی ئەمان و هێمنی:

ئالێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستی یەی كە: لەگەڵ بونی دەزگای چاودێری پۆلیس و ئاسایشی بەهێز و، چاودێری كامێرا و توند و تۆڵی فرۆكەخانە و بازگەكانمان، پێویستمان بەمانەش هەیە بۆ دابین كردنی ئاسایشی تەواو بۆ وڵاتەكەمان و گەل و میللەتەكەمان.

## هۆكاری یەكەم: ڕوكردنە خوا و خواپەرستی و خواناسی:

بەشێوەیەك مرۆڤ واخوابناسێ و ئیمانی بەچاودێری خوا بێ، كە یەقینی ببێ كە ئەگەر ئەویش توانای چاوەكانی ئەوە نەبێ خوا ببینێ، بەدڵنیاییەوە خوای گەورە ئەو دەبینێ و چاوی لێیەتی و چاودێرە بەسەریەوە! كەئەمەش ئەوپەڕی بەرزی پلەی ئیمانە و پێغەمبەری خۆشەویستمان بە (الإِحسان)، ناوی بردوە و فەرموویەتی:

**(الإحسان أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَراهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَراهُ فَإِنَّهُ يَراكَ)** بەڵێ هەركەسێك، هەر خێزانێك، هەر گەل و میللەتێك ڕویان كردە خوای گەورە، ئەوە خوای گەورەش خەلاَت و بەخششی تێر و تەسەلی هەرزانیان بەسەردا دەبارێنێ و، ژیانیان پڕ لە هێمنی و ئاسایش دەكات. هەروەكو دەفەرمووێت: ﴿فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا

ٱلۡبَيۡتِ ﴿٣﴾ ٱلَّذِيٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ ﴿٤﴾
قُرَيش.

واته: هەر پەروەردگاری خاوەنی ئەم ماڵە دێرینە (کە کەعبەی پیرۆزە) بپەرستن. ئەو زاتەی کە لەو ولاٌتە وشك و بێ کشتوکاڵەدا ـ مەبەست دانیشتوانی مەککەیە ـ دەروی لێ کردونەتەوە و، لەبرسیەتی ڕزگاری کردوون و بژێوی بۆ دابین کردون و، خۆراکی پێ بەخشیون. هەروەها لە ترس و بیمی جەردە و ڕێگران پاراستونی و ئاسایشی بۆ دابین کردوون.

هەرکات خەڵکی موسڵمانی ڕاستەقینە و ئیمانداری بەحەق بوون، ئەوا هەرگیز ئازاری یەکتر نادەن و هەموویان لەیەکتری ئەمین دەبن و، لەدەست و زمانی یەکتری سەلامەت دەبن. ئەو کاتیش ژیان پڕ لە ئاسایش و ئەمان دەبێت. هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەصفی موسڵمان و ئیمانداری بەحەقدا فەرموویەتی: (**المُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ المُسْلِمُونَ مِنْ لِسانِهِ وَيَدِهِ، وَالمُؤمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النّاسُ عَلى دِمائِهِمْ وَأَمْوالِهِمْ**). صَحيحٌ ـ رَواهُ الترمذيُّ: (٢٦٢٧)، صَحيح الجامع لِلْألباني: (٧٦١٠).

بەڕاستی بەرهەمی ئیمان و ئیسلامەتیە گەنجێکی گیرفان بەتاڵی موحتاج، ئەوەندە دەستپاکە، ئەوەندە ئەمینە، کە نەك هەر دەست ناکات بەگیرفانی خەڵکی دا و گیرفانیان نابڕێت. بەڵکو بە دەفتەر

دۆلار دەدۆزێتەوە و کون بە کون، ڕاگەیاندن و ڕۆژنامە دەکات و دەگەڕێ بەشوێن خاوەنەکەیدا، تاوەکو دەیدۆزێتەوە و دەیداتەوە دەستی.

بەڵێ بەرهەمی ئیمان و بەچاودێری خوایە، کەمرۆڤ هەست دەکات کە هەمیشە خوای گەورە چاوی لێیەتی، ئامادەنیە خیانەت و غەش و تەزویر بکات، با کامێرای چاودێری مرۆڤیش لە ئارادا نەبێ و چاودێری نەکات!.

بەڵێ بڕواداری تەواو چاك تێگەشتوو لە خواناسی، پەنجە نابات بۆ حەقی کەس، کە ئەمەش یەکێکە لەبەروبوم و بەرهەمەکانی ئیمان. کاتێك ئەبوبەکر بوە خەلیفە، عومەری کرد بە قازی مەدینە. پاش ساڵێك عومەر کە هیچ قەزاوەتێکی نەهاتە بەردەم!

داوای لە خەلیفە کرد کە لەو پۆستە لایببات، ئەویش لێی پرسی: ئایا قورسە بەلاتەوە وداوای دەست لەکارکێشانەوە دەکەی؟

عومەریش فەرمووی: نا، بەلامەوە قورس نی یە، ئەی خەلیفەی ڕەسولە الله، بەڵآم کارم نی یە لای گەلێکی بڕوادار، کە هەریەکەیان دەزانێ حەقی خۆی چەندە و داوای زیاتر ناکات. وە دەزانێ چی ئەرکیەتی و کەمتەرخەم نی یە لە جێبەجێ کردنیدا! هەرکەس چی پێخۆشە بۆ خۆی ئەوەشی بۆ براکەی دەوێ، ئەگەر یەکێکیان دیار نەبوو، هەواڵی دەپرسین، ئەگەر نەخۆشبوو، سەردانی دەکردن،

ئەگەر هەژاربوو یارمەتی دەدەن، ئەگەر کارێکی هەبوو هاوکاری دەکەن، ئەگەر توشی بەڵایەك هات دڵی ئەدەنەوە. دینەکەیان ئامۆژگارییە و ڕەوشتیان فەرمان بەچاکە و جڵەوگیری لەخراپەیە، جا ئیتر لەچیدا دژ بەیەکن و لەچیدا شکات لەیەك دەکەن؟!.

{هەزار ویەك، ئەندازیار عثمان، ب٢ ل٢٩١}

### ئیسلام مرۆڤی خراپەکار دەکات بە بانگخواز و چاکە خواز!

بەسەرهات

دکتۆر محمد عبدالرَّحمن العريفي دەڵێت: لەبەندینخانەیەکدا وتارم ئەدا بۆ بەندیەکان، بەندکراوێکم بینی حەوت زمانی دەزانی! لەکاراتیدا لەدوای پشتێنی ڕەشەوەبوو، تایکواندۆی دەزانی، لەگەڵ دوو یانەدا گرێبەستی هەبوو، کە هەر ئازادکرا بچێ ڕاهێنان بە ڕاهێنەرەکانیان بکات!

ڕۆژێك ئەم بەندیە بە پۆلیسێکی بەندینخانەکە دەڵێ: کە بەلای ژوورەکەدا دەڕوات کە تۆزێ ئاوی بداتێ، ئەویش بەڕەقی وەڵامی ئەداتەوە و دەڵێ: ئەوە نیە ئاوت لایە، ئەمیش قسە ناکات، تا دوای هەفتەیەك کە پۆلیسەکە دەڕوات بەلای ژوورەکەیدا بەبیانوی شتێکەوە بانگی دەکات و کە نزیك دەبێتەوە پەلاماری دەدات و لەمدیوەوە قورقوڕاگەی دەگرێت و بەهەزار حاڵ بەری دەدات.

ئەم کەسە بەندکراوە پەلاماری بانقی دابوو، حاکم تیامابو دەستی ببڕن یان هەر یەکجاری لە سەری بدەن. کە هیچ هیوای چاك بونی نەبوو! دوای حەوت ساڵ چومەوە هەمان بەندینخانە (سجن) و وتارم بۆ خوێندنەوە، بەڵام چی چاوم گێڕا ئەو کەسە دیار نەبوو! پرسیارم کرد وتیان: ئێستا سەد و هەشتا پلە گۆڕاوە و، هەندێ برادەر کتێبی ئاینی ئیسلامیان داوەتێ و، بۆتە بانگخواز! هەر بیانی یەك بگیرێ ئەیبەنە لای ئەو قسەی بۆ دەکات و زۆربەیان موسڵمان دەبن!!

منیش زۆر خۆشحاڵ بووم و چووم بۆلای و وتم: ئەوە چۆن بوو لەوتارەکەمدا ئامادە نەبووی؟

وتی: والله حەزم دەکرد ئامادەبم بەڵام ئەمشەو فلیپینیەکیان هێنا بۆلام، تا سەعات هەشتی بەیانی قسەم بۆ کرد سودی نەبوو. وتم: چەند کەس لەسەر دەستدا موسڵمان بوون؟

وتی: خوا ئیخلاصمان بداتێ سی و یەك کەس!!.

{بالأنس، ئەندازیار عثمان، ل٩٨}.



ئیمان و ئیسلامەتی ناخی مرۆڤ بەرەو ئاشتی و ئارامی دەبات

بەسەرهات

محمد ئەسەد ناوێکی دیار و ئاشکرای ناوبانگەوازی ئیسلامی، ئەم کەسایەتیە ناوی: (لیو بۆڵد ڤایس) بوو، جولەکەیەکی نەمساوی بوو، ڕۆژنامە نوسێکی گەورەی فەیلەسوف بوو، خەوی بە سەرداری پێغەمبەران ـ محمد المصطفى ـ وەبینی ﷺ، کە بەسواری وشترەوە بوو، جبەیەکی سوری لەبەردابوو، ئەمە سەرەتای هیدایەتی بوو بۆ ئاینی پاکی ئیسلام و، سەرەنجام پەیوەندی کرد بەبنکەیەکی ئیسلامی لە بەرلین و، لەوێ خۆی و ژنەکەی موسڵمان بوون.. پاشان چو بۆ ولاتی سعودیە و پاشای سعودیەی بینی، لەبارەی موسڵمانبونیەوە دەڵێ: هەستم کرد وەك لە ئاگر ڕزگارم بووبێت، ئینجا پەڕاوێکی نوسی بەناوی (الطّريق إلى مَكّة). {بالآنس ئەندازیار عثمان، ل٩٩}.

## هۆکاری دووەم: چەسپاندن وجێبەجێ کردنی حوکمە شەرعیەکان:

دووەم شت کە دەبێتە هۆی بڵاوبونەوەی ئەمن و ئەمان و ئاسایش لەولاتدا و هاولاتیان هەست بە ئارامی و دڵنیایی دەکەن، بریتیە لە چەسپاندن و جێبەجێ کردنی حکومە شەرعیەکان. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (حَدٌّ يُعْمَلُ بِهِ فِي الأَرْضِ، خَيْرٌ

لِأَهْلِ الأَرْضِ مِنْ أَنْ يُمْطِرُوا أَرْبَعِينَ صَبَاحاً). صَحيح سُنَن النَّسائي لِلألباني: (٤٥٥٤).

واته: جێبەجێ کردنی حەدێك کەخوای دادگەر دایناوە لەسەر زەویدا، چاکترە بۆ دانیشتوانی سەر زەوی لەوەی کە چل بەیانی بارانی بەرەکەت و ڕەحمەت بەسەر زەویدا بباریَ.

ڕوونکردنەوەیەك: دەبێ ئەوەش تێبگەین کەجێبەجێ کردنی حەدی شەرعی، مانای ئەوە نی یە جەلاد خانە دابنریَ و، توند و تیژی و تۆقاندن بلاْوبکرێتەوە. بەڵکو ئەوپەڕی دادپەروەری لەجێبەجێ کردنی حەددە شەرعیەکاندا هەیە، وە جێبەجێ کردنی حەددی شەرعی تەنها مافی فەرمانڕەوای دادپەروەرە، نەك هەر کەس بۆ خۆی هەڵسێ بەناوی جێبەجێ کردنی حکومی شەرعەوە، دەستبکات بە لێدان و جەڵدەلێدان لەخەڵکی و، بەبێ ئەوەی ئیسلام هیچی پێشکەش بەژیانی خەڵکی کردبێ حوکمیان لەسەر جێبەجێ بکات!.

بەڵێ حەددە شەرعیەکان هەمووی بۆ چەسپاندنی دادپەروەری و، گێڕانەوەی ماف بۆ ستەم لێکراو و، گرتنی دەستی زاڵمە و لابردنی پەشێوی و ئاژاوەیە و، بلاْوکردنەوەی هێمنی و ئاسایشە، بۆنمونە:

لە ئیسلامدا حەددی کوشتنی بەناحەق و ناڕەوا و بێ هۆ، بۆ کەسێ کەسێك بەناحەق بکوژێ، کوشتنەوەیەتی لەلایەن کەسی هەرە نزیکی کوژراوەکەوە. بەلاّم بەچاودێری و سەرپەرشتی دادوەر و فەرمانڕەوا. نەك لە خۆوە پەلاماردان و تۆلّە سەندنەوەی عەشایەرانە، خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُوْلِى ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾﴾ البقرة.

واتە: ئەی هۆشمەندەکان دلّنیابن کە تۆلّەسەندنەوە لەبکوژان، ژیان بۆ خەلّکی دەستەبەر دەکات، چونکە ئەگەر تۆلّە نەبێت کوشتوبڕ زۆر دەبێت و، دنیا دەبێتە پاشا گەردانی و ژیان تالّ دەبێت، کەس لەخۆی ئەمین نابێت. ئەم تۆلّەسەندنەوەیە بۆیە بڕیار دراوە تاخۆتان بپارێزن لە ستەم و کوشتنی ناحەق.. {تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین، ل٤٣}.

## بۆچونی مەلای گەورە بۆ حەدی شەرعی:

زانای گەورەی کورد، موفەسیری قورئان مەلای گەورەی کۆیە، مەلا محمدی جەلی زادە، لە تەفسیرەکەیدا: (تەفسیری کوردی لە کەلامی خوداوەندی) لە (ب١، ل١٩٧)دا، لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُوْلِى ٱلْأَلْبَـٰبِ﴾ دا دەفەرموێ: کە بۆ بەرەکەتی بابەتەکەمان هەروەکو خۆی دەینوسینەوە ـ هەرچەندە

شێوازی قسەکردن و نوسینی ئەو سەردەمە، کە لە ساڵی ١٩٣٤ی زاینی دا ئەمەی نوسیوە، لەگەڵ ئێستادا جیاوازە ـ بەڵام باوەکو خۆی ئەم شیکاری و تەفسیرە بەهێز و بەپێزەی نەقڵ بکەین کە دەفەرمووێ:

حەیاتی دونیا وەکوو هەموومان ئەیبینین زۆر ناخۆشە، (ئەبو علای معری) ئەڵێ: ئەوی لەسەرە مەرگ ئاوزنگان ئەدا، ئەوە تاڵاتی حەیات (قەی) ئەکاتەوە، وە گەلێ کەس مردن بەدەرمان ئەزانن بۆ دەردی حەیات. شەریعەتی تەبیعەت ئا ئەمڕۆ تەنظیمی حەیاتی نەکردووە، لەسەر ئەو ناخۆشی یە، بەشەر بە (شەرر) زیاتر ناخۆشی بکا، شایانی عەقڵ و ئینصاف نی یە.

حەوادیسێك کە خەلەل بە ئەمن و نظامی عام بگەیەنێ، متوالیاً ئەبێ بۆ مەنعی إنتشاری فەساد چارەسازیەك بکرێ، بۆیە عقلای ئینسان ڕێیان بە تشکیلی حکومەت بردووە، (آلهیون، طبیعیون) ئەو تەشکیلەیان لە ضروریاتی حیاتی إجتماعی دیووە و، ئەفرادی حکومەت طبعاً مُقدَّس نین، ئەوانیش بەشەرن میلولی فاسیدە یان هەیە، بۆیێ إحتیاجیان دیوە بە قانونێك، کە إکمالی ئەو تەشکیلە بکا. بناءً علیه ئیجاب ئەکا واضعی قانون بێ مەیل و محابا، صاحیبی وجدانی پاك بێ بە أحوالی روحیەی ئینسان خەبەرداربێ، ئەو جۆرە بەشەرە لەهەموو زەمان زۆر کەمن، (خاصةً) لە عەصری حضارەت و مەدەنیەت، مُحقق بزانن ئەمڕۆ لەشەرق و غەرب لە

شمال و جنوب، لە قطعاتی خەمسەی ئەرض، یەك ئینسانی تێدا نی یە بەوجدانی (نەزیه) بە قەلبی پاك لە مەیلی دین، طائفی، مەذهەبی، حزبی، هەبێ، هەر قانونێکی دای بنێن خاڵی نیە لە مەیلی فەساد، بەلاف و گەزافی (سیاسیون) هەڵمەخەڵەتێن، ئەوان لە هەموو کەس غەشیان زیاترە.

ئێمە بۆیە ئەمە ئەڵێین (لأبُد) شارعی قانون ئەبێ خودا بێ، کە (ربُّ العالمين). ئەسراڕی عیباد، مەیلی صەلاح و فەساد بەئێمە بگا، ئەو ذاتە بەچاوی بێ فەرقی تەماشای خۆم و بێگانە بکات و، ڕەوشتی عالەم شاهیدە کە بەشەر لە هەزاری، نۆسەد و نەوەد و نۆی، بەترس نەبێ إصلاح نابێ، کەوابێ ئەگەر کەسێك بەزوڵم و تعدی، بە تصوُّر و تەصمیم کەسێك بکوژێ، بۆ پڕبونەوەی ئەو برینە لە هەیکەلی إجتماعی چی چاکە بکرێ، (حقوقیون) تا ئەمڕۆ دوو فیرقەن:

فیرقەیەك: تەرەفداری قصاص نین، ئەڵێن: قاتلێ إصلاح بکرێ بە حەبس، خەڵقیش لەشەری ئەمین دەبن، ئەویش پاشماوەی حەیاتی إمرار ئەکا لە حەپسخانە بەساکتی و سالمی، کَأَنَّهُ کەچوە حەپسخانە ئەبێتە پیاوی (مُقدَّس) چاك و پاك..

فیرقەیێ تر: تەرەفداری إعدامن، ئەفەرموون: ئەو جۆرە قاتڵە إزالەی وجودی نەکرێ، ئەو برینە پڕ نابێتەوە، جەنابی حەق کەخۆی (أعلَمُ العالَمين) و (أحكَمُ الحاكمينَ)، ئەو فیکرە تەڕجیح

ئەکا و بەیانی سەبەبیشی ئەفەرمووێ، بە نەوعێك کە ئەوی صاحیبی وجدان بێ، تەصدیقی ئەکا و ئەفەرمووێ: لەو نەوعە قیصاصە عادیلانە بۆ ئێوە حەیاتێك هەیە، ئەمما چ حەیات؟ حەیاتێك کەوەصف ناکرێ بۆ ئێوە، ئەی خاوەندەی عەقڵی خالص و پاك!..

(حَقیقَةً) ئەوی صاحبی (لُبّ) بێ، تەصدیقی ئەو حکومە ئەکا، ئەزانێ بڕینەوەی نیزاع، کوژاندنەوەی فیتنە ئارامی دڵی خزمانی مەقتول، بەڵکو إستراحەتی ظاهری قاتڵ لە إعدامی دایە، ئەو نەوعە قەتڵە ئەمەلی ئیصلاحی لێ ناکرێ، تاوەکو فطرەتی بشریەی (بالکُلّیَة) مُلَوَّث ـ نەبوبێ، إقدام لەسەر ئەو نەوعە قەتڵە ناکات، ئەو نەوعە کەسە دەسەڵاتی بەسەر هەر کەسێکدا ببێ، لاشك ئەیکوژێ. بۆیێ خودا دەفەرمووێ: (ئەوی نەفسێ بکوژێ، کأنما هەموو کەسی کوشتوە).

مانعی فیطری، دینی لە دڵیدا نیە، ئەو حەیاتەی قاتڵ لە حەپسخانەدا ڕای ئەبوێرێ، ئەگەر لەگەڵ عەذاب و (ئەعمالی شاقە) بێ، مردن گەلێ خۆشترە لەو عەزابە دور و درێژە، ئەگەر خزمەت بکرێ لەباڵەخانەیەکی هەوادار، میناب‌ەند، ناظر لەسەر باغ و باغات، ئێوارە و سبەینە بەبێ ڕەنج و (تعب) لە کیسەی ئوممەت، حتّی لەماڵی ئەیتامی مەقتول، سفرە و شیلانی بۆ برازێندرێتەوە، بەکەوچك و چەتاڵ (محەللەبی) فڕڕبکا، گۆشتی سورەوەکراو نۆشی

گیان بکا، غایە مافی الباب فێری بەتانیە دروستکردن و کیفە سەعاتی منقش و، کلاوی قولابەشن ببیٚ و زەمانی حەبسیشی وردە وردە کەم ببێتەوە، بە عەفوی شاهانە، جلوسی ملوکانە، ولادەتی همایون، إنقلابی سەڵتەنەت، بە مەرگی مەلیك و دانیشتنی مەلیکێك، بەموژدەی (فتح) و پیرۆزی، بەو نەوعە حەپسە چۆن إصلاح ئەبیٚ، ئەولاد و ئەقاریبی مقتولی مظلوم لەو حەپسە، چ فەرامۆشیەکیان پیٚ دیٚ، خەڵقی دی چ عیبرەتیٚ ئەگریٚ؟

حاصڵی تەجروبە شاهیدە، کە فیکری فیرقەی أوَّل، فکرێکی فاسدە، ئەگەر مەلیك ئەمر بکا مەصرەفی ئەو موجریمانە، لەسەر ئەو صاحب مەرحەمەتانە بیٚ، عجباً ئەو فکرەیان ئەمێنیٚ، ئەو نەوعە کەسە ئەگەر معاش خۆری حکومەت بیٚ، نزیکی سەری مانگ پارە لە صندوق دا نەبیٚ، حکومەت بۆ تأمینی معاشی أفندی، گۆشت و پێست لە ڕەعیە بکاتەوە، عجباً أفندی دڵی پێی ئەسوتیٚ؟! حاشا ثُمَّ حاشا..

کەسێك بچیٚ بۆ کەسابەت، بەئەمەلی قازانجێك بێتەوە بۆ جەژن، پلاوی بۆ منالانی خۆی دروست بکا، چ نەبیٚ سەروکراسی چیتی سوریان بۆ بکا، وقتاً ئەو سوورە ساقەتانە، ئەبینن ناگاه، لاشەی بابیان بەمێشکی پڕژاو، بەسنگی شەق کراو، بەزگی دوراو، بەجەرگی پارچە پارچە کراو، بۆیان بێتەوە، ئەو تەرەفدارانەی مجرمەکان، ئایا دوو قڕان ئەدەن بۆ ئەو مایوسانە؟! بۆ ئەو دڵ

سوتاوانە بدەن بەجلك، چێشتی جەژنیان بۆ لێنێن، پێنج شەش فلسیان بدەنێ، کە ئەو منالانە پێی بچن بۆ جۆلانە و چەرخ و فەلەك؟! هیهات، هیهات، پولێکی خۆی بە حەیاتی هەموو بەشەر نادات. وەکو مەسەلی کوردی: (کفن بەمن ببڕێ، مردوو گۆڕ بە گۆڕچێ)!!.

تعجُب ئەوەیە بەعظێك موسڵمان بەسەفسەتەی ئەو محامیانە هەڵێ ئەخەڵەتێن، (طَعن) لەدینی خۆیان ئەدەن، نازانن ئەوانە بقیەی ئەو مفسدانەن، کە پێیان خۆش نی یە هیچ خێرێك لەتەرەف خوداوە بۆ ئێمە بێ، عجیب ترین ئەوەیە: عولەمای تەفسیر و بەلاغەت، سەعی ناکەن بۆ تەئیدی ئەو ئایەتە، بۆ إجرای ئەو معدەلەتە، خەریکن مقابەلەی ئەو ئایەتە کەریمە ئەکەن، لەگەڵ مەتەڵۆکێکی عەرەبان (القَتْلُ أنْفَى لِلقَتْلِ) بەسەد (چك بردە، چك بردە) مەنع و موعارەزە، گوایە إثباتی ئەکەن ئەو ئایەتە بەلیغترە لەو عیبارەتە. (مع أنَّهُ) ئەو کەلامە کەلامێکی زۆر بێ تامە، ئینسانی باغ، شەرم ئەکا بەرابەر عیبارەتی قورئانی ئەو قسە پڕوپوچە بنوسێ..

پاش ئەم طول و تەفسیلە، عەرض ئەکەین مع الاسف موسڵمان لەو إمتحانە دەرنەچوون، لەپاش (فاروقی أعظم) تا ئەمڕۆ ڕەئیسێك بە مەڕئوسێك، بەقووەتێك بەزەعیفێك، دەسەلاتدارێك بەبێ دەسەلاتێك نەکوژراوەتەوە، وجودی مەسعودی سەرکاری ئاغا

خۆش بێ، با سەد هەزار کەس لەو سەگە گەڕانە بکوژێ، چ ئەهمیەتی هەیە، ئەم حوکمی قیصاصەش ئەنجامی دێ بە ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ بەئومێدی ئەوەی خۆتان بپارێزن لە قەتلی ناحەق!.

بەڵێ ئاینی ئیسلام بەهەموو شێوەیەك لەهەوڵی ئەوەدایە كە ئاسایش و هێمنی تاك و خێزان و كۆمەڵگا و وڵات و دەوڵەت بەرقەرار بێ و دژە بەهەر هەڵوێست و هەنگاو و گوفتار و ڕەفتارێك، كە هێمنی و ئاسایشی كۆمەڵگا تێك بدات و، ئاژاوە و پشێوی دروست بكات. لەبەر گرنگی ئەم بابەتە بەویستی خوا (إن شاء الله) لەوانەی داهاتوودا ئەم بابەتە تەواو دەكەین.



# وانەی بیست وشەشەم

## بابەت: هۆکارەکانی چەسپاندنی هێمنی و ئاسایش.



### ـ بەشی دووەم ـ

۞ **قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى، إمْتَنَّ على قَوْمِ سَبَأَ بِأَمْنِ الطَّريقِ بَيْنَ القُرى والْأَماكِنِ:** ﴿وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ ٱلۡقُرَى ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا قُرٗى ظَٰهِرَةٗ وَقَدَّرۡنَا فِيهَا ٱلسَّيۡرَۖ سِيرُواْ فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ١٨﴾ سبأ.

۞ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : (لايَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِماً).** صَحيحٌ رَواهُ أَبُو داود: (٥٠٠٤). وَصَحيح الترغيب و التَّرهيب: (٢٨٠٥).

## سەرچاوەکان:


١) البَشارات النَّبَوِيَّة، صالح بن طه عبدالواحد، ص١٧٥.

٢) إسْتِئناسُ الخَطيبِ وَالواعِظِ بالْخُطَبِ وَالمَواعِظِ، محمد بن علي بن سليمان، ج٤ ص٩٧.

٣) بالآنس، ئەندازيار عثمان، ل٤٧، ل٤٥.

٤) تەفسیری زمناكۆیی، مەلا سەعیدی زمناكۆیی، ب١، ل٣٠٧.

٥) هەزار و یەك، ئەندازیار عثمان، ب٢، ل٢٩٢.

٦) گۆڤاری (بڕیار) ژ: ٨١، ل٢٤. وە: ژ: ٦٠، ل٥.

٧) تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز، عەلی باپیر، ب١، ل٦٦٦.

٨) تەفسیری ڕامان، أحمد كاكە محمود، ل٢٠٨.

٩) التَّفسيرُ الثَّمين، إبْنُ عُثَيمين، ج٦، ص١٨٤.

١٠) ساعَةٌ وَ ساعة، محمود المصري، ص٢٠٣.

١١) قصَصٌ أبْكَتْني، سالم مرشيد، ص١٨٠.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

له وانەی پێشودا لەزنجیرە باسەكەمان (لەخوا غافڵ مەبە)، باسی خەلأتی گەورە و پڕ بەهای هێمنی و ئاسایشمان كرد، كە بەڕاستی ڕەنگە زۆربەمان وەكو پێویست شوكرانەی خوای گەورەمان لەسەر نەكردبێ، هەتا ئەو كاتەی كە لەناو ناخ و جەستەی خۆماندا، یان لە ناو خێزان و ماڵماندا، یاخود لە شار و ولأتماندا شەڕ و ئاژاوە و ناهێمنی دەستی پێ نەكردبێ. وەتوشی دڵەڕاوكێ و قەلەقی و نائارامی نەبوبین، وە ترس و بیم و دەنگی تەقە و تەقینەوەمان نەبیستبێ.

لەبەر گرنگی ئەم بابەتە، لە وانەی ڕابردوودا هەندێ لەسەر ئەم بابەتە گرنگە دواین، بەویستی خوا (إنْ شاءَ الله) لەم وانەشدا بۆ تەواوی كردنی باسەكەی ڕابردوو، هەندێكی تر ئەدوێین:

زانایان لەپێناسەی هێمنی و ئاسایشدا فەرموویانە:
(الأَمْنُ هُوَ سُكُونُ القَلْبِ وَ ذِهابُ الرَّوْعِ وَ الرُّعْبِ).

واتە: هێمنی و ئاسایش: بریتیە لەوەی دڵت ئارام بێ و ئۆقرە بگرێ و، لەدڵەڕاوكێ بەدووربی و، ترس و بیمت لەدڵدا نەبێ و لەسەر نەبێ و، مەترسی لەسەر ژیان و ڕوحت نەبێ.

**(وَالبَلَدُ الآمنِ وَ الأَمين، هُوَ الَّذي اطْمَأَنَّ فيهِ أَهْلُهُ عَلى أَنْفُسِهِمْ وَ أَعْراضِهِمْ وَمُمْتَلَكاتِهِمْ)**

واته‌: شار و ولآتی ئه‌مین و ئه‌مان و پڕ له‌ ئاسایش، ئه‌و شوێنه‌یه‌: كه‌ دانیشتوانه‌كه‌ی و هاوولآتیانی دڵنیان له‌سه‌ر سه‌لامه‌تی ڕوح و گیانیان و، شكۆ و ڕێزی خۆیان و خانه‌واده‌ و بنه‌ماڵه‌یان و، كه‌لوپه‌ل و سه‌روه‌ت و سامانیان.

وه‌ زانایان فه‌رموویانه‌: **(وَطَلَبُ الأَمْنِ مُقَدَّمٌ عَلى طَلَبِ الغِذاءِ، لِأَنَّ الخائِفَ لا يَتَلَذَّذُ بِطَعامٍ وَلا يَهْنَأُ بِنَوْمٍ وَلا يَطْمَئِنُّ في مَكانٍ).**

واته‌: داواكردنی ئه‌من و ئاسایش و هێمنی پێشكه‌وتووه‌ له‌سه‌ر داواكردنی خۆراك و خواردن، چونكه‌ مرۆڤی ترساو و نائه‌مین هیچ تام و چێژێك له‌خواردن و خۆراك ناكات. وه‌ به‌خه‌وتن ناحه‌سێته‌وه‌، چونكه‌ ناتوانێ به‌ ئارامی و دڵنیاییه‌وه‌ بخه‌وێ و هه‌میشه‌ له‌سه‌ر هه‌سته‌، وه‌ له‌هیچ جێگا و شوێنێكیش دڵنیا نابێ و به‌كوردی (كونه‌ مشكی لێ ده‌بێت به‌ قه‌یسه‌ری) هه‌رچه‌نده‌ شوێنی ئه‌مین بێت هێشتا مه‌ترسی ئه‌وه‌ی هه‌یه‌ كه‌ دوژمن بیدۆزێته‌وه‌.

به‌ڵێ، به‌ڕاستی خواردن و خه‌وتن و پشودان، كاتێ خۆشه‌ و به‌چێژ و مایه‌ی حه‌سانه‌وه‌یه‌ كه‌ مرۆڤ ژیانی ئه‌مین بێ و ترس و بیمی له‌سه‌ر نه‌بێت.

لەبەر گرنگی هێمنی و ئاسایشی وڵاتە کە خوای گەورە و کاربەجێ، وەکو منەت و خەڵاتی خۆی سەرهۆزی (سَبَأ)دا، دەفەرمووێ: ﴿سِيرُواْ فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ١٨﴾ سَبَأ. واتە: دەتوانن چەند شەو و چەند ڕۆژ - ڕێگای زۆر دور - بڕۆن بۆ سەفەر و بازرگانی بەبێ ترس و بەئەمینی.

کەواتە: هەرکات وڵاتت ئەوەندەی ئەمن و ئەمانی مسۆگەر بوو، کە شەو و ڕۆژ، نیوەڕۆ و نیوە شەو دەتتوانی سەفەربکەی و بێ ی و بڕۆی و لەکەس نەدەترسای، ئەوە بەڕاستی خەڵاتی گەورەی خوایە و، دەبێ شوکری خوای لەسەر بکرێ. هەموو کەس بەئاست و توانای خۆی هەوڵی پاراستنی بدات. چونکە لە هێمنی و ئاسایشی وڵاتدا هەموومان سودمەندین. بەڕاستی کەس نرخی ئەمن و ئەمان نازانێ، ئەو کەسە نەبێ کە لەدەستی داوە و دوژمنایەتی هەیە و وڵاتەکەی شەڕی ناوخۆ و دەرەکی تێدایە.

پێغەمبەری خوا ﷺ کە مانگی یەکشەوەی دەبینی، ڕووی دەکردە مانگەکە و دەیفەرموو: (**اللّهُمَّ أهِلَّهُ عَلَيْنا باليُمْنِ وَ الإيمانِ، وَالسَّلامَةِ وَ الإِسْلامِ، رَبِّي وَرَبُّكَ اللّهُ**). صَحيح رَواهُ الترمذي: (٣٤٥١) الصَّحيحَة لِلْألباني: (١٨١٦).

واتە: خوای پەروەردگار ئەم مانگە نوێیەمان بەسەردا بێ بەهەرزانی و ئیمانەوە، وە بەسەلامەتی و دور لە شەڕ و شۆڕ و

جەنگ و ئاژاوە و ئیسلامەتی و خواناسییەوە، ئەی مانگ پەروەردگاری من و تۆ هەر (الله)یە.

بەڵێ: (الأَمْنُ لَزِيمُ الإيمانِ وَقَرِينُهُ، وَالسَّلامَةُ لَزِيمَةُ الإِسْلامِ وَقَرِينَتُهُ، إِذا وُجِدَ هذا وُجِدَ ذاك).

- ئاینی ئیسلام، ئاینی ئاشتی یە، خوای پەروەردگار یەکێ لەناوە بەرز و پیرۆزەکانی (السَّلام)ە. موسڵمان کە توشی کەسێك دەبێت بە (السَّلامُ عليكم) سڵاوی لێ دەکات، ناسنامەمان (مُسْلِم) کە بەمانای ئەوەیە خەڵکی لە زمان و لە دەستمان ئەمین و سەلامەت بن.

- موسڵمان نەك هەر بۆی نی یە کە خەڵکی بکوژێ و هێمنی و ئاسایش تێك بدات، بەڵکو لەسەری قەدەغەکراوە کە ئەگەر بە گاڵتە و سوعبەتیش بێت کەسێك بترسێنی. هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لايَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِماً). صَحيحٌ رَواهُ أَبُو داود: (٥٠٠٤). وَصَحيح الترغيب و التَّرهيب: (٢٨٠٥). واتە: حەڵاڵ نییە و ڕوا نییە بۆ هیچ موسڵمانێك کە موسڵمانێك بترسێنێ.

بەڵێ، موسڵمانی ڕاستەقینە و تێگەشتوو لە ئیسلام، لەهەر جێگایەك بێ و لە هەر وولاتێکی سەر زەوی بژی، بەبێگومان دەبێ ڕەمزی ئاشتی و ئارامی بێ و هەمیشە نەك شەڕ نەفرۆشێ. بەڵکو

شەڕیش نەکرێ. هەروەکو لە ڕۆژوی ڕەمەزاندا فێری ئەوە دەبین، کە ئەگەر شەڕیان پێ فرۆشتین بڵێین: (إِنِّي صائِمٌ).

بەڵێ، ئێمەی موسڵمان لە عیبادەتەکانمانەوە فێری ئاشتی خوازی دەبین، لەنوێژدا، لەڕۆژودا، لە حەجدا، لە زەکات و سەرفیترەدا، لە ئەمر بەچاکە و نەهی لە خراپەدا، دەبێ خەڵکمان خۆش بوێ، دڵمان پاك بکەینەوە لە ڕق و قین، کە سڵاومان لەیەکتر کرد، یانی دڵنیابە لەشەڕم و چاوەڕێی خێرم لێبکە. موسڵمانی ڕاستەقینە وەکو بارانی بەرەکەت وایە، بکەوێتە هەر جێگایەك سودبەخشە.



## ئەمن و ئاسایش پارێزەکانی وڵات ئەمانەن:

### ١) العُلَماءُ الرَّبانِيُّون: زانایانی ئاینی:

ئەمانە کە دڵیان پڕە لە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ، وە هەموو موسڵمانان و مرۆڤایەتی بە گشتی. زۆر دڵسۆزن، بەهەڵچون و ڕقی خۆیان هێرش ناکەنە سەر خەڵکی گوناهبار و تاوانبار، بەڵکو هەمیشە وەکو پزیشکێکی شارەزای دڵسۆزی دڵ پڕ لە سۆز، خەریکی تیمارکردنی دەرد و نەخۆشی خەڵکین، ڕێگای ڕاست نیشانی خەڵکی دەدەن و دەیانهێننەوە سەر ڕێگای ڕاستی ئیسلام. واقیع شاهیدە کە بە ئامۆژگاری جوان و شیرین چەند کەس

تەوبەی كردووە و دوای ئەوەی لە گوناهی گەورەی دزی كردن گلاوە، بەگوێگرتن لە وتارێكی بەهێز و بەپێز تەوبەی كردووە و مافەكەی گێڕاوەتەوە.. چەند گەنجی خراپ بۆ دایك و باوك بەئامۆژگاری مامۆستایەك و، گوێگرتن لە وتارێك بۆتە خزمەتكارێكی دڵسۆزی دایك و باوك، چەند خێزانی پڕ لە ئاژاوە و شەڕ و موشكیلە، لەگوێگرتن لە وتار و بابەتێكی تایبەت بە ژیانی هاوسەری و چارەسەری كێشەكان سوپاس بۆ خوا، ئاشت بونەوە و خێزانەكەیان هەڵنەوەشاوە و منداڵیان سەرگەردان نەبووە..

## ئیسلام جاسوس دەكات بە بانگخواز! 〈بەسەرهات〉

زانای بەناوبانگ (شێخ محمود غریب) دەفەرمووێ: یەكێ لەو ئافرەتانەی كە شیوعیەكان دەیانناردا بۆ دەرسی ژنان، كە پرسیاری موحریجم (ڕووشكێن)م لێ بكات و ببێتە مایەی گومان دروست كردن، بەفەزڵی خوا صالح بوو، لەساڵی كۆتایی كۆلێژی ئابوریدا، باسەكەی لەسەر ئابوری ئیسلامی بوو..

مامۆستاكەی هەرچەند چەپ بوو، لەبەر بەهێزی باسەكەی پلەی ئیمتیازی دایە. ڕۆژێك ئەو ئافرەتە پرسیاری لێكردم كە ئایا لە ڕۆژانی حەیزدا دەتوانێ قورئان بخوێنێ؟ كە وتم: نابێت، كۆمەڵێك خەفەتی خوارد و وتی: ئافرەت چۆن دەتوانێ بژی و هەفتەیەك قورئان نەخوێنێ؟!

پاشان ئەم ئافرەتە لە عێراقەوە کۆچی کرد بۆ وڵاتی عەرەبی ئیسلامی و دایەنگایەکی ئیسلامی نمونەیی دامەزراند. {بالانس، ئەندازیار عثمان، ل٤٧}.

بەڵێ زانای ئاینی شارەزا و بانگخواز لەسەر بەرچاوڕونی و تێگەیشتنی تەواو لە قورئان و سوننەت و خاوەنی ژیری و عیلم و حیلم و زمانی شیرین و دڵی دڵسۆز و پەرۆش، کاریگەری گەورەی دەبێت بۆ دابین کردنی ئارامی و ئاسایش لەناو دەرونی تاك و ژیانی خێزان و ناو کۆمەڵگادا..



## ٢) (حاکم) فەرمانڕەوایەك کەکاروباری وڵاتی بەدەستەوەیە:

**الحاكم الَّذي بِيَدِهِ أَمْرُ البِلادِ، فَهُوَ يردَعُ الظَّالِمُ، وَ يَأْخُذُ لِلْمَظْلُومِ حَقَّهُ..** فەرمانڕەوایەك کە کاروباری وولاتی بەدەستەوەیە، ئەم فەرمانڕەواو کاربەدەستە کە هەم دادگا و دادوەری هەیە، هەم دەسەلاتی جێبەجێکردنی هەیە، ئەگەر دادپەروەربێ ئەوا دەبێتە هۆکاری ئارامی و سەقامگیری ئاسایشی وڵات، چونکە بەدەسەلاتەکەی ڕێگە لە زاڵم و ستەمکار و نالەبار دەگرێ کە زوڵم و ستەم بکات، وە مافی سەر مەزلوم و ستەملێکراو و ماف خوراویش وەردەگرێتەوە.. ئیتر قەوم و هۆزی نابات کە تۆڵەی

خۆی بکاتەوە لە زاڵم و ستەمکار، بەڵکو پەنا بۆ یاسا و حکومەت دەبات بۆ وەرگرتنەوەی مافەکەی و ئەو کاتە وڵات ئارام و هێمن دەبێ. بەڵام ئەگەر دەسەڵاتی ووڵات خۆی ستەمکار بوو، یان بێ هێز و لاواز بوو، یاسای ووڵات وەکو تۆڕی ماسی وابوو، تەنها بچوکەکان و بێکەس و بێ دەستەڵاتەکانی پێوە دەبوو!

بەڵام حوت و دەسەڵاتدار و خاوەن پۆست و پلە و پایە و کەس و، هێز لەسەرو یاساوە بوون و قانونیان وەکو لاستیك بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاردەهێنا، ئەوا ئەو وڵاتە هەرگیز ئارامی و ئاسایش بەخۆیەوە نابینێ، چونکە خەڵکی بڕوایان بە یاسا نی یە و خۆیان هەوڵدەدەن مافی خۆیان وەبگرنەوە، یاخود لەناخەوە دەکوڵێن و لە دەرفەتێك دەگەڕێن کە ئەو دەسەڵات و هێزەی هەشە نەمێنێ، و ئەمجا هەمووان تادەچن.

هەربۆیە نەبونی دەسەڵاتی دادپەروەر، یان بوونی بەلاوازی، گەورەترین هۆکارە بۆ بەرپابوونی فەوزا و پشێوی و نائارامی.

**ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوای وڵاتەوە:**

أ) کۆمەڵێ لە زانایان دەڵێن: پێشەوای موسڵمانان و کاربەدەستانیان، پێوستە دادپەروەر و چاکەکاربن لەگەڵ موسڵمانان، توانای بەڕێوەبردنی کاروباری دانیشتوانیان هەبێ بەو

جۆرەی کە پێویست بێ. بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (أَنْ لا يَنازَعُوا أَمْرَهُ) ئاژاوە مەگێڕن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە شایەنی پێشەوایی بن، بەڵام ئەگەر گوناهبار و زۆرداربوون و ستەم کاربوون، شایستەنین بۆ ئەو کارە، خوا ئەفەرمووێ: ﴿لَا يَنَالُ عَهْدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾ البقرة.

ب) زۆرترین لە زانایان دەڵێن: ئارام گرتن لەسەر ستەمی فەرمانڕەوای ستەمکار و پێشەوایان چاکترە لە ئاژاوە نانەوە، نەوەك خوێن ڕێژی و کوشتن و تاڵان و سوتاندن و دزی پەیدابێ، دەستی خراپەکاران بەرەڵابێ و گێرە شێوێنی پەرەبسێنێ. {تەفسیری زمناکۆیی، ب١، ل٣٠٧}.

جێگەی داخ و خەفەتە، کە عێراق، کە کوردستانیشمان بەزۆر پێوەی لکێنراوە، هەمیشە فەوتاوی دەستی کاربەدەستی خراپ و زاڵم بووە، بۆیە هەمیشە ئاژاوە و شەڕ هەیە، هەر شەڕ و جەنگێك کۆتایی دێت و بەهەزاران کەس بەبێ تاوان دەبنە قوربانی. کەس نازانێ لەسەرچی هەڵگیرساو لەسەرچی کۆتایی هات، یەکسەر جەنگێکی تر دەست پێدەکاتەوە، لەوەتەی خەڵکی ئەم عێراقە و کوردستانیش لەگەڵی هەیە و بیرمان دێ، هەمیشە جەنگ و شەڕ هەیە و، بەردەوام ئارامی و ئاسایش و دڵنیایی بۆ هاوڵاتیان بونی نی یە. بەردەوام خەڵکی لە دڵەڕاوکێ و چاوەڕوانی ڕووداوی

نەخوازراودان! ئەمجا نەك هەر عێراق، بەڵکو زۆربەی وولاتانی عەرەبی و بەناو ئیسلامی هەمان دەردیانە و ئاسایش و ئارامیان جێگیر نی یە.

## ئەنجامەکانی ستەم و نادادی:

بەڵێ بەڕاستی ستەم و نادادپەروەری وڵاتە ئیسلامیەکانی فەوتاند و کردنیە پۆڕی خوراو، هەرچی بوترێ لەسەر ستەمی ئەو کاربەدەستە خوانەناسانە هێشتا دڵۆپێکە لەدەریا، لێرەدا تەنها دوو نمونە باس دەکەین:

١. دکتۆر ئەحمەد کوبەیسی، لە بەرنامەکەیدا **(وأُخر مُتشابِهات)** لە کەناڵی ئاسمانی دوبەی، وتی: ژنێك کارگوزاری قوتابخانەبوو. بەبێوەژن کۆشی لەکاتی ئابڵۆقەی ئابوری سەر عێراقدا، بەهەر داماویەك بوو، دوو کوڕی هەتیوی پێگەیاند. خالید تەمەنی (١٨) ساڵبوو، ئەحمەدیش (١٧) ساڵبوو، ماڵیان لای سایلۆی بەغدا بوو، کە سایلۆ پڕ دەکرا لە گەنم، هەندێك بەو ناوەدا دەڕژا، ئەم دوو کوڕە کۆیان دەکردەوە لەنەبونی و نەداریدا، خەبەریان لێدان و گیران. دایکەی داماو خۆی گەیاندە صەدامی خوێن مژی دیکتاتۆر و زۆری لێ پاڕایەوە کە منداڵەکانی بۆ بەربدات.. ئەویش لە وەڵامدا پێی وت: عەدالەت ڕێی خۆی دەگرێت، پاش ماوەیەك هەردوو کوڕەکەی لە سێدارەدا!! بەتاوانی ئەوەی

یاریان بە قوتی شەعب کردووە!! دایکەی جەرگ سوتاویش دوعای لە صەدام کرد و وتی: خوایە نەیکوژی تا مەرگی هەردوو کوڕەکەی دەبینێت. ئاخری ئەوەبوو، دوعاکەی گیرابوو لە موصڵ و لەو ماڵەی خۆیان شارد بۆوە، خەبەریان لێدان و ئەمریکیەکان کوشتیانن، دەڵێن قوصەی و کوڕەکەی بەرگریان کردبوو، عودەیش لە ئاودەستی ماڵەکەدا خۆی شاردبۆوە.

زۆر سەیرە، سەدامی دیکتاتۆر و ستەمکار، چوارسەد ملیار دۆلاری دا بەچەك و تفاقی جەنگ، عێراقی کاول کرد و سەد ساڵ هێنایە دواوە، ئەوە یاری کردن نی یە بە قوتی شەعب، بەلاّم دوو عەلاگە گەنم داماوێك لەسەر زەوی کۆیبکاتەوە یاری یە بە قوتی شەعب!!.

٢. بانگخوازی میسری: سەید موختار البنا دەڵێت: لەبەندینخانەدا قەزیەیەك هەبوو پێی دەوترا (قەزیەی خەو)، لاوێکی ڕوو لەخوا لەخەویا لەگەڵ هاوەڵێکیدا چوو بوو (کارتەر) بکوژێت و دەگیرێت.. ئەم خەونە بۆ ئیمامی مزگەوتەکەیان دەگێڕێتەوە، بەڵکو مانای خەونەکەی بۆ لێکبداتەوە، ئیمامی مزگەوتەکەش سەر بەدەزگای ئەمن دەبێت و خەبەری لیّ دەدات!!.

لاوەکە دەگرن و مەحکەمەی دەکەن، گوایە ئەگەر شتی وای نیاز نەبووە، چۆن خەوی وای بینیوە، ئینجا برادەرەکەشی دەگرن و دەڵێن: دیارە تۆش ئەمەی باس کردووە لەگەڵتاو شتێکتان لەژێر

سەردایە و سەرەنجام هەشت ساڵ لەسەر ئەم خەونە بەندیان کردن!!!. {هەزار و یەك، ئەندازیار عثمان، ب٢، ل٢٩٢}.



### ٣) میللەتی هۆشیار:

سێیەم پارێزەری ئەمن و ئاسایش هۆشیاریە، بەڵێ هەر گەلێك ڕۆشنبیر و چاوكراوەبن و هۆشیار و بەئاگابن، كەسانی تورە و پەست نابن، بەڵكو هەمیشە نەرم و نیان و لێبوردە و خاوەن ڕێز و بەسۆزن لەناو یەكتریدا و، لەسەر بچوكترین شت و هەڵە پەلاماری یەكتری نادەن، بەڵكو عوزر بۆ یەكتر دەهێننەوە، داوای لێبوردن لە یەكتر دەكەن، بەتەعبیری (رُحَماءُ بَيْنَهُم)... جا گەل و میللەتی ئاوا دورە لە ئاژاوە و شەڕ و پەشێوی.

ئەگەر هەڵە و كەم و كورتیەك ڕوویدا بەداوای لێبوردنێك و زەردەخەنەیەك و سلاوێكی گەرم كۆتایی پێ دێنن و ناهێڵن بگاتە دادگا و ئاسایش و پۆلیس.

**بەسەرهاتێك:** لە (چەرچڵ)ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیایان پرسی: ئێوە وەك بەریتانیەكان، تائەوسەری زەریای هیندی دەڕۆن و دەوڵەتی ئیستعماری ڕۆژهەلاتیهیند دروست دەكەن، ئەی بۆچی ناتوانن (ئێرلەندای باكور)كەلەپاڵ دەستتاندایە، بخەنە ژێر ڕكێفی خۆتانەوە؟ چەرچڵ گوتی: ئێمە دوو هۆكاری گرنگمان پێویستە كە

لە (ئێرلەندەدا) دەستمان ناکەوێت.. پرسیان ئەو دوو هۆکارە چین؟!.

چەرچڵ گوتی: زۆرینەی نەزان و کەمینەی خائین!. {بڕیار، ژ: ٨١، ل٢٤}.

## گەلی هۆشیار و یەکگرتو دوژمن زەفەری پێ نابات.

بەسەرهات

هەر گەلێك هۆشیار بێ و لەناو خۆیدا یەکگرتوو بێ و ڕێز لەیەکتری بگرێ و حەسودی و چاوچنۆك نەبن بەرامبەر یەکتری، هیچ کات دوژمن ناتوانێ ئاژاوەیان تێدا دروست بکات. دەگێڕنەوە لە سەدەکانی ناوەڕاست، پاشایەك حوکمی گەلێکی ئازاد و سەربەرزی دەکرد، ئەو گەلە وێڕای سادەیی و دڵپاکی و پەیوەندی مرۆڤانەی باشیان لەگەڵ یەکتر، هەرگیز لەبەرامبەر یەکتر ناهەقی و زوڵم و ستەمدا بێدەنگ نەدەبوون، هەرگیز نەیان دەهێشت نە پاشا نە وەزیر و دەست و پێوەندەکان ستەمیان لێبکەن، چونکە کاتێك یەکێکیان ستەمی لێ کرابا، ئەوا هەموو بەیەك دەست و بەیەك دڵ و بەیەك گیان، پارێزگاریان لێ دەکرد و ئەو ستەمەیان لێ دور دەخستەوە!!

شا بەم کارەیان هەراسان بوو، سەری سوڕمابوو، دەسەوسان نەیدەزانی چی بکات. پرس و ڕای بە وەزیرەکان کرد تا چارەسەرێ

بدۆزنەوە. دەیویست ڕێگا چارەیەك بدۆزێتەوە تا بەئارەزووی خۆی چۆنی دەوێت ئاوا حوكمی ئەم گەلە بكات. بەڵام بەم شێوەیەی ئێستا هیچی بۆ ناكرێت! یەكێك لە وەزیرەكان كە زۆر شەیتان و فێڵباز بوو، ڕێنمایی كرد بۆ گرتنە بەری سیاسەتی (هێلكەی دزراو!!).

بەپێی مەرسومێكی شاهانە ڕاگەیەندرا كە هەر خێزانێك دەبێت (٥) هێلكە بهێنێت بۆ شا لە هەر جۆرێك بێت. خەڵكیش هەموو بەپێی ئەو فەرمانە هەڵسان بە كۆكردنەوەی هێلكە و بردنی بۆ ماڵی شا! دوو ڕۆژ دوای ئەوە بانگەواز كرا هەر كەسەو بێت و هێلكەكان كە هێناویەتی بیباتەوە، دووبارە خەڵكیش بەپیری بانگەوازەكەوە هاتن، هەر كەسەو بۆ بردنەوەی هێلكەكانی خۆی ڕووی كردە ماڵی شا، بێ ئەوەی بزانن مەبەست لەم كارە چی بوو!!

لەوێدا شا و وەزیر و دەست و پێوەندەكان ڕاوەستابوون و چاودێری خەڵكەكەیان دەكرد، لەكاتی هەڵگرتنی هێلكەكان.. دەزانن چیان بەدی كرد؟! بینیان ئەوا هەر كەسە و دەست دەبات بۆ گەورەترین هێلكە، ئەگەر ئەو هێلكەیەش نەبێت كەخۆی هێناویەتی!!

لەوێدا وەزیری خاوەن پیلان بەشای گوت: ئێستا دەتوانیت چیت دەوێت لێیان بكەیت و لەوەودوا بەئارەزووی خۆت حكومڕانیان بكەیت. چونكە هەریەكە و بەشی ئەوی تری بردوو

فێری حەرامخۆری بوو، هەریەکە و چاوی بڕیە ئەوەی لە دەستی براکەیدایە.

وەزیر گوتی: قوربان، دوای ئەمە هەرگیز بەیەکەوە و بەیەك دڵ کۆنابنەوە دژی تۆ!!.

لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

أ) هەمیشە دوژمن بۆ زاڵبوون بەسەرماندا، تۆوی دووبەرەکی و دوژمنایەتیمان لەنێواندا دەچێنێت.

ب) ئەو کاتەی چاو دەبڕینە ماڵی یەکتر، ئیتر دڵەکان لەیەکتر دور دەکەونەوە و برایەتی و خۆشەویستی ماڵئاوایمان لێدەکات.

ت) تا خۆمان خراپ نەبین و سیاسەتی هێلکەی دزراو قبوڵ نەکەین، خوای گەورە کەسانی خراپەکار ناکات بەدەسەڵاتدار بەسەرمانەوە!! کەواتە خۆمان چۆن بین دەسەڵاتیش ئاوا دەبێت. {بڕیار، ژ:٦٠، ل٥}.



## ٤) جێبەجێ کردنی حوکمە شەرعیەکان:

بەڵێ شەریعەتی ئیسلامی لەلایەن خالیق و دروستکەری مرۆڤەوە نێردراوە، کە هەر ئەو خوایەی دروستی کردوین، خۆی دەزانێ بەچی ئیصلاح دەبین، وە بەچی لە ژیانێکی هێمن و خۆش و پڕ لە ئاسایشدا ژیان بەسەر دەبەین. هەر بۆیە حوکمە شەرعیەکان ئەوپەڕی حیکمەت و کاربەجێ یی خوای پەروەردگاری تێدایە، بە ئەوپەڕی جوانی و دادپەروەریەوە.

بەلاّم دەبێ ئەوە بەباشی بزانین کە جێبەجێ کردنی حوکمە شەرعیەکان بۆ لەناوبردنی ئاژاوە و فیتنە و خراپەکاریە، نەك بەوەی هەر کەس لە ئاستی خۆیەوە هەڵسێ جێبەجێ یان بکات و خۆی بکات بە نوێنەری شەرعی ئیسلام و خەڵکی تەمبێ بکات. بەڵکو ئەم حوکمە شەرعیانە پێویستە لەلایەن دادوەربە پێی دەسەلاّت و جێبەجێکردنەوە، جێبەجێ بکرێن و ڕەچاوی تێگەیشتنی خەڵکی لە حکومە شەرعیەکان و، خواناسیان و دینداریان و، پاشان بارودۆخی دەرونی کۆمەلاّیەتی و ئابوری یان بکرێ. وە تەماشای بارودۆخی سیاسی نێودەوڵەتی بکرێ، کە ئایا گونجاوە بۆ جێبەجێ کردنی ئەو حوکمە شەرعیانە یان نا؟!

بەلاّم بەدڵنیاییەوە، دابین کردنی ئاسایشی و ئەمن و ئەمان و نەهێشتنی دڵەڕاوکێ و دابین کردنی ژیانێکی هێمن و، خۆشگوزەران تەنها و تەنها بەجێبەجێ کردنی حوکمە شەرعیەکان دەبێ.

## تۆڵەی کەسی کوژراو:

لەوانەی ڕابردوودا ئەوەمان کرد، کە خوای حەکیم و کاربەجێ بۆ پاراستنی خوێن و گیانی مرۆڤ، کوشتنی قەدەغەکردووە و بڕیاریداوە کە: هەرکەسێ بەناحەق کەسێك بکوژێ، دەبێ بکوژرێتەوە.

لەم وانەشدا بەویستی خوا (إن شاء الله) شتێکی تر لەسەر بابەتی ـ قصاص ـ و تۆڵەکردنەوە و کوشتنەوەی بکوژ قسە دەکەین:

لەنێو عەرەبەکاندا لەسەردەمی نەفامیدا باو بووە، کە ئەگەر تیرەیەك بەهێزتر بوایە، منداڵیان لێ کوژرابا، دەیانگوت: پیاوی گەورە نەبێ تیرەکەتانمان تەسلیم بکەن بیکوژینەوە، ئەگەرنا ڕازی نابین، یان جاری واهەبووە یەکێکیان لێدەکوژرا دەیانگوت: دەبێ (١٠) نەفەرمان تەسلیم بکەن، یان دوو نەفەرمان تەسلیم بکەن بیانکوژینەوە، خوا (**سُبْحانَهُ وَتَعالى**) لێرەدا ئەو بنچینە شەرعی یە ڕادەگەیەنێ کە (نەفس بە نەفسە). ﴿أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ﴾المائدە: ٤٥.

کەواتە: کەسێك کوژراوە لەبەرامبەردا کەسێك دەکوژرێتەوە، کە ئەویش بریتیە لە بکوژەکە، نەك کەسێکی دیکە. ئەمجا خوای

پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿فَمَنْ عُفِىَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَىْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَـٰنٍ﴾ البقره: ١٧٨.

واتە: ئەگەر یەکێك شتێکی لێ بوردرا، چاوپۆشی لێکرا لەبەشێك لەو هەقە لەلایەن برایەکەیەوە، لێرەدا خوای کاربەجێ کوژەر و کوژراوی بەبرای یەك داناون، بۆئەوەی بەبیریان بێنێتەوە کە ئێوە هەرچەندە دەستتان چۆتە خوێنی یەکدی، بەڵام هەر برای ئیمانی یەکن! بۆیە لەگەڵ یەکدا بەرەحم بن، ئەگەر کەسێك لەلایەن برایەکەیەوە چاوپۆشی لێکرا، واتە لەلایەن ئەو تەرەفەوە کە لێیان کوژراوە، بۆ وێنە: چاو پۆشیەکە ئەوەیە کە بڵێن: قەیناکات تۆڵە ناسێنینەوە و خوێنمان دەوێ ﴿فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ باخاوەن حەقەکە، واتە: تەرەفی کوژراو، بەشێوەیەکی چاك و باش، بەدوای ئەو حەقەی خۆیان بکەون، کە بریتیە لە خوێن (دیَّة).

﴿وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَـٰنٍ﴾ تەرەفی بکوژیش بەشێوەیەکی باش و چاك، ئەو حەق و مافەیان تەسلیم بکەن، کە خوێنەکەیە، ﴿ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ﴾. ئائەوە سوك کردنێکە، وەبەزەیی نواندنێکە لە پەروەردگارتانەوە، لە شەریعەتی جولەکەکاندا تەنها تۆڵە (قصاص) هەیە و خوێن و لێبوردن (عفو) نی یە، وە لە شەریعەتی نەصرانیەکاندا، تەنها لێبوردن (عفو) هەیە و تۆڵە

سەندنەوە نیە، بەلاَم لە شەریعەتی ئیسلام هەر سێكی داناون: (تۆڵە و خوێن و لێبوردن) ﴿فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ البقرە: ١٧٨.

واتە: ئینجا هەر كەسێك دوای ئەوە دەستدرێژی كرد، ئەوە ئازارێكی بەئێشی بۆ هەیە. ﴿بَعۡدَ ذَٰلِكَ﴾ دوای ئەوە، یانی چی؟ دەگونجێ مەبەست پێی تۆڵە (قصاص) بێ، واتە: كە كەسێك لەلایەك كوژراوە، مادام بكوژەكە كوژرایەوە، نابێ چیدیكە دەست درێژی بكەن و بڵێن: دەبێ یەكێكیدیكەش بكوژین، وە دەگونجێ وشەی ﴿بَعۡدَ ذَٰلِكَ﴾ مەبەست پێی خوێن بێت..

واتە: دوای ئەوەی كابرا خوێنی وەرگرتووە، نابێ بە بكوژ بڵێ: دەتكوژمەوە، وە دەگونجێ مەبەست پێی عەفو بێ، مادام یەكێك لە تەرەفی كوژراوەكە كە خاوەنی صەلاَحیاتە، بكوژەكەی عەفو كرد، تازە بۆی نی یە بڵێ: ئەمڕۆ لێی دەبورم، بەلاَم بەیانی ئەگەر دەسەلاَتم هەبوو دەیكوژمەوە، بۆیە دەفەرمووێ: هەر كەسێك دەست درێژی بكات دوای ئەوە، یانی: دوای تۆڵە، یان دوای خوێن، یان دوای عەفو، ئەوە ئازارێكی بە ئێش و ژانی بۆ هەیە لەدوا ڕۆژدا. وە لەدنیاشدا دەكوژرێتەوە، ئەگەر كەسێك بكوژێ بەناهەق. {تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز، عەلی باپیر، ب١، ل٦٦٦}.

بەڵێ، کۆتایی هێنان بە کوشتن و پاراستنی خوێن و گیانی مرۆڤ، تەنها بەجێبەجێ کردنی ئەم حوکمە جوانە دەبێت، ئەینا دەبینین بەپێی یاسای دەستکردی مرۆڤ، بکوژ چەند ساڵ زیندان دەکرێ. هەموو ڕۆژێکی مردنە، ئەمجاش دوای بەربونی هەر هەوڵی کوشتنەوەی دەدرێ و فیتنەکە گەورەتر دەبێ و، ئاگرەکە چەندین کەسی بێتاوان و بێ ئاگا دەکاتە قوربانی!

## تۆڵەی کەسی دز

پاشان شەریعەتی ئیسلامی بۆ پاراستنی ماڵ و سامانی خەڵکی، کە بە ئاسودەیی سەفەر بکەن و ماڵیان بەجێبهێڵن و دڵنیابن لە پاراستنی سەروەت و سامان و ڕەنجی چەند ساڵەیان، بڕیاری داوە، هەر کەس دزی بکات دەبێ دەستی ببڕدرێ. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٣٨﴾﴾ المائدە.

واتە: دەستی پیاو و ژنی دز، لە تۆڵەی دزی کردندا ببڕن، لەتۆڵە و سزای دزیکردندا، بڕیارێکە لەخواوە دراوە، دەبێ ئەنجامی بدەن. خواش زۆر بەتوانا و باڵادەست و کاربەجێ و کارزانە، هەموو شتێکی پڕ حیکمەتە، بەڵێ، تۆڵەی پیاو و ژنی دز، بڕینی دەستی ڕاستیانە، هەتا دەگاتە مەچەکیان، بەو مەرجە کە دزراوەکە لەجێی

شیاوی خۆیدا بوبێ، ئەمیش بەنهێنی بردبێتی و نرخیشی (١/٤) ی دینارێكی زێڕ بێ و دزەكەش بالّغ و ژیربێت.

**هەلّوێستەیەك:** دەبێ لە كۆمەلّگەی ڕاستەقینەی ئیسلامدا ئەوەندە پێداویستیەكانی ژیانی مرۆڤ جێبەجێ بكرێن، برِا و برِ بیر لە دزی نەكاتەوە، ژیانیی و گوزەرانی و، پەروەردەی دەسەبەر بكرێت، لەدابەشكردنی ئیش و كار و مالّ و ساماندا، عەدالەت و دادوەری ڕەچاو بكرێت. دەبێ لەگەلّ ئەمانەیشدا، خاوەنداریەتی تاكیش (**ملكيَّة فرديَّة**) لەسەر بنەمای حەلاّلّ پەرەی پێ بدرێ و بشكرێتە دەزگایەكی خێر بۆ كۆمەلّگا، جائەگەر ئاوا كرا بۆ گشت كەسێك، دلّنیابە ئیتر بیر لە دزی نامێنێ..

خۆ ئەگەر كەسێكیش پاش ئەو هەموو دەستەبەر بوونە، دزی كرد، ئیتر هەقیەتی دەستی ببڕدرێ. چونكە دزیەكەی تەنیا بۆ دەست درێژی لە (ئەمن) و ئاسایشی ولاّت و كۆمەلّ و كۆمەلّگا بووە، نەك بۆ ژیان و بژێوی، بەلاّم لەگەلّ ئەمانەشدا، گەر شوبهە و گومانێك هەبوو لە دزیكردنەكەیدا دەستی نابڕدرێت. بەلّێ، تاك هەموو كات مافی خۆیەتی بەئارەزووی خۆی بخوا و بخواتەوە، جلوبەرگی جوان و قەشەنگی هەبێ، خانووبەرە و باخ و باخاتی هەبێ، جێی حەوانەوە و ئیسراحەتی هەبێ..

بەلّێ هەقە كۆمەلّ، یان دەولّەت ـ كە جێگری كۆمەلّە ـ ئەم چەند پێداویستیانە جێبەجێ بكات بۆ تاك، ئەگەر توانای كاركردنی

هەبوو، دەبێ فێری کاری بکەن، دەبێ کار و ئامێری کاری بۆ فەراهەم بێنن. خۆ ئەگەر نەیدەتوانی کاربکات جا ئەگەر کار نەبوو بیکات، یان ئامێرەکەی نەبوو، یان دەیتوانی کاربکا، بەلاّم کارنەبووبیکات، یان پەشێوەی کاتی هەبوو، یان بەردەوام هەبوو، بەلاّم پێی نەدەژیا، دەبێ لەم ڕێگایانەوە ژیانی مسۆگەر بکرێت:

یەکەم: لەڕێی خێزان و بنەماڵەکەی خۆیەوە، ئەوانەیان نەفەقەی ئەمیان لەسەرە.

دووەم: لەڕێی دەسەلاّتدارانی گەڕەکەوە.

سێهەم: لە (بیت المال) بەشێ زەکاتی دەدرێتێ، جائەگەر بە زەکاتەکە نەدەژیا، ئەوسا دەوڵەت ژیانی ئەو خەڵکە هەژارە دەخاتە سەر شانی دەوڵەمەندەکان.

جائەگەر ئاوا بەدەم هەژار و بێ نەواوە بچین، کێ دزی دەکات؟! خۆئەگەر لەو حاڵەتەشدا هێشتا هەر دزی کرد، دیارە برسیەتی نەبووە، بەڵکو بۆ پێکەوەنانی ماڵ و سامانە لە ڕێگەی ناشەرعیەوە. ئیسلامیش ڕێگە بەکەس نادا لە خت و خۆڕایی ئاسایشی کۆمەڵگە بخاتە خەتەر و ترس و لەرزەوە. ماڵ و سامانی ئەم و ئەو فەرهود بکات. وە حورمەتی ماڵەکان و دوکان و بازاڕ بشکێنێ و قفڵ بکاتەوە.

بەلاّم ئەگەر دزەكە بیانویەكی شەرعی هەبوو، وەیان لەو ماڵەدا كە دزیویەتی شوبهەیەك هەبوو، لە حاڵەتی ئاوادا، یاسای: (إدْرَأُوُوا الحُدُودَ بالشُّبُهات) دێتە پێش، بۆیە ئیمامی عومەر، لەوشكە ساڵیەكەدا دەستی دزی نەدەبڕی. وەیان ئەو كاتە خولاّمەكانی (إبن حاتب) لە پیاوێكی هۆزی (موزەنیە) وشترێكیان دزی، پاش لێكۆڵینەوە لە هۆی دزی كردنەكە، دەركەوت كە لەلایەن ئاغاكەیەوە، برسی كراون، بۆیە دزیان كردووە، ئیتر دەستی نەبڕین و ووشترەكانیشی بە ئاغاكەیان بژارد، بۆئەوەی ژیر ببیّ و جارێكی تر ئەو خزمەتكارانەی برسی نەكات! .

بەڵیّ شەریعەتی ئیسلام بەر لە تۆڵە وەرگرتن، هەموو رێگەیەكی (ویقایە) و خۆپاراستن دەگرێتە بەر و بڕوبیانوی كەس ناهێڵێت بۆ تاوانكردن. پاشان ئەگەر تاوانێك ڕوویدا، تەنیا تۆڵەی تاوانبارەكە دەدات، بیّ شك بەدانانی تۆڵەی دەست بڕین شەریعەتی ئیسلام دەتوانیّ هۆكارە نەفسیەكانی دزی ڕیشەكەن بكات، پاش ئەوە كە هەموو ڕێیەكی لە دزی گرت. دیارەكە بڕینی دەستی دز لەسەر ئەم بنەمایە دانراوە، نەك هەركەسیّ دزی كرد، بیانوی ببیّ، یانەبیّ، دەستی ببڕدرێت.

ئاشكرایشە تەنیا چارەسەرێك بۆ كاری دزێوی دزی، هەر ئەو تۆڵەی دەست بڕینەیە، هەر ئەوەیە دەتوانیّ وای لێبكات كە

جارێکی تر بیر لە ماڵ و سامانی کەسێکی تر نەکاتەوە و، هەمیشەش چاوی لەدەستی خۆیەتی و دەزانێ بۆچی براوە.. بەلام زیندانی کردنی دزەکە یاساکانی ئەمڕۆ هەڵیان بژاردووە و پەسەندیان کردووە، بێگومان ئەو دەورە نابینێ و هەر ئەوەندەیە کە دزەکە بۆ ماوەیەك لە ئیش و کار ڕاگیراوە و، هەرکە ئازاد بوو دەگەڕێتەوە سەر کارەکەی خۆی، لە جارانیش زیاتر ـ زۆر کەس لە دزیدا گیراوە و زیندانی کراوە، کەبەربوە بۆتە شادز، ئەوەندەی خراپەکارو دزی تر لە زینداندا بینیوە، ئەوەی پێشتریش نەیزانیوە فێربووە !!. {تەفسیری ڕامان، أحمد کاکە محمود ل٢٠٨}.

<u>پرسیارێك</u>: ڕەنگە بپرسێ و بڵێ: باشە دەستێك کە لە ئیسلامدا خوێنەکەی یەگجار زۆرە و نزیکی سێیەکی خوێنی مرۆڤە، ئەی چۆن دەکرێ لەسەر ڕوبعە دینارێکی ئاڵتون کە زۆر کەمە و بێ نرخە ببڕدرێ؟! زانای ناودار (عَلَمَ الدِّين السَّخاوي) لە وەلامدا فەرموویەتی:

**يَدٌ بِخَمْسِ مِئِينٍ هكَذا فُدِيَتْ**
**لكِنَّها قُطِعَتْ فِي رُبْعِ دينارٍ..**
**حِمايَةُ النَّفْسِ أَغْلاها وَ أَرْخَصُها**
**حِمايَةُ المالِ فَافْهَمْ حِكْمَةَ الباري.**

**يَعْني: إنَّما دِيَتُها خمسمائة دينار، حِمايَةً لِلْنُفُوسِ، حَتَّى لا يجترئَ أَحَدٌ عَلى قَطْعِ أَيْدي النَّاسِ، وقُطِعَتْ فِي رُبْعِ دِينارٍ حِمايَةً لِلأَمْوالِ، حَتَّى لا يَجْتَرِئَ أَحَدٌ عَلى السَّرِقَةِ).**

واتە: بۆیە لە شەرعدا خوێنی دەستی مرۆڤ بە پێنج سەد دیناری ئاڵتون ـ دیارە مەبەست پێی زەمەنی خۆی بووە، نەك ئێستا ـ دانراوە، بۆئەوەی لاشەی مرۆڤ پارێزراو بێ و كەس جورئەتی ئەوە نەكات دەستی خەڵكی ببڕێ و بپەڕێنێ، چونكە دەبێ بزانێ كە خوێنێكی زۆر قورس و گرانی دەكەوێتە سەر. بەڵام هەر ئەو دەستە لەسەر دزینی ڕوبعە دینارێكی ئاڵتون دەبڕدرێ ـ بەهاتنە جێی مەرجە شەرعیەكان ـ ئەمەش بۆ پاراستنی ماڵ و سامانی خەڵكی، بۆئەوەی كەس جورئەتی ئەوە نەكات كە دەست بۆ ماڵ و سامانی كەس بەرێت و دزی لێبكات. {التَّفسيرُ الثَّمين ـ إبنُ عُثَيمين، ج٦ ص١٨٤}.

إبن الجوزيش قسەیەكی جوانی هەیە لەسەر ئەو مەسەلەیە و فەرموویەتی: (**لَمّا كانَتْ أَمينَةً كانَتْ ثَمينَةً، فَلَمّا خانَتْ هانَتْ**}.

واتە: ئەگەر دەست ئەمین و پاك بوو، نرخی گرانە، ئەگەر خیانەتی كرد، نرخی هەرزان و كەم بایەخە و دەبێ لەسەر شتی كەم نرخ ببڕدرێ!. {تەفسیری كوردی، مەلای گەورە ب٢، ل٢٩٠}.

## سەرخۆشی زیانبار، دەبێ تەمێ بکرێ:

بەڵێ ئیسلام بۆ پاراستنی عەقڵ و هۆشی مرۆڤ و، پاراستنی مرۆڤ لەوەی سەرخۆش ببێ و، بەسەر خۆشی بەربێتە گیانی ماڵ و منداڵ و دراوسێ و هاوڕێ و هاوپیشەی و، تەقە لە خەڵکی بکاو خەڵك بکوژێ و بریندار بکات.. یان بەسەرخۆشی ئوتومبێل لێبخوڕێ و کارەساتی دڵتەزێن ڕووبدات. بۆ ڕێگرتن لەو سەرخۆشانە کە ئاسایش و هێمنی شار و گەڕەك تێك بدەن، هاتووە تەمێ کردنی عەرەق خۆری بەئاشکرای داناوە. کە بەپێی بارودۆخ و بۆچونی فەرمان ڕەوای وەخت دەگۆڕێ. نەك بە پارە و غەرامە لێی خۆش ببن و ئەویش خراپتر بکات.

بەڵێ مرۆڤی عارەق خۆر بەسەرخۆشی ئەمن و ئەمان دەشێوێنێ و پێویستە ڕێی لێبگیرێ. زانایان بەزمانی شیرین و بەڵگەی عەقڵی و زانستی سەردەم بۆی ڕوون بکەنەوە، کە مرۆڤ بەسەرخۆشی توشی چ سوکایەتی بەخۆکردنێك دەبێ و بە عەرەق خۆری چۆن جەستەی دادەڕزێ و سەرەنجام زەلیل دەبێ، بۆئەوەی ئەو عەرەق خۆرە بیربکاتەوە و وازبێنێ.

**بەسەرهاتێك:** شێخ محمود غەریب دەفەرمووێ: برادەرێکی بازرگانی ئاڵتون لە قاهیرە، کە پیاوێکی بەڕەوشت و دەستکراوە بوو بۆ کارمەندەکانی و خەڵکی تر، ڕۆژێك مەی خواردبۆوە و

سەمای دەکرد، لە ئوتێل خەڵکانێك لێی کۆببونەوە و چەپڵەیان بۆ لێ دەدا، منیش بۆم تۆمارکرد. بەیانیەکیان سەلامی لێکردم، بەدەنگێکی نزم وەڵامی سەلامەکەیم دایەوە، کە گوێی لێ نەبێت! دواتر هات بۆلام و منیش ئەو مەشهەدەم بۆ لێدایەوە کەبەو هەموو شان و شەوکەتەوە، مەی خواردنەوە چۆن عەقڵی بردووە و بۆتە گاڵتەجاڕ، ئەمە وای لێکرد تەوبە بکات و پەیمانی دامێ کە ئیتر ئەوە دواجار بێت شتی وابکات.

بەڕاستی دوایی ـ بینیمەوە کە خواپەرستێکی باشی لێدەرچوو، لە سوجدەکانیا زۆر دەمایەوە و زۆر بە خشوعەوە پەرستیشی دەکرد کە زۆر پێی دڵشادبووم. بەڕاستی هەرکەس ئەوەی لە سەرخۆشیدا دەیکات بۆی لێبدرێتەوە، بڕواناکەم جارێکی تر بگەڕێتەوە سەری و خۆی بکا بە سینەمای دەورووبەری. {بالانس، ئەندازیار عثمان، ل٤٥}.

## بوختانچی دەبێ تەمێ بکرێ:

هەروەها ئیسلام بۆ پاراستنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی و پاراستنی کەسایەتی مرۆڤەکان، بوختانی حەرام کردووە ـ(کە بوختان بریتیە لەوەی کەسێك تۆمەتێك بداتە پاڵ کەسێك، کە ئەو کەسە بێئاگا و بێ بەری یە لەو کارە)ـ بەتایبەت ئەگەر تۆمەت و بوختانەکە بۆ ڕەوشت و ئەخلاقی ئەو کەسەبوو، ئەوا دەبێ ئەو بوختانچیەکە

تۆمەتی بەد ڕەوشتی و زیناکاری داوەتە پاڵ ئەو مرۆڤە بێ تاوانە، یان دەبێ چوار شاهیدی دادپەروەری ڕاستگۆ پەیدا بکات، کە بەمەرجە شەرعیەکان شاهیدی بدەن کە بەچاوی خۆیان فلاَن کەسیان بینیوە کە خەریکی داوێن پیستی بووە بەکردار. ئەمجا ئەو قسەکەرە بەری دەبێت. ئەینا خۆی و شاهیدەکانی، داری حەددی بوختانیان لێ دەدرێ و تەمێ دەکرێن.

بەم حوکمە شەرعیەش بوختان بۆ کراوی ستەملێکراو، دڵی ئاو دەخواتەوە و ئیتر ناچێ بۆ خۆی حەقی خۆی بکاتەوە، بەوەی ئەویش بوختان بۆ ئەو هەڵبەستێ و کەسایەتی لەناوبەرێ. یان بچێ لێی بدات و بیکوژێ و فیتنە و شەڕی بنەماڵەکان دروست ببێ و ئاسایشی کۆمەلاَیەتی بکەوێتە مەترسیەوە..

هەروەها ئەگەر کەسێکیش لە ژن و لەپیاو، لە کوڕ و لەکچ، بەناپیاپانی ئازادانەی خۆی، یان چوار شایەتی دادپەروەری متمانەداری ڕاستگۆ، کە هیچ ناکۆکی و دوژمنایەتیەکیان لەگەڵ ئەو کەسەدا نەبوو، چەسپاکە فلاَن کەس زینای کردووە ـ کە زۆر دەگمەن ئەمە دەچەسپێ ـ ئەمجا کەس مافی گوللە باران کردن و کوشتنی ئەو زینا کارەی نی یە. بەڵکو حاکمی ولاَت، بەپێی شەرع سزای دەدات و ئیتر ئەم بابەتە کۆتایی پێدێت و ئاسایش و ئارامی بنەماڵەکان ناشێوێ.

بەم شێوەیە و بەجێبەجێ کردنی حوکمە شەرعیەکان، وولات پارێزراو دەبێ لەشەڕ و خراپە و فیتنەی: مرۆڤ کوژ و دز و سەرخۆش و داوێن پیس و بوختان چیان، کە هەر ئەمانەشن مایەی نائارامی وولات و شار و گەڕەك و ماڵ و خێزان!.



### ٥) دەزگاکانی پۆلیس وئاسایش و پێشمەگە:

شتێکی تر کە دەبێتە هۆی پاراستنی ئەمن و ئەمانی ولاّتمان و، چەسپاندنی ئاسایش و ئارامی و، ڕێگری کردن لە ئاژاوەگێڕ و خراپەکاران: بریتیە لە دەزگاکانی پۆلیس و ئاسایش و هێزی پێشمەرگە، یان وەکو ئەمڕۆ پێی دەوترێ: هێزەکانی وەزارەتی ناوخۆ.

بەڵێ بەڕاستی، دەزگا ئەمنیەکانی پۆلیس بەهەموو بەشەکانیەوە، پۆلیسی مەحەلی، پۆلیسی نەهێشتنی تاوان، پۆلیسی هاتوچۆ، پۆلیسی بەرگری شارستانی، پۆلیسی دارستان و ژینگە، هەروەها هێزەکانی ئاسایش لەناو خۆدا و هێزی فیداکاری پێشمەرگەی کوردستان بۆ پاراستنی سنورەکان، دەبێ دەور و ڕۆڵیان بەرز بنرخێنرێ و هەتا ئەوان بەهێز و تۆکمە بن ئەمن و ئەمانی خاك و خەڵکمان پارێزراوە. جالەبەر ئەوە دەبێ ئەوانیش لە پلەدار و ئەفسەرە بالاّکانەوە تا پلەی خوارەوە، ئاگاداری ئەو پلە و

پایە گرنگەی خۆیان بن و شەو و ڕۆژ بخەنە سەر یەك بۆ پاراستنی ئەمانی ولات و خەڵك. هەروەها لەخوا غافڵ نەبن و بونی هێزی دەستیان و دەست ڕۆیشتوییان، نەبێتە هۆی ئەوەی ستەم لەکەس بکەن و بەبێ مۆڵەتی دادوەر و، ڕەچاو کردنی بنەماکانی شەرع و پاراستنی مرۆڤ، هەڵ نەکوتنە سەر هیچ کەسێك و، کەس ئازار نەدەن.. بەڕاپۆرتی ڕاپۆرتنوسێکی نەفس نزم خەڵکی بێتاوان بە تاوانبار سەیر نەکەن و، هەمیشە بنەمای: تۆمەتبار بەریە لەو تاوانانەی کە دەدرێتە پاڵی، تاوەکو یاسا و حوکمی داد و دادوەر بەسەریدا ساغی دەکاتەوە، ڕەفتار لەگەڵ گیراو و هەواڵ لێدراو بدەن...

بەڵێ پێویستە پۆلیس و ئاسایش خۆی بناسێ، ئەمان و ئاسایش بڵاوبکاتەوە، نەك ترس و تۆقاندن. هیچ کات بەو هێز و دەسەڵاتەی هەیەتی فەخر و شانازی بەسەر کەسدا نەکات. چاوکراوەبێ، نەفس بەرز بێ و نەهێڵێ کەسانی خراپەکار بەپێدانی بەرتیل ناوی بزڕێنن و ناشیرین و بێ إعتیباری بکەن.

زمانی شیرین بێ و ڕووی کراوە و خۆش بێ. ئەم کارەی خۆی کە پاراستنی گیان و ماڵ و حورمەتی خەڵکە، بە عیبادەت بزانێ و چاوەڕێی پاداشتی خوایی بێت لەسەری. هەمیشە خوای گەورەی لەیاد بێ و لەخوا غافڵ نەبێت، یەقینی هەبێ کەتاسەر کاربەدەست و پلەدار و چەك بەدەست نابێ، بۆیە ئەوەندە بەدڵسۆزی و پاکی

کارەکەی خۆی بکات، کە ئەگەر ڕۆژێك خانەنشین کرا و چووە ماڵەوە، یان ئەو حکومەت و دامودەزگایە لەسەر کارنەما و، ئەمیش جلوبەرگی پۆلیسی و ئاسایشی دانا و چەك و قامچی پێ نەما، لە تۆڵەی کەس نەترسێ. چونکە هیچ کات خراپەی بەرامبەر بە کەس نەکردووە و تەنها بۆ بەرژەوەندی گەل و خاك و خەڵك یاسای جێبەجێ کردووە... جا هەر کەس لە هێزە ئەمنی و ئاسایشەکان ئاوا بژی و کارەکەی بکات. ئەوە بەڕاستی سەرفرازی قیامەت و حورمەتداری ناو گەل و نەتەوەکەیەتی و جێگەی دوعای خێر و ڕێز و تەقدیرە لەو کاتەی لەسەر کارە، یان کە خانەنشینە.

## سەرەنجامی لەخوا غافڵ بوون و ستەمکاری پلەدارێکی سەربازی: ‹بەسەرهات›

نوسەری ناودار و ناسراو: (اللواء محمود شیت خطاب) کە پلەی لیوای هەبووە لە سەربازیدا و پاشان خانەنشینکراوە و لە ژیانی سەربازی خۆیدا، زۆر شتی جێگەی سەرنجی بینیوە و نوسیویەتیەوە. لەیەکێ لەبەسەرهاتەکاندا دەڵێ: بەهۆی تێکچوونی باری تەندروستیم، ناچار بووم کە بچمە نەخۆشخانەیەکی شاری (بەیروت) لە لوبنان، بۆ ئەنجامدانی چەند پشکنینێکی جەستەم، ئەمە لە ساڵی (١٩٧٢ن).

هەرچەندە زۆر سوربووم لەسەر ئەوەی کە مانەوەم لە نەخۆشخانە زۆر نهێنی بێ و کەس پێم نەزانێ .

بەلاّم هەر زوو هەواڵەکە بلاّوبۆوە، چونکە هەمیشە هەواڵە خۆشەکان کەمتر بلاّودەبنەوە و، هەواڵە ناخۆشەکان بەخێرایی دەگەنە گوێی دەوروبەرت. منیش کە مەبەستم بوو مانەوەی نەخۆشخانەم نهێنی بێ و کەس پێی نەزانێ، بۆ ئەوەم بوو کە دۆست و ئاشنا و ئازیزانم پێمەوە ناڕەحەت نەبن و عەزیەت نەکێشن. بەلاّم کە دەنگ و باسی نەخۆش کەوتنم و داخلّبوونم لە نەخۆشخانە بلاّوبۆوە. ژمارەیەك لە دۆست و خۆشەویست و هاوڕێیانم ئەرکی برایەتیان نواند و، سەردانیان کردم.. هەروەکو عادەت گوڵ و شیرینی زۆریان بۆ هێنام.. لەو قاوشەدا کە منی تێدابووم و بەشی سەربازی بوو.

هەندێ لە ئەفسەرانی خانەنشینیشی تێدابوو، هەندێك ئەفسەریشی تێدابوو کە خانەنشین نەبوون و هێشتا لەسەر کاربوون، ئەوانیش وەك من نەخۆشی هێنابوونی بۆ ئەوێ. منیش مەرحەبام دەکردن و قسە و گفتوگۆم لەگەڵ دەکردن و لەو گوڵ و شیرینی و دیاریانەی دۆستانم بۆیان دەهێنام، پێشکەشی ئەوانم دەکرد. هەم نەخۆشەکان هەم خوشك و برا پەرستارەکانی نەخۆشخانە، وە لەگەڵ دیاریەکاندا دوعای خێر و شیفام بۆ دەکردن

و، داوام دەكرد لە خوا لە نزیكترین كاتدا شیفای هەمووان بدات و هەموو لایەك بەماڵ و منداڵ و كەسوكاری خۆی شادبێتەوە، بە لەشی ساغ بەدڵی خۆشەوە.

جا یەكێ لەو ئەفسەرە پلەدارانەی كە نەخۆش بوو، ئەفسەرێك بوو، شەو تا بەیانی نەدەخەوت و نەیدەهێشت كەس بخەوێ. لەبەر ئازار و ناڕەحەتی، پەرستارەكەی سەرپەرشتی و خزمەتی دەكرد دەیگوت: ئەم داماوە هەمیشە لە خەستەخانەیە. ئەگەر حەفتەیەك بچێتەوە ماڵەوە بۆناو كەس و ماڵ و منالی، ئەوا هەر زوو لێی بێزار دەبن و بەپەلە دەیهێننەوە بۆ نەخۆشخانە و، چەند مانگ لێرە دەمێنێتەوە. لەبەر ئازاری زۆری بەم شەوگارە نەخۆی دەخەوێت، نەدێڵێ منیش بخەوم!

بەڵام بەخوا وادیارە، نەخۆشیەكەی كاریگەرە و بەم زووانە هەم خۆی دەمرێ و ئیسراحەت دەكات. هەم منیش لە دەستی ڕزگارم دەبێت!.

منیش چەپكێ گوڵی جوانم هەڵگرت و چووم بۆ سەردانی و، لەلای دانیشتم و قسەم لەگەڵ كرد و تێگەشتم پلەی سەربازیەكەی (عەقیدە). ناوی خۆی نابوو (كولونیل)، خێزان و منال و كەس و كاریشی هەر بەوە ناویان دەبرد و دكتۆرەكانیش هەر پێیان دەوت: (كولونیل). ئەم پیاوە بۆیە ئەم ناوەی هەبوو چونكە لەو ڕۆژگارەدا فەڕەنسیەكان وڵاتی لوبنانیان داگیر كردبوو. ئەم كاری لەگەڵدا

کردبوون و لە پۆلیسیدا پلەی گەشتبوە عەقید و، لەبەر زاڵبونی موصتەلەحە فەرەنسیەکان بە (کولونیل) بانگ دەکرا.. ئەم ئەفسەرە بەتەمەنە، نەخۆشە، عەقلّ و هۆش و بیر و زاکیرەی زۆر تەواوبوو. هیچ شتێکی لەیادەوەریدا نەسڕابۆوە، وە زمانی ڕەوان بوو، قسەکانی زۆر جوان لێی تێدەگەشتی. دڵی باش کاری دەکرد. بەڵام نەخۆشی زۆری هەبوو، کە بەدەستیانەوە شەو و ڕۆژ دەیناڵاند وەکو: بەرزی فشاری خوێن، شەکرە، ڕەقبوونی دەمارەکان، ژەهراوی بوونی خوێنی، نەخۆشی جگەر، سستبوونی گورچیلەکانی، هەڵاوسانی قاچەکانی و ئەستور بوونی لاشەی و ئاوسانی..

ئەم عەقیدە نەخۆشە، بەڕۆژ وەزعی باشبوو، دەستی دەکرد بە قسەی زل و تەنانەت ئەوەی لەلای بوایە دەیگوت: ئیتر تەواو باشبووە ! !

بەڵام هەر کە شەوی لێ دەهات دەستی دەکرد بە هات و هاوار و تەنانەت دەتگوت: ئەمشەو ناگاتە بەیانی دەمرێ! بەو شەوگارە درێژە یان هاواری ئازاری جەستەی دەکرد، یاخود بانگی پەرستاری ئێشك گری دەکرد. دوو شتی بەکاردێنا بۆ بانگ کردنی دکتۆر و پەرستارەکان: دەنگی گەورەی خۆی و هاوارکردنی، وە ئەو جەرەسەی بۆی دانرابوو کە دەستی پێدا دێنا و، لەژووری پزیشك و پەرستارەکان دەنگی دەهات و نیشانەی ئەوەبوو ئەو نەخۆشە

داوای یارمەتی دەکات! کە پەرستارەکە دەهات بۆلای، نەیدەزانی بۆچی بانگی کردووە و چیٚ دەویٚ و چی لیٚبکات. بۆیە بە نائومیٚدی دەگەڕایەوە ژوورەکەی خۆی. بەلاٚم نەدەگەیشتەوە ژوورەکەی دیسانەوە عەقید دەستی بەزەنگدا دیٚنایەوە و، دیسان دەهاتنەوە و بیٚ هۆ دەگەڕانەوە.. ئەمە تابەیانی ئەم بەزمەی بەردەوام بوو! خۆ ئەگەر پەرستارەکە وەڕەس ببوایە لەدەستی و، هیچی تر نەهاتایە بۆلای ئەم دەستی لەسەر زەنگەکە هەڵنەدەگرت و، سەرەنجام پەرستارەکەی ناچار دەکرد بیٚت بۆلای، بەلاٚم بیٚ چی لیٚبکا و چ داواکاریەکی بۆ جیٚبەجیٚ بکات؟!!

ئەگەر کوڕ و کچە پەرستارەکان لاشی بمانایەتەوە، پاش کەمیٚك لەبیری دەچوو وا لای دانیشتوون. دیسان هاواری دەکرد و دەستی بە زەنگدا دیٚنا و داوای دەکردنەوە! بەمشیٚوەیە هەمووان لەدەستی بیٚزاربوون، خۆشی لە ژیانی خۆی بیٚزار بوو.

بەڵیٚ (اللواء محمود شیت خطاب) دەڵیٚ: جاریٚکیان لەلای دانیشتم و هەندیٚ قسەم بۆ کرد و دڵنەوایم کرد، بەلاٚم ئەو دەستی کرد بە گریانیٚکی زۆر بەکوڵ و بەسەرهاتی خۆی بەم شیٚوەیە بۆ گیٚڕامەوە: من لە شورتەی فەڕەنسی کارم دەکرد، پلەکەم گەیشتە عەقید. سەرپەرشتیاری پۆلیسی مەحەلیم دەکرد. هەموو بەیروت لیٚم دەترسان، ناوی من ئازاترین و پاڵەوان ترین کەسی دەلەرزاند،

فەرەنسییەکان زۆر متمانەیان پێمبوو، منیش زۆر بە دڵسۆزی کارم بۆ دەکردن، ئەرکی سەرشانم بەجوانترین شێوە کە دڵی ئەوانی پێ ڕازی ببێ ئەنجام دەدا. خۆ ئەگەر فەرەنسیەکان نەیانتوانیایە تاوانێك ئاشکرا بکەن، ئەوا تاوانباریان ڕەوانەی لای من دەکرد و، منیش لە ژێر ئەشکەنجەی توندا ئیعتیرافم پێ دەکرد!.

من بەزەیم بە هیچ کەسدا نەدەهاتەوە، وە هەرچی بە خەیاڵمدا بهاتایە بۆ ئەشکەنجەدان و تەعزیب بەکارم دەهێنا. بۆیە ئەوەی دەگیرا و دەخرایە لای من، لەبەر بەهێزی تەعزیبەکانم خێرا إعتیرافی دەکرد، بەو شێوەیەی کە من پێم خۆش بوایە یان فەرەنسیەکان پێیان خۆش بوایە!! ئەمجا لەسەر ئەم دان پێدانانە ڕەوانەی لای دادوەر دەکران بۆ وەرگرتنی سزاکەیان!.

بەڵێ ئەو عەقیدە دەیگوت: هەشتاوچوار نەوع جۆری تەعزیبم هەبوو، کە هەموو ئەو جۆرە ئەشکەنجە بەهێزە پڕوکێنەرانەم لەگەڵ تۆمەتبارەکان بەکاردەهێنا. ئێستا موچڕکە بەجەستەمدا دێ کەیادی ئەو ئەشکەنجە و تەعزیبانە دەکەمەوە کە ئەو تۆمەتبارانەم پێ ئەشکەنجە داوە!!

ئەمجا عەقید بە زمانێکی ڕەوان وتی: (**وَما أعانيه اليوم عَذابٌ مِنَ اللهِ**) ئەوەی ئەمڕۆ منیش پێوەی دەتلێمەوە لە ئازاری بەهێز، کەخۆم بێزارم و ماڵ و منداڵ و تەنانەت نەخۆشخانەش لێم بێزارن، ئەوە سزایەکە لەلایەن خواوە بۆ من. چونکە ئەوە من بووم بە

ئەشکەنجە بەهێزەکانم چەندین بێتاوانم ڕەوانەی دادگا کرد و هیچی نەکردبوو، لەژێر ئەشکەنجەدا ناچارم دەکرد دان بنێ بە تاوانێکدا کە نەیکردووە!

ئای چەند کەسی خواناس و دیندار و پاکم سزادا، بەبێ تاوان تەنها بۆ ڕازی کردنی دڵی فەڕەنسیەکان!!

بەڵێ، ئەمە پاداشتی ئەو کەسانەیە کە لەخوا غافڵن و، پلە و پۆستی ئەمنی و سەربازی وایان لێ دەکات ئاوا خراپەکاربن. بەڵام پێش قیامەت سزاکەی وەردەگرن. چۆن خەڵکی لێی دەترسان. ئێستا ئەم خۆی لەخۆی دەترسێت. وای لێهاتووە خۆی لەخۆی بێزارە، نزیکترین کەسی لێی بێزارە.

هەموو ئەوانەی ئەم هەوڵی ڕازی کردنی دڵیانی دەدا، خوای ئەرز و ئاسمانی لەبەر ڕەزامەندی ئەوان لەخۆی تورە دەکرد، هەموو بەجێیان هێشت و ئامادەنین مەرحەباییەکیشی بکەن!.

ئەم بەشەودا ئەشکەنجە و ئازار دەدا و ناڵە و هاواری لێ بەرز دەکردنەوە! ئێستا بەهەمان شێوە، هەر لە شەودا خوای پەروەردگاری کەسی بێ کەسان و مونتەقیم لە زاڵمان سزای دەدات و ناڵە و هاواری لێ بەرز دەکاتەوە!.

بەلێدانی قامچی و کارەبا و شێوازەکانی تری ئەشکەنجەی ئەمەوە، گیانی گیراوان و تۆمەتباران دەئاوسا و ئەستور دەبوو،

پارچەی جەستەیان هەڵدەوەری، بەهەمان شێوە ئێستا جەستەی خۆی ئاوساوە و پارچەی جەستەی بە نەخۆشی هەڵدەوەرێ!.

لەناو ئەو هەموو نەخۆشیانەدا، خوای گەورە زمانی بە سەلامەتی هێشتۆتەوە بۆ ئەوەی كەوا بە زمانی خۆی تاوان و خراپەكاریەكانی خۆی بۆ خەڵكی بگێڕێتەوە و خەڵكی پەندی لێ وەربگرن.

هەروەها خوای گەورە مێشك و بیروهۆشی و زاكیرەی بەسەلامەتی هێشتۆتەوە، تاوەكو ئەو دیمەنانەی پێشووی بێنەوە بەرچاو و ئازاریان پێ بچێشێ و بزانێ وەكو خۆی بۆ خەڵكی بگێڕێتەوە.

وەلەناو ئەو هەموو نەخۆشیانەدا كە تەواوی جەستەی گرتۆتەوە. خوای گەورە دڵی هێشتۆتەوە بۆئەوەی زیاتر بژی و سزای زۆرتر وەربگرێ. بێگومان سزای قیامەت و دوا ڕۆژ هەر زۆر زۆر سەختر و بەئێشترە، ئایا خەڵكی لەمە دەرس و عیبرەت وەردەگرن؟!

خوای گەورە ڕاست و جوانی فەرمووە: ﴿وَسَكَنتُمْ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾﴾إبراهيم: ٤٥.

{ساعَة وَساعَة، محمود المصري ص٢٣.}

## چی بچێنی ئەوە دەدوریتەوە!

ئەی برا و خوشکی ئەفسەردار و پلەدار لە دەزگاکانی ئاسایش و پۆلیسدا، لەخوا غافڵ مەبە و هەمیشە لە چوارچێوەی یاسادا چاکەکاربە و یارمەتی خەڵکی بدە و کەسی گرفتار ڕزگار بکە و بزانە: (چی بچێنی ئەوە دەدوریتەوە). بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمەش سەرنجی ئەم ڕووداوە بدەن:

**بەسەرهاتێك:** ئەفسەرێکی دەزگای ئاسایش بەپلەی لیوا خانەنشین دەکرێ و لە گێڕانەوەی بیرەوەریەکانیدا، دەڵێ: من لەو کاتەدا ئەفسەرێکی پلە نزم بووم و لە ژێر فەرمانی کەسێکدا بووم کە گاور بوو، کەسێکی زۆر توند و تیژ و دڵڕەق بوو، ڕۆژێکیان لە حەملەیەکی پشکنین بەدوای تاوانباردا، بەفەرمانی ئەو بەرپرسەمان هێرشمان کردە سەر ماڵێك کە بەرپرسەکەمان پێی وتین: ئەم ماڵە خاوەنەکەی بازرگانی مادده هۆشبەرەکانە، دەبێ لە ناخافڵدا لەشەودا بەسەریدا بدەین و بیگرین.

ئێمەش بەرنامەمان بۆ دانا و شەوێکیان پێش نوێژی بەیانی، لەدوای نیوە شەوەوە کە ماڵ و منداڵی لە شیرینی خەودا بوون، بەسەر دیواردا خۆمان فڕێ دایە حەوشە و ماڵی ئەو کەسەوە و، بەلەقە دەرگامان کردەوە، دەستمان کرد بە گەڕان و تەفتیشی ماڵەکە. لەوکاتەدا کابرامان قۆڵ بەست کرد و ژن و منالی هاواریان

دەکرد و دەگریان، بەتایبەت هاوسەری ئەو پیاوە، لەترسی ئەم ڕووداوە کتوپڕە میزی بەخۆیدا کرد! ئەفسەری سەرپەرشتیشمان ئەو ئەفسەرە مەسیحیە، پێی پێکەنی و گاڵتەی پێ کرد و تەنانەت لەو ژنە داماوەشی دا!!!

بەڵێ ڕۆژ هات و ڕۆی، ساڵانێك تێپەڕی و ئێمەش وەکو تیمی ئاسایش هەریەکەمان کەوتینە شوێنێك و کارێکمان پێ سپێردرا. ئەوەبوو منیش خانەنشین کرام و ئیتر خۆم یەکلایی کردەوە بۆ خواپەرستی و بڕیارمدا بچم بۆ (عومرە)..

بەڵێ لە کاتی عومرەدا لەبەرامبەر کەعبەدا دانیشتبووم، چاوەڕێی نوێژم دەکرد، کەسێك لە تەنیشتمەوەبوو، زۆر بەکوڵ دەگریا و قورئانێکی بەدەستەوە بوو، قورئانەکەی دەخوێند و جار جار سەری هەڵدەبڕی و تەماشای کەعبەی دەکرد! ئەمجا هاوار و ناڵەیەکی لێ بەرز دەبۆوە..

منیش زیاتر سەرنجم دا و لێی ورد بوومەوە و بینیم دەم و چاوی و ڕووخساری زۆر لە بەرپرسە مەسیحیەکەی ساڵانێك لەمەوبەرم دەچێت. بەڵام هەرگیز ئەوەم بەخەیاڵدا نەدەهات کە ئەوە ئەو بێ و هاتبێ عەمرە بکا و لەپەنا کەعبەدا ئاوا بگری. چونکە ئەو مەسیحی بوو، وە پاشان زۆر دڵڕەق و زاڵم بوو! بەهەر حاڵ لێی چوومە پێشەوە و پرسیارم لێکرد: مامۆستا ئەوە چیتە و بۆچی ئاوا ناڕەحەتی؟!

ئاوڕی دایەوە بەلامدا و وتی: ئای فلاّن کەس ـ ناوی منی هێنا ـ ئەوە تۆی؟!!

ئەوە تۆ من ناناسی یەوە، من فلاّنە کەسی مەسیحیم، کە لەدەزگای ئاسایش بەرپرستان بووم!! بەڕاستی خەریك بوو بڕوا بەچاو و گوێی خۆم نەکەم، باشە من چی دەبینم و چی دەبیستم؟!!

منیش لەگەڵ ئەو هەموو خۆشحاڵیەمدا کە هەمبوو بە موسڵمان بوونی و تەوبەکردنی، لەدڵی خۆمدا دەمگوت: خوایە گیان هیدایەت هەر بەدەست تۆیە و بەڕاستی فەرمانیشت حەقە کە فەرموتە: ﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾القصص: ٥٦.

بەدەم خۆشحاڵی و سەرسوڕمانەوە، وتم: بەڵێ قوربان دەتناسمەوە، بەلاّم تۆ جارێ ئەوەم پێ بڵێ: چۆن خوای گەورە هیدایەتی دای و موسڵمان بووی و، بۆم باسبکە چی ڕوویداوە لە ژیانتدا؟

چونکە بەڕاستی ئەوە ماوەی چەندین ساڵە من و تۆ لەیەکتر دابڕاوین و، هیچمان ئاگامان لە هەواڵی هیچمان نەماوە..

وتی: لەبیرتە لەو نیوە شەوەدا کە هەڵمان کوتایە سەر ماڵی فلاّن کەس، بە تۆمەتی ئەوەی کە بازرگانی ماددە هۆشبەرەکانە و، ژنەکەی لەترساندا میزی بەخۆیدا کرد و منیش گاڵتەم پێکرد و لێمدا؟!

وتم: بەڵێ لەبیرمە.

وتی: ئای براکەم بەڕاستی خوای گەورە ماوەیەك مۆڵەتی زاڵم و ستەمکار دەدات. بەڵام بۆی لە کەمیندایە و کە گرتی بە ئاسانی بەری نادات.. ئەو پیاوەی ئەو شەوە ئاوامان پێکرد، نەك هەر بازرگانی ماددەی هۆشبەر نەبوو، بەڵکو پیاوێکی هەتا بڵێی موسڵمان و دیندار و پیاوانەبوو.

بەڵام هەندێ لە خزمەکانم بەپارە لە خشتەیان بردم کە تۆمەتێکی بۆ دروست بکەم و لەناوی ببەم. چونکە دراوسێ کاریان بوو. ئیشی زۆر جوان و پوخت و بێ فێڵ بوو. ئەو خزمانەی منیش دەست بڕ و فێڵباز و حەرام خۆربوون. دەیانویست ئەم کاسبکارە حەلاڵ خۆرەیان لێ دور بکەوێتەوە و بازاڕی خۆیان گەرم بێ! منیش ئەو تۆمەتە ناڕەوایەم خستە پاڵی و خستمە سجنەوە. ماوەیەکی زۆر گیرا و ئەشکەنجە درا. بەڵام چونکە پاك و بێ تاوان بوو. هیچی لەسەر نەچەسپا و دادگا ئازادی کرد.

بەڵام دەزانی دوای ئەوە چی ڕویدا؟!

دەستی پەروەردگار کەوتە کار و کەوتمە ناو دەریای خەم و نەگبەتی و کلۆڵی و بەلا و موصیبەت دەوری دام. یەکەم ناڕەحەتی و بەلاش کە بەسەرمدا هات، هاو وێنەی ئەو تاوانە گەورەبوو کە بەرامبەر ئەو پیاوە بێ تاوانە و ژنە بێ ئاگاکەی ئەنجاممدا، ئەویش ئەوەبوو کە خێزانم بەسکێ دوو کچی دوانەی بوو..

بەڵام ئەم دوو کچەم هیچیان میزیان ڕانەدەگرت و لائیرادی میزیان بەخۆیاندا دەکرد!! چۆن ئەو ژنە لە ترسان لا ئیرادی میزی بەخۆیدا کرد، دوو کچەکەی منیش بەهەمان شێوەیان لێهات!!

بەڵێ هەوڵی زۆرم دا و سەردانی باشترین و پسپۆڕترین پزیشکم کرد. لەو بوارەدا چومە هەموو نەخۆشخانە تایبەتیە بەناوبانگەکانی: وڵاتی میصر و ئینگلتەرا و ئەمریکا و هەرچی هەمبوو خەرجم کرد. بەڵام چارەسەری کچەکانم نەکرا..

ئەمڕۆ ئەو دوو کچە جوانەم دەڵێی دوو گوڵن، ڕووخساریان وەکو مانگ وایە، هەردووکیان خوێندنی زانکۆیان تەواو کردووە، بەڵام هەرکەس دەیەوێ هاوسەرگیریان لەگەڵ بکات، کە بەم حاڵەتەیان دەزانێ کە میز ڕاناگرن و هەمیشە (دایبی)یان پێوەیە، لێیان دوور دەکەوێتەوە! ئەوان بە خەمباری و چاوی پڕ لە فرمێسکەوە ژیان بەسەر دەبەن. خۆزگە دەخوازم کە خۆم وابومایە، نەك کچەکانم. کە بەبینینیان هەموو جارێ بۆ من مردنێکە..

بەڵێ لەگەڵ گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆیدا دەنگی گریانی لێ بەرز دەبۆوە، بەڕادەیەك خەڵکی دەوروبەرمان سەرنجیان دەدایین.. ئەمجا وتی: هەر ئەوکاتە زانیم کە خوای گەورە سزام دەدات لەسەر ستەمێك، کە لەبەندەیەك لە بەندەکانی ئەو خوایەم کردووە، کەکەس و پشت و پەنای بێکەسانە. وە لەهەمان ناسۆر و ئازار کە من دام بە خەڵکی، خۆشم لێی دەخۆمەوە. ئەمجا چەندین ڕۆژ

دانیشتم گریام، لە ژوورەکەی خۆم نەدەچوومە دەرەوە و چەندین ساڵ تێکەڵاوی کەسم نەدەکرد.. براکەم، من بە فرمێسکی چاوانم جەستەم دەشۆرم و دونیام واز لێهێناو واهاتووم بۆ لای پەروەردگارم لە ماڵەکەی خۆیدا داوای لێخۆشبوون و لێبوردنی لیّ دەکەم. {قصَصٌ أبْكَتْني، سالم مرشيد، ص١٨٠}.

لەکۆتاییدا دەڵێم: پێویستە دەزگا ئەمنیەکان و هێزەکانی پۆلیس و ئاسایش، سەربە هیچ حیزب و لایەنێك نەبن. هەروەکو مامۆستای مزگەوت و مامۆستای قوتابخانە و دکتۆر و دادوەر، نابیّ پیاوی حیزب و لایەنێك بن. بەڵکو رۆڵەی تەواوی میللەت بن، تەنها هی حکومەتی کوردستان بن و حکومەتی کوردستانیش هی هەمووان بێت. چونکە هەموومان لەژێر ئاڵای شەکاوەی کوردستاندا دەژین و لەسەر خاکی پیرۆزی کوردستان ژیان بەسەر دەبەین و، لەئاوی ژێر ئاسمانی ئەم وڵاتە دەخۆینەوە.. دە با ئاسایش و پۆلیس و پێشمەرگەش تەنها سەر بە حکومەت بیّ و بۆ هەموو گەل و میللەت بیّ.

هەمووشمان بەدڵ لەخوا بپاڕێینەوە کە ئەمن و ئەمانی ئەم کوردستانەمان بۆ زیاتر بکە و، لە شەڕ و خراپە و تەقە و تەقینەوە و تیرۆر هەمووومان بپارێزە و، هاوکار و یارمەتیدەری ئەو کەسانەش بی کە ئەمن و ئاسایشی ئەم کوردستانە دەپارێزن. آمین.

## وانەی بیست و حەوتەم

## بابەت: پشت بەخوا ببەستە.

۞ **قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:** ﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾﴾ هود: ١٢٣.

۞ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إحْرِصْ عَلى ما يَنْفَعُكَ واسْتَعِنْ باللهِ ولا تَعْجِزْ، وَإِنْ أصابَكَ شَئٌ فَلا تَقُلْ لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كانَ كَذا وَكَذا، ولكِنْ قُلْ: قَدَرُ اللهِ، وَما شاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطانِ). رَواهُ مُسْلِم: (٢٦٦٤).**

### سەرچاوەکان:


١) تەفسیری ڕامان، ئەحمەد کاکە محمود، ل٩١٨.

٢) ڕووسپی یەکان، ئەندازیار عثمان، ل٦٥، ل٦٣.

٣) تەفسیری ئاسان، بورهان محمد أمین.

٤) تەفسیری گوڵشەن، نیظام الدین عبدالحمید، ب٢، ل٦٤١.

٥) بەهاری دڵان، ئەندازیار عثمان، ل٢٨.

٦) باڵانس، ئەندازیار عثمان، ل٩١.

٧) هەزارویەك، ئەندازیار عثمان، ب٢، ل٢٨٥.

٨) تەفیسری ڕۆشن، بورهان محمد أمین، ل٣١٧، ٣٣٣.

٩) دیوان و یاداشتەكانی چروستانی، نوخشە ئەحمەد چروستانی، ل٣٠، ل٣٥.

١٠) هەنسك و هیوا، م. غریب پێنجوێنی، ل٤٠.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين. الصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعينَ:

سوپاس و ستایشی فراوان و هەمیشە بۆ خوای پەروەردگار، کە ئەمسالّیش گەیشتینەوە بە شەوانی قەدری پیرۆز و پڕبەرەکەت، ئەو شەوانەی ئەوەندە پیرۆزن، یەك سورەتی تایبەتی قورئانیان بەناوەوەیە: (سورة القدر)، وە تەواوی سورەتەکەش تەنها باسی گەورەیی ئەو شەوە پیرۆزە دەکات و باسی هیچی تری لەگەلّ نی یە. کە ئەمەش گەورەیی ئەو شەوە پیرۆزە دەردەخاتکە:

﴿لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ۝٣﴾.. هەزاران هەزار درود و سلاّوات لە دیداری پاکی پێغەمبەری نازدار، سەروەر و سەردارمان، شەفیعی مەحشەرمان، نوری چاومان، دلّسۆزمان، ڕابەرمان، محمد المصطفى ﷺ، کە هەموو شەوەکانی دەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان، خۆی و خاو و خێزانی تا بەیانی لە عیبادەت و خواپەرستی دا دەبوون و لە مزگەوتدا إعتیکافی دەکرد.

خوایەگیان ئێمەش لەم شەوی بیست و حەوتی مانگی ڕەمەزانەدا، وا لەمالّێك لە مالّەکانی تۆدا کۆبوینەتەوە، تەنها و تەنها نیەتمان ڕەزامەندی تۆیە و بەدەست هێنانی ئەو پاداشتە گەورە و گرانبەهایەیە، کە خەلاّتی خۆتە و لوتفی تایبەتی یە،

لەگەڵ ئومەتی پێغەمبەری ئاخر زەمان. کە ئەگەر لەچاو گەلان و ئوممەتانی ڕابردودا تەمەنمان کەمە، بەڵام بە عیبادەتی یەك شەوی قبوڵکراو لای تۆ، عومری چەندین ساڵەمان پڕ لە عیبادەت و خواناسی بۆ دەنوسرێ. هەزاران هەزار جار سوپاس و ستایش بۆ تۆ خوایە لەسەر کەرەم و بەخششت.

یاڕەبی ئێوەی ئیماندار و خواناسیش وەکو ماڵی خواتان بە عیبادەت ئاوەدان کردەوە، خوای گەورە دڵەکانتان بەنوری خۆی و خۆشەویستی خۆی و پێغەمبەرەکەی ئاوەدان بکاتەوە.. ماڵەکانمان ئاوەدان بکاتەوە.. یاخوا دەم و چاوتان هەر گەش بێ و دڵتان لە خەم و خەفەت خاڵی بێ، وەکو شەوی قەدرتان لابەنرخ و بەڕێزە، هەر خاوەن قەدر و حورمەت و ڕێزبن. لەبەلا و بێ حورمەتی بەدوربن. اللّهُمَّ آمین.

بەڕێزان: ئێمە ئەمساڵ زنجیرە باسەکەمان بەناونیشانی (لەخوا غافڵ مەبە)بوو، جا بۆ دوربوون لە غافڵەت، وەرە هەمیشە پشت و پەنات بەخوا ببەستە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ۝﴾ الأحزاب.

واتە: لەتەواوی ئیش و کارەکانتدا تەنها پشت بەخوا ببەستە و دیارە خواش بۆ چاودێر و بریکار و پشتیوانی بەسە.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا ۝٩﴾ المزمل.

واتە: ئەو خوایەی کە تۆ دەی پەرستی ئەی ئیماندار، پەروەردگاری خۆرهەلآت و خۆرئاوایە و بێجگە لەو هیچ پەرستراوێکی بەحەق نی یە و، جاکەوابوو تۆش بەردەوام هەر ئەو بکە بە پارێزەر و پشتیوانی خۆت و کاروبارت بدە دەستی ئەو. {تەفسیری ڕامان، ل٩١٨} .

بەڵێ خوای پەروەردگارمان ﴿رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ﴾ ئایا چ هێز و قودرەت و دەسەلآتێك هەیە کە ئاوا خاوەنی تەواوی سەر زەوی و هەموو کەون بێ و بەدیار و نادیارەوە. بۆیە لەجیاتی پشت بەستن بە ئەم و ئەو ﴿فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا﴾ وەرە ئەو بکە بە پشتیوانی خۆت و تەنها کاروبارت بەو بسپێرە. دڵنیابە هەمیشە پشتیوانیت لێدەکات و زایەت ناکات.

**بەسەرهاتێك:** ئەو کاتەی خەلیفەی دادپەروەر (عومەری کوڕی عبدالعزیز) لەسەرە مەرگدابوو، مەسلەمەی کوڕی عبدالملك هات بۆ سەردانی و پێی وت: تۆ دەمی منالّەکانت بەستووە لەو هەموو مالّ و سامانەی لەبەردەستدایە، ئاخر ناکرێ ئاوا بە هەژاری و نەداری بەجێیان بێڵی، ئەگەر وەسیەتێك بکەی بۆ من یان کەسوکارت کە

ئاگایان لێیان بێت و بخۆین. لەو کاتەدا عومەری کوڕی عبدالعزیز، پاڵکەوتبوو، فەرمووی: ڕاستم بکەنەوە و دام بنیشێنن، ئەوانیش دەستیان گرت و دایان نیشاند، ئینجا فەرمووی: من کەدەمی منداڵەکانم گرتۆتەوە لەو ماڵ و سامانەی لەبەردەستمدایە، وە نەبێ حەقێکی خۆیان بوبێ و نەمدابێت پێیان، خۆ دیارە حەق و مافی کەسی تریشیان لەو ماڵ و سامانە نادەمێ، کە ماڵی من نی یە و موڵکی گشتی موسڵمانانە ! !

بۆ مەسەلەی وەسیەت کردنیش، من داومنەتە دەست خوا کە: ﴿إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ ۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾﴾ الأعراف: ١٩٦. واتە: بەڕاستی گەورە و سەرپەرشتیکاری من هەر ئەو خوایەیە، کە ئەم قورئانەی ناردۆتە خوارەوە. وە هەر بۆخۆشی چاودێری و سەرپەرشتی صالحان و چاکان دەکات.

فەرمووی: جا لەبەرئەوە منالەکانی عومەر حاڵیان لە دوو بار زیاتر نی یە، یان پارێزکارن و خواش هاوکاریان دەکات و ڕزقیان دەدات، لە شوێنێکەوە کە هەرگیز حیسابیان بۆ نەکردووە. ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ .. ﴿٣﴾﴾ الطلاق.

یان دور لەخوا و خراپەکار دەبن، دەی چۆن پارەیان بۆ بەجێبهێڵم کە خراپەی پێوە بکەن! ! بەڵێ هەروا دەرچوو کە

عومەر فەرمووی، دوای خۆی منالەکانی، خوا دەروی لێکردنەوە و هەرگیز موحتاجی کەس نەبوون. {ڕووسپیەکان، ئەندازیار عثمان ل٦٥}

{ئەی خودای من، تاك و مەزن.. تۆی پەلەوەر لە هێلکەدا دروست و چاودێری دەکەی.. هێشتا بێچوی هێلانەیە، هەرچی پێویستی ژیانی بێ فێری دەکەی، بەیانی بە برسی دەفرێ و ڕۆزی خۆی بۆ دەنێری و تێری دەکەی}.

## بۆ هەموو کێشەیەك پەنا بۆ خودا ببە..

ئەی ئەو کەسەی کە منالت نی یە و چاوەڕێی منالێکی جوان و صالحی، وەرە تەنها داوا لەخوا بکە و پشت بەخوا ببەستە، نەك پەنا بەخوا بچیە سەر گۆڕی فلان و فلان و بەدەوریا بسوڕێیتەوە و حەیوانی بۆ سەر ببڕی و داوای منالی لێ بکەی!!

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ فَٱعْبُدُوهُ ۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٠٢﴾ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾﴾ الأنعام. واتە: ئەو خوایە پەروەردگارتانە، جگە لەویش هیچ خوایەکی تر نی یە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، کەواتە هەر ئەو زاتە بپەرستن و بەندایەتی تەنها بۆ ئەو بکەن. ئەو خوایە ئاگادار و

چاودێری هەموو شتێکە. دەزگای بینایی و ـ بۆ چونی ئادەمیزاد ـ ناتوانێت ئەو زاتە ببینێت. زانیاری ئەو خوایە هەموو شتێکی گرتۆتەوە، ئاگاداریشە بە هەموو دەزگاکانی بینایی، هەر ئەوە وردبین و ئاگایە.. {تەفسیری ئاسان، بورهان محمد أمین}.

بەڵێ تۆی موسڵمان کە لە قورئانەوە ئاوا پەروەردگارت دەناسی. ئیتر چۆن لێی غافڵ دەبی و دەچی لە قەبر و گۆڕ داوای منالّ دەکەی. وەرە وەکو گەورەمان زەکەریا پێغەمبەر (علیه السَّلام) داوا لەخوا بکە کە منالّی صالّحت پیّ ببەخشیّ، بەیەقینەوە داوای لێبکە و خوا وەلاّمت دەداتەوە.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَزَكَرِيَّآ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ ۝﴾ الأنبياء: ٨٩.

واتە: زەکەریا لەخوا پاڕایەوە و وتی: ئەی پەروەردگارم، هەروا بەبیّ مندالّ و نەوە و بەتەنها مەمهێڵەوە، تۆ چاکترین میراتگریت، ژیانی هەموو ئادەمیزادێك لەم دنیایەدا کۆتایی پیّ دێت و دەمرێت، تەنها هەر تۆ دەمێنیتەوە. ـ زەکەریاش پێش لەدایك بوونی عیسا ـ علیه السَّلام ـ لەناو نەوەی ئیسرائیلدا سەرپەرشتی جێگای عیبادەتی دەکرد.

﴿فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَوَهَبْنَا لَهُۥ يَحْيَىٰ وَأَصْلَحْنَا لَهُۥ زَوْجَهُۥٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾﴾ الأنبياء.

واتە: داواکەی زەکەریامان هێنایە دی، هەرچەندە پیر و بەتەمەن بوو، ئێمە یەحیامان پێ بەخشی و خێزانەکەی کە سکی نەدەکرد، وامان کرد سك بکات، ئەوانە (زەکەریا و هاوسەرەکەی و یەحیای کوڕی) خێرخوازبوون و، کەسانێك بوون هەمیشە پێشبڕکێیان دەکرد بۆ چاکەکاری و، بۆئەوەی بکەونە بەر ڕەحمەتی ئێمە و لەترسی سزادانمان، لێمان دەپاڕانەوە و بەدڵ ملکەچی خۆیان نیشان دەدا.. {تەفسیری گوڵشەن، نیظام الدین عبدالحمید، ب٢، ل٦٤١}.

بەڵێ وەکو زەکەریا پێغەمبەر ـ علیه السّلام ـ و خێزانە بە ڕێزەکەی لەخوا بپاڕێوە و دوعابکە، خێر و خێرات و چاکە بکە. کلیلی خێربە و قفڵی دەرگای شەڕبە. بانیەتت لەبونی منداڵ خاوێن و پاك بێ، بۆئەوەی کە منداڵێکی صالح و خواناس و چاکەکارت لە شوێن بەجێ بمێنێ و، خزمەتی خاك و خەڵك بکات.. بەهۆی چاکەکاری ئەوەوە هەزاران ڕەحمەتت بۆ بێ و، خەڵکی بڵێن ڕەحمەت لە دایك و باوکی و صەدەقەی جاری بێ بۆ دوای مردنت.

نەك نیەت لەبونی منالٚ بۆئەوەبێ کەسەروەت و سامانەکەت دوای خۆت خزم و برازا و ئامۆزا نەیخوات!! یان بۆئەوە حەزت لە منالٚ بێ کە کاروکاسپیت بۆ بکات. یاخود وەکو هێز و پاڵپشت بەکاری بهێنی و بلێن فلان کەس ئەوەندە کوڕ و نەوەی هەیە!.

**بەسەرهاتێك:**

شێخ (صالح المغامسی) کە پێش نوێژ و وتار خوێنی مزگەوتی قوبایە لە مەدینە دەفەرمووێت: چوار سالٚ منالٚمان نەدەبوو، چل جار لە سوجدەدا ئەو دوعایەم کرد ﴿رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَارِثِينَ﴾ الأنبياء: ٨٩. سوپاس بۆ خوا، خوای گەورە منالێکی پێ بەخشین.. بەزۆر کەسیشم وتووە ئەم دوعایەیان کردووە و خوای گەورە بە فەزڵی خۆی منالی داونەتی! ئەمەش مەبەست ئەوە نی یە کە نەچینە لای پزیشك، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە لەگەلٚ هۆکارە ماددیەکاندا، ئەبێ تەنها پشت بەخوا ببەستین و بزانین کە تەنها ئەوە منالٚ دەبەخشێت. {ڕووسپیەکان، ئەندازیار عثمان ل٦٣}.



## هەر کەسێ هەمیشە پشت بەخوا ببەستێ، تامی ئیمانی کردووە!

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (**ثَلاثٌ مَنْ فَعَلَهُنَّ فَقَدْ طَعِمَ طَعْمَ الإِيمانِ**) سێ شت هەیە، هەر کەس بیانکات تامی ئیمان دەچێژێت و، لەزەتی لێ دەکات و پێی بەختەوەر دەبێ.

١) (**مَنْ عَبَدَ اللهَ وَحْدَهُ، فَإِنَّهُ لا إِلهَ إِلاّ الله**) هەر کەس خوا بەتەنها بپەرستێ، کە بەتەنها هەر بۆخۆی خوایە. چونکە کەسی واهەیە، خوا دەپەرستێ، بەلاَم لەگەڵ خواپەرستیەکەیدا، شتی تریش دەپەرستێ. بۆ نمونە: کەسی واهەیە موسڵمانە، ئەهلی مزگەوت و نوێژ و ڕۆژووە، کاتێ منالّی نابێ، دەڵێ داوا دەکەم لەخوا کە منالّم پێ ببەخشێ. بەلاَم ئەگەر نەچمە سەر قەبر و مەزاری فلاَن پیاوچاك و لەوێ نەپاڕێمەوە و (بابە گوڕ گوڕ بە گوڕ هاتم، بۆ کوڕ هاتم) نەڵێم، منالّم نابێ!!

بڕوا بکەن لە گۆڤاری (سلێمانی)دا، خوێندمەوە، باسی پیاوێکی بەڕێزی تێدایە ـ حەزناکەم ناوی ببەم، بنەماڵەیەکی ناسراوی سلێمانین ـ ئەڵێ بە (کەرکوکلی زادە) ناسراوە. هەر چەندە خەڵکی کەرکوکیش نی یە. بەلاَم بۆیە وای پێ دەڵێن چونکە کاتی خۆی باوك و دایکی چەندە ساڵ منالّیان نەبووە.. پاشان چونە سەر بابە گوڕگوڕی کەرکوك و داوای کوڕیان کردوە و، دوای ئەوە ئەم

کوڕەیان بووە، بۆیە بە کەرکوکی ناویان بردووە، وایان زانیوە ئەوپێی بەخشیوین!!! نَعُوذُ بِاللهِ.

بەڵێ کەسێ تامی ئیمان دەکاو لەزەتی لێ وەردەگرێ و پێی بەختەوەر دەبێ، کە یەقینی هەبێ بەوەی کە غەیری ـ الله ـ هیچ کەس و هێز و دەسەلأتێك نی یە، بتوانێ خانەیەك دروست بکات. یان ئەلیکترۆن و پرۆتۆن و نیوترۆنێك لە شوێنی خۆی بجولێنێ!! غەیری ـ الله ـ توانای ئەوەی نی یە بەبێ ویستی خوا، نە قازانج نە زەرەرت پێ بگەیەنێ. بۆیە تەنها خوا بپەرستە و لەگەڵ خواناسیەکەتدا شتی تری تێکەڵ مەکە.

٢) وَ أَعْطى زَكاةَ مالِهِ طيبَةً بِها نَفْسَهُ: زەکاتی ماڵەکەی بدات بەپێخۆش بوونەوە. بەڵێ هەر کەسێك زەکاتی شەرعی لە ماڵەکەی دەرکرد و لەناخەوە خۆشحاڵ بێ، بڵێ یاڕەبی خوایە لێت بەزیاد بێ کە بەسەرت کردومەتەوە و، بە فەزڵ و کەڕەمی خۆت ئەم ماڵەت پێ بەخشیوم.. خوایەگیان، ئەم ماڵ و سامان و پارە و دانەوێڵە و ئاژەڵە و کارگە و کۆمپانیایە، هی ئازایەتی و مەردایەتی و کەسابەت و دلێری و بوێری خۆم نی یە.. بەڵکو ئەمە لوتف و مەرحەمەتی تۆیە کە پێت بەخشیوم. یاڕەبی خوایە تۆ زیاترم بدەیتێ بۆئەوەی منیش زیاتر ببەخشم، ئاوا لە بەخشینی زەکات

تام و چێژ وەربگرە و لەناخەوە خۆشحاڵ بە، بەویستی خوا تام و شیرینی ئیمان و خواناسی دەچێژی.

٣) **وَزكَى عَبدٌ نَفْسَهُ، فَقالَ رَجُلٌ: وَما تَزْكِيَةُ المَرءِ نَفْسَهُ يا رَسُولَ اللهِ؟ قالَ: يَعْلَمُ أَنَّ اللهَ مَعَهُ حَيْثُ ماكانَ:** وە بەندەیەكی خوا كە نەفسی خۆی پاك بكاتەوە. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ كەسێك چۆن نەفسی خۆی پاك بكاتەوە؟ فەرمووی: بەوەی كە لە هەر كوێیەك بێت، بزانێت خوای لەگەڵدایە. {ئەم فەرموودەیە: رَواهُ أبوداود: ١٥٨٢}

بەڵێ ئیمانی كامڵ ئەوەیە كە یەقینت ببێ لە هەر جێگایەك بی خوات لەگەڵە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **(إِنَّ أَفْضَلَ إِيمان المَرْءِ، أَنْ يَعْلَمَ أَنَّ اللهَ مَعَهُ حَيْثُ كانَ) رَواهُ الطَّبَراني.**

واتە: باشترین ئیمانی مرۆڤ ئەوەیە، كە دڵنیابێت و یەقینی هەبێت كە لەهەر جێگایەك بێ، خوای لەگەڵە. بەڵێ ئەو كەسە تامی ئیمان دەكات و بەخواناسی یەكەی بەختەوەر دەبێت كە هەرگیز خۆی بەبێ پشت و پەنا نازانێ، هەرگیز خۆی بەلاواز و بێ كەس و غەریب نازانێ. ئەگەر هیچ بەرپرس و كاربەدەستێك نەناسێ، ئەگەر لەبەر هەژاری هیچ دەوڵەمەندێك سڵاوی لێ نەكات. دڵنیایە كە خوا لەگەڵیەتی و ـ الله ـ پشت و پەنایەتی.

**بەسەرهاتێك:** ساڵێکیان کوللەیەکی زۆر هێرش دەهێنن و، دائەبارێن بەسەر کشتوکاڵی زۆر ناوچەی کوردستاندا، بەتایبەت دێهاتەکانی قەرەداغ، لەدێی (بەردیٚ)ی قەرەداغ خەڵکەکە تەواو شپرزە دەبن و دێنە لای (سەعید) ناوێك و دەڵێن: کوللە دای بەسەر کشتوکاڵی دێهاتەکانی دەوروبەردا و هیچی نەهێشت و وابەرەو ناوچەکانی ئێمەش دێن. ئەویش بە فیترەتێکی پاکی موسڵمانانەوە دەڵیٚ: ئایا هیچ کام لە کوللەکان خوایان خوارد؟!!

وتیان: نەخێر، وتی: خۆ خوا ماوە؟! وتیان: بەڵیٚ. وتی: دەی خوا کەریمە، ئەوانەی کە ئاگایان لەم مەسەلەیەیە دەڵێن: خوا ئاگادارە کوللە نەگەیشتە کشتوکاڵی ئەمان و بەبەرەکەتی ئەو (حُسْنُ الظَّنَ)ە بەخوا، ڕزگاریان بوو، تەنانەت بەروبومیان لە ساڵانیش زیاتر بوو. {بەهاری دڵان، ئەندازیار عثمان ل٢٨}.

﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ الحديد: ٤.

خاوەنی حەقیقی ئەوە، (حَيٌّ قَيُّوم) هەر خۆیەتی. مەرگ و ژین بڕیاری ئەوە، سود و زیان بەدەست ئەوە، چەرخێنەری مانگ و ڕۆژوو و شەوە. هەر چیەك ڕوونە یان لێڵە، ڕاستی یە یان فرت و فێڵە، لەسەر ڕێی ڕاستە یان وێڵە، گەورە و گچکەی لیٚ دیارە، غەیب و ئاشکرای یەك بارە، هەمووی لەلایدا تۆمارە.

## ئەی نەخۆش پشت بەخوا ببەستە

ئەی نەخۆشەکان لەم شەوە پیرۆزەدا، لەم شەوە خاوەن قەرد و ڕێزەدا، زۆر لەخوا بپاڕێنەوە، ئێوەش ئەی ئیمانداران، زۆر دوعای خێر بۆ نەخۆشەکان بکەن، کە خوا شیفایان بدات، باهەموومان بەیەکەوە سەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەین:

شێخ محمد حسّان دەفەرمووێت: لەشاری مەککەی موکەڕەمە وتارم دەدا، پیاوێکی میصری خەڵکی شاری (دومیاط) هاتە لام و وتی: یاشێخ تو خوا بەسەرهاتێکم هەیە ڕێم بدە با بۆ ئامادەبوانی بگێڕمەوە، وتم: فەرموو، وتی: من چەند ساڵێك لەمەوبەر تووشی ئیفلیجی بووم، لایەکم کاری نەدەکرد، چووم بۆ بەریتانیا و ئەمریکا چاك نەبووم و چەند ساڵ بە کورسی کەمئەندامان هاتوچۆم دەکرد، لە نۆمینەی حاجیاندا سەیری تەلەفزیۆنم دەکرد، (لَبَّيْكَ اللهُمَّ لَبَّيْك)ی حاجیان لەدەوری کەعبە دەنگی ئەدایەوە، گریام و بەکوڕەکانم وت: دەچم بۆ حەج و لەپادشای پادشایان دەپاڕێمەوە لەماڵەکەی خۆیدا، بەڵکو شیفام بدات.. وتیان: زۆر زەحمەتە و ئەوە حاڵەکەتە چۆن بتبەین؟!

وتم: خوا ماڵ و سامانی زۆری داومەتێ، خوای دەکرد فڕۆکەیەکی تایبەتتان بۆ دەگرتم، هەر دەبێ بمبەن بۆ حەج، ناچاربوون بردیانم.. لەحەوشی کەعبەدا کە جمەی دەهات لە حاجیان، وتم: ئالێرەدا بەجێم بهێڵن، یەك سەعات گریام و پاڕامەوە

لەخوا و وتم: خوایەگیان وامن میوانی تۆم لە ماڵەکەی خۆتدا، بەگەورەیی تۆ قەسەم، لەم ماڵەت ناچمە دەرەوە تا چاکم دەکەیتەوە و بەپێی خۆم دەچمە دەرەوە، یان گیانم دەکێشیت و بەمردوویی دەمبەنە دەرێ.. لە هیلاکیدا لەسەر کورسیەکەم خەوم لێکەوت. لەخەوما سێ جار پێیان وتم: هەستە، لەخەوەکەم داچڵەکیم و خەبەرم بۆوە، هێزم دایە خۆم و هەستامە سەرپێ! خوا بەفەزڵ و کەرەمی خۆی شیفای دام و بەپێی خۆم بەرەو کەعبە ڕۆشتم و وتم: ئەی پادشای هەموو پادشایان هەرگیز ئەو کەسەت نائومێد نەکردووە کە بەڕاستی هانای بۆ هێناویت. {بالانس، ئەندازیار عثمان ل٩١} .

هەرلەسەر ئەم بابەتە ـ پشت بەستنی نەخۆش بەخوای گەورە ـ لە کوردستانی خۆمانەوە، بەسەرهاتێکتان بۆ دەگێڕمەوە: برای بەڕێز (ئەندازیار عثمان) لە کتێبەکەی خۆیدا (بالانس، ل٣٥) دەڵێ: حاجی عبدالله هەبوو، خەڵکی پێنجوێن بوو، دۆستێکی خۆشەویستم بوو، من و خێزانم سەردانمان دەکرد و ڕێز و خۆشەویستی لەنێوانماندا هەبوو. ئەم حاجی یە قورحەی گەدەی هەبوو. هەموو ڕەمەزانێك پارشێوی دەکرد و تا ئێوارە ئازاری زۆر هەراسانی نەکردایە نەیدەشکاند.

(بەڵێ قورحەی معیدە ـ گەدە ـ پەنا بەخوا ئازاری زۆر سەختە، چونکە لەناو گەدەی مرۆڤدا، چەند ماددەیەکی ئەنزیمی

تێدایە کە خۆراك هەرس دەکەن، ئەم مادەی ناو گەدەیە ئەوەندە بۆن و تیژیەکەی بەهێزە، گەر ڕەحمی خوا نەبوایە و ئەو تەوافەی نێوان گەدە و سورێنچکی دانەنایە، کە ناهێڵێ ئەو ترشیە بێتە ناو دەمی مرۆڤەوە، ئەوا ئەگەر یەك تۆزی بهاتایە سەر زمان یەکسەر مرۆڤ لەبەر بۆگەنی دەمی کەس نەیدەتوانی لەلای بێ. ئەوەندە بۆنەکەی تیژ و ناخۆشە. ئەم مادەیە ئەوەندە بەهێزە، یەك دڵۆپی بکەیت بەسەر گوێزانی ڕیش تاشیندا یەکسەر ئەو ئاسنە ڕەقە دەکات بەئاو!!

هەروەها پزیشکەکان هاتون یەك دڵۆپ لەو ئاوی ناو گەدەیان ڕژاندوە بەسەر بزماری پۆڵادا، یەکسەر تواندویەتیەوە!! بۆیە قورحەی گەدە، یانی کونێکی بچکۆلە دەبێتە دیواری گەدەوە و ئیتر ئەم کەسە لەبەر ئازار بەردەوام دەناڵێنێ و لەزەت لە هیچ خواردنێ ناکات!)..

بەڵێ ئەم حاجی عبدالله یە کە ئەم نەخۆشی یەی هەبوو لە ساڵانی هەشتاکاندا دەچێ بۆ حەج، لە مزگەوتی ڕەسولی نازدار خەوی لێدەکەوێت.. لەخەویا پێغەمبەری سەروەر و دڵسۆز ﷺ تفی موبارەکی ئەدات لە پارچە نانێکی تیری و، ئەیدا بە حاجی عبدالله و ئەویش دەیخوات. پاشان کە خەبەری دەبێتەوە بە فەزڵی خوا بەیەکجاری ئازاری گەدەی نامێنێت و خوای گەورە شیفای ئەدات!.

شایانی باسە ئەم حاجی عبدالله یە، برایەکی هەبووە بەناوی (عومەر) ئەم کاک عومەرە سەد و هەشتا پلە پێچەوانەی ئەم دەبێ، بێ دینێکی تەواوبوو. بەڵام خۆی و هاوسەرەکەی زۆر خزمەتی دایکی دەکرد و دایکیشی هەمیشە دوعای هیدایەت و سەرفرازی بۆ دەکرد.

کاک عومەر بە جۆرێك توشی ئازاری پشت بوو، کە نەیدەتوانی ڕاست ببێتەوە و نەیدەتوانی پانتۆڵ لەپێ بکات، شەرواڵی لە پێدەکرد و دەچوو بۆ دوکانەکەی لە قەیسەی نەقیب لە سلێمانی، شەوێك لە خەویا پێی دەڵێن: ئادەی پاڵکەوە، ئتر پێیەك دەنێن بە پشتیا و دەڵێن: دەی هەستە، کە دەیەوێ هەستێ خەبەری دەبێتەوە، ئازاری نەماوە!! یەکسەر بە ژنەکەی دەڵێت: بەرماڵم بۆ بێنە باڕوو بکەمە خوا، ئیترتەواو، لەو ساوە بۆتە خواناسێکی باش و بەردەوام گوێ لە قورئان دەگرێت لە دوکانەکەیدا.



## پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەحمەتە

ئەنەسی کوڕی مالیك، ئەو هاوەڵە پایە بەرزەی کە ماوەی (١٠) ساڵ بەردەوام لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووە ﷺ ، دەفەرمووێ: لەدوای وەفاتی پێغەمبەری خواوە ﷺ هیچ شەوێکی ژیانم نەبووە کە خەون بە پێغەمبەری خواوە نەبینم ﷺ ! ! !

**بەسەرهاتێك:** نوسەر و وتاربێژی میصری، شێخ محمد حَسّان، دەڵێت: لە شاری (منصورة) لە میصر، کوڕێکی گەنج ئامادەی وانەکانم دەبوو، ڕۆژێکیان وتی: دایکم سەلامت لێدەکات و حەزدەکات سەردانی بکەیت. منیش دوای وانەکە چووم بۆماڵیان لە قەراغ شاربوو، چوومە خزمەت دایکی کە پیرەژنێکی بۆ خوا سوڵحاو بوو. بینیم بێ تاقەتە.. وتم: دایە گیان لەوە دەچێت بێتاقەت بیت، ئایا ناساغیت؟!

چیتە تا باشترین پزیشکت بۆبێنم چارەسەرت بکات.

وتی: کوڕم هیچ نی یە، خۆم ئەزانم چیمە، پزیشکم ناوێ! !

وتم: دایەگیان چیتە؟! وتی: سێ شەوە خەوم بە ڕەسول الله وە نەبینیوە ! !

وتم: بۆ هەموو شەوێك بەخزمەتی دەگەیت؟! تا ئەگە بوو بە دوو سێ ڕۆژ بە خزمەتی نەگەیشتبی ئاوا بێتاقەت ببی؟! وتی: بەڵێ! !. {باڵانس، ئەندازیار عثمان ل٩١}.

لێرەدا با صلاوەت بدەین لەسەر پێغەمبەری پێشەوامان محمد المصطفی ص:

**اللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ عَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمْ.**
**اللّهُمَّ صَلِّ عَلى شَفيعِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَسَلِّمْ.**
**اللّهُمَّ صَلِّ عَلى حَبيبِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَسَلِّمْ.**

## ئەو کردەوانەی کە دەتکەن بە خۆشەویستی خوا:

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت: (**ثلاثة يُحِبُّهُمُ اللهُ وَ يَضحَك لَهُمْ وَ يَسْتَبْشِرُ بِهِمْ**). سێ کەس هەن، سێ چین و توێژ هەن، کە خوای پەروەردگار خۆشی دەوێن و زەردەخەنە دەکات بە ڕوویانداو، خوای گەورە موژدەی خۆشیان پێ دەدات و کاریان بۆ ئاسان دەکات:

١) **الَّذي إذا انكشفت فئة قاتل وَراءَها بنَفْسِهِ للهِ عَزَّوَجَلَّ، فَإِمّا أَنْ يقتل وَ إمّا أَنْ يَنصُرَهُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ وَيكفيه، وَيقول: أُنْظُرُوا إِلى عَبْدي هذا كَيْفَ صَبَرَ لي بِنَفْسِهِ..**

واتە: جەنگاوەرێکە لە جەنگێکدا هاوەڵانی دەگەڕێنەوە و دێنە دواوە و ئەم لەبەرخوا هەر دەجەنگێت تا سەردەکەوێت یان شەهید دەبێت، کە ئەمەش لوتکەی خۆگری و گیان فیدایی یە. خوای گەورە بە فریشتەکان دەفەرمووێ: تەماشای فلأن کەس بکەن ـ

خوا ناوی دێنێ ـ چۆن لەبەر خاتری ڕەزامەندی من ئارامی بە نەفسی خۆی گرت و خۆی ڕاگرت و هەڵنەهات.

**٢) وَالَّذي لَهُ إمْرَأَةٌ حَسَنَةٌ وَفِراشٌ لَيِّنٌ حَسَنٌ، فَيَقُومُ مِنَ اللَّيْلِ فيقولُ: يذر شهوتَهُ وَ يذكرني وَلَوْ شاءَ رَقَدَ.**

واتە: دووەم کەس لە خۆشەویستانی خوا، کەسێکە لە شەودا جێگای گەرم و هاوسەری جوانی جێدەهێڵێت و هەڵدەستێت شەو نوێژ دەکات. خوای گەورە دەفەرمووێ:

ئەم بەندەیەم وازی لە ئارەزووی خۆی هێنا و هەستا یاد و زیکری منی کرد. هەرچەندە من ئەمەشم لەسەر فەرز نەکردبوو، دەیتوانی نەیکا و بخەوێ. چونکە شەونوێژ وەکو نوێژی بەیانی فەرزنیە. بەڵام ئەو بەندەیەم ئەوەندە منی خۆشدەوێ، کەدوو شتی زۆر خۆشەویستی بەجێهێشت، یەکەم: ژنێکی زۆر جوان و خانومانی لەپاڵدابوو. وازی لێهێنا، لەکاتێکدا حەزی دەکرد تا بانگی بەیانی لێی دوور نەبێ. دووەم: جێگای نوستنی نەرم و گەرم و بۆنخۆش و جوان، کە مرۆڤ حەزدەکات تێیدا بمێنێتەوە. بەڵام لەبەر خۆشەویستی خوا بەجێی هێشت. بۆیە بەڕاستی خواش ئەوی خۆشدەوێت!

**٣) وَالَّذي إذا كانَ في سَفَرٍ وَكانَ مَعَهُ ركبٌ فَسَهَرُوا، ثُمَّ هجَعُوا فَقامَ مِنَ السَحَرِ في ضَراء وَ سَرَّاءِ.**

واتە: سێیەم کەس لەو کەسانەی کە خوای گەورە زۆری خۆشدەوێن و، لەڕۆژی قیامەتدا زەردەخەنەیان بەرەو ڕوو دەکات و پێشوازیان دەکات و کاریان بۆ ئاسان دەکات. ئەو کەسەیە کە لەگەڵ کۆمەڵێك دۆست و هاوڕێیانی دا لەسەفەردایە، لە شەودا لەکاتی لادان و پشوودا، کە ڕەفیق و هاوەڵانی هەموو خەوتوون، ئەم لەبەر ڕەزامەندی و خۆشەویستی خوا لەبەرەبەیاندا هەڵدەستێ و شەو نوێژ دەکات. {ئەم فەرموودەیە: الترغيب و الترهيب ـ الصفة أو الرَّقم: ١/٢٩٧: إسناده حسن}.

## تەنها لەبەر خوا چاکە بکە، خوا بەسە کە پاداشتت بداتەوە

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (**إنَّ لله تَعالى أَقوْاماً يَختصهم بالنِّعَمِ لِمَنافِعِ العِبادِ، وَيقرها فيهِمْ ما بَذَلُوها، فَإذا مَنَعُوها، نَزَعَها مِنْهُمْ، فَحَوَّلَها إلى غَيْرِهِمْ**) صَحيح الجامع لِلْألباني: ٢١٤٦، حَديثٌ حَسَنٌ.

واتە: خوای پەروەردگار هەندێ خەڵات و بەخشش و ماڵ و سامان دەدات بە کەسانێك، تاسود بەخەڵکانێك بگەیەنن. جا ئەگەر هاوکاری خەڵکیان پێکرد دەیهێڵێتەوە لایان، وەئەگەر وایان نەکرد لێیان دەگرێتەوە و ئەیدا بە کەسانی تر.

**بەسەرهاتێك:** بانگخواز و نوسەر مامۆستای زانکۆ (دکتۆر محمد راتب النابلُسی) دەفەرمووێت:

برادەرێکم سەری لە زەوی برادەرێکی دا، گەنمەکەی زۆر جوانبوو.. هەر بە تەنیشتیەوە زەوی برایەکی ئەو کەسەبوو، گەنمەکەی ئەو باش نەبوو. بۆیە چووە لای و لێی پرسی: بۆچی گەنمەکەی تۆ وایە و ئەوی براکەشت وایە؟! وتی: بەخوا لە دڵی خۆمدا نیەتم هێناوە کە نیوەی داهاتی زەویەکەم بدەم بە منداڵانی برایەکم کە بێ باوکن، هی ئەوەیە کە خوای گەورە بەرەکەتی تێخستووە..

لە صەحیحی مُسلم دا هاتووە: پێغەمبەری سەروەرمان دەفەرمووێ: کابرایەك بەدەشت و دەرێکدا دەڕوات و گوێی لە دەنگێك دەبێت، کە بەو هەورەی لەپشت سەریەوە بە ئاسمانەوەیە دەڵێت: بڕۆ بۆ سەر زەوی فلان کەس و ئاوەکەی ناوتی بەسەردا ببارێنە! بەڵێ هەورەکە ڕێك چووە سەر ئەو شوێنە و باری، کابرای ڕێبواریش چوە سەر ئەو شوێنەی کە بارانەکەی لەسەر باری و، لەناو کێڵگەکەدا پیاوێکی بینی کە خاکەنازی بەدەستەوەبوو، خەریکی بێڵ کاری و ئاوداشتنی باخەکەی بوو!

ڕێبوارەکە لێی پرسی: باشە تۆ چ کاروکردەوەیەکی گەورەت کردوە لەبەرخاتری خوا! کە ئاوا بارانت بۆ باری؟! باخەوانیش وتی: هەرچەندە ئەمە نهێنیەکە لەنێوان خۆم و خوای

پەروەردگارمدا و کەس پێی نەزانیوە، بەڵام مادام تۆ ئەم موژدە خۆشەت پێدام کە نیشانەی ئەوەیە خوا بەکارەکەم ڕازی یە و، لێی قبولْ کردوم، منیش پێت دەڵێم کە چیم کردووە. من هەموو ساڵێ بەرهەم و داهاتی ئەم باخ و کێڵگەیە دەکەم بەسێ بەشەوە.

بەشێکی بۆ خزمەتی باخەکە و نۆژەن کردنەوەی پەرژین و کەڵەك و دیوارەکەی و کرێی کرێکاری باخەکە دادەنێم.

بەشی دووەمی بۆ خەرجی خۆم و ژن و منالْ و میوانم دادەنێم.

بەشی سێ یەمیشی بەنهێنی لەبەرخوا دەبەخشم بەکەسانی هەژار و هەتیو و نەدار و نەخۆش. بائەوانیش بەشیان هەبێ لەم باخەدا.. جائەوەی کە تۆ بیستوتە و فەرمانی بەو هەورە کردووە، لەناو ئەو هەموو کێڵگەدا بێتە سەر موڵك و باخی من. هەر هی ئەو بەخشین و خێر و خێراتەیە، کە بۆ خوا کردوومە و خواش بە گەورەیی خۆی قبولّی کردووە.

## زانست فێربە و کارجوان بە و داهێنانی زانستی نوێ بکە، بەڵام لەخوا غافلْ مەبە

ئاینی ئیسلام هانی مرۆڤ دەدات: کە بەردەوام لەگەلْ زانست و زانیاری و تەکنەلۆجیای پێشکەوتووی سەردەمدا بێت و، داهێنانی سودبەخش و نوێ پێشکەشی مرۆڤایەتی بکات. بەڵام ئەوەی ئیسلام فێرمان دەکات ئەوەیە لەکاتی دەوڵەمەندیدا، جا

دەوڵەمەندی ماڵ و پارە و سامان بێت. یاخود دەوڵەمەندی بواری مەعریفە و زانستی بێت. یاخود دەوڵەمەندی بواری سەربازی و هێز و دەسەڵات بێت لەخوا غافڵ نەبین. پێی بوغرا نەبین، لە سنوری بەدایەتی خۆمان دەرنەچین و، خۆمان لە خالیق و دروستکەری خۆمان و هەموو شتەکان بەبێ ئیحتیاج نەزانین.

چونکە خوای پەروەردگار کە باسی سروشتی مرۆڤ دەکات کاتێ پەروەردگاری لەیاد دەکات، باسی ئەوە دەکات کە زۆر مرۆڤ لە سنور دەردەچن، کاتێك شتێك بەخۆیانەوە شك دەبەن. ﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ۝٦ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ۝٧﴾ العلق: ٧.

بەڵێ خوای پەروەردگار یەکێ لەناوە بەرزەکانی (المُهَيمنَ) واتە: خاوەن زانستی بێکۆتای بەتوانای باڵادەست، ئەو خوا بەدەسەڵات و ئاگادارەیە کە هات بەهانای ئیبراهیم پێغەمبەرەوە، لەناو ئاگردا بەسەلامەتی ڕزگاری کرد و، فەرمووی: ﴿قُلۡنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرۡدٗا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ۝٦٩﴾الأنبياء: ٦٩.

جائەگەر خوای کاربەجێ نەیفەرموایە ﴿وَسَلَٰمًا﴾ ئەوا ئیبراهیم لەسەرماندا ڕەق دەبۆوە. وە ئەگەر نەیفەرموایە ﴿عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ ئەوا چی ئاگری دنیا هەیە سارد دەبۆوە و مرۆڤ هیچ سودی لە ئاگر وەرنەدەگرت. ئەوەیە دەسەڵاتداریێتی تەواوی بێ پایان.

## هەرچەندە لە زانستدا پێشکەوی و کارت جوان بێ، ناتوانی لەخوا بێ منەت بی!

بەسەرهاتێك: کەشتی تایتانیك کە هەموومان ناومان بیستوە، کە لە ساڵی (١٩١٢) گەورەترین کەشتی ئەو سەردەمەبوو کە دروست کرا، دیوارەکەی دوو چین بوو. چینی یەکەمیش کون ببوایە چینی دووەم دەیپاراست و نقوم نەئەبوو. ئەو کەشتیە بەشێوەیەکی ئەوەندە توند و تۆڵ و مەحکەم دروست کرابوو، کە دڵنیابوون لە نقوم نەبوونی، بۆیە بەلەمی ڕزگارکردنی لەگەڵ نەبوو. نەشرەیەکیان بلاوکردەوە لە پێناسەکەیدا نوسرابوو:

(قەدەر ناتوانێ ئەم کەشتیە نقوم بکات و لەباشترین کەشتیەکانی دنیایە ! !)

ئەوەندەی کەلوپەلی بەنرخ و گرانبەها و ناوازە تێدابوو، کە نایەتە وەسفکردن، شارێك بوو بەسەر ئاوەوە ! لەیەکەم گەشتی دا زۆر دەوڵەمەندی ئەوروپی بەشداربوون، ژنەکانیان بایی ملیۆنەها دۆلار ئاڵتونیان لەخۆیان دابوو. بەقەدەری خوا لەناو دەریادا خۆی دا بە شاخێکی سەهۆڵدا و، کردی بە دوو کەرتەوە و هەرچەند ئیشارەتی بەهاناوە هاتنی نارد، کەشتیەکانی دەوروبەری نەچوون بەهانایانەوە، لەبەرئەوەی وایان دەزانی ئەمە هەر بۆخۆشی ئیشارەت و ئاماژە لێ دەدات!

چونکە بە خەیاڵی کەسدا نەدەهات کە نوقم ببێ. ئەم کەشتی یە کە تایتانیکی پێ دەوترا، هەموویان نقوم بوون و تەنها ئافرەتێك ڕزگاری بوو، کە کارەساتەکەی دەگێڕایەوە و بوو بە فلیمێك، لە کاتی خۆیدا یەکێك لە قەشەکان وتی: ئەم ڕووداوە دەرسی ئاسمان بوو بۆ زەوی!.

هاوشێوەی ئەم ڕووداوە ئەوەبوو لە هەشتاکاندا، ڕۆژئاوا کەشتیەکی ئاسمانی دروست کرد بە ناوی (چالنجەر) یانی (المُتَحَدِّی) واتە: تەحەدای هەموو هێز و دەسەڵاتێك دەکات، کەبتوانێ بیوەستێنێ و نەهێڵێ کارەکەی خۆی بکات. (ئەوەی گرفتە ئائەمەیە کە مرۆڤ بە زانست و زانیاری خۆی لەخوا غافلْ ببێ و، بیەوێ بەگژ پەروەردگاری ئەو ئەرز و ئاسمانەدا بچێتەوە، ئەینا مرۆڤ ئازادە لەوەی کەچۆن لەسەر زەویدا کە موڵ و دروستکراوی خوایە منالی ببێ، لەهەواشدا، لە ئاسمانیشدا کە هەر موڵك و دروستکراوی خوایە. با منالْ ببێ، بەلام گرنگە لەخوا غافلْ نەبێ!).

بەڵێ دێینەوە سەر قسەکەمان، ئەم کەشتی یە ئاسمانیە پێشکەوتووە، واحسابی بۆ کرابوو کە نزیکەی ساڵێك لەبۆشایی ئاسماندا بمێنێتەوە و حەوت سەرنشینی هەبوو، کە دوانیان ئافرەت بوون. بەرنامەیان وابوو کە یەکێ لە ئافرەتەکان حامیلە ببێ بەیەکێ لە کەشتیوانەکان و، بزانن نۆ مانگی سکەکەی لە ئاسماندا

چۆن دەبێت و هەر لە ئاسمانیش منالەکەی ببێت و، یەکێ لە کەشتیوانەکانیش پزیشکی تایبەت بوو بە منالبوون. ئەمە ببێ بەیەکەم منالێ کە لەئاسمان لەدایك ببێ.. کەچی تەحەداکەیان نەچووە سەر، پاش حەفتاو سێ چرکە کەشتیەکە بە ئاسمانەوە سوتا بەبەرچاوی هەموو دونیاوە!! {هەزار و یەك، ئەندازیار عثمان ب٢ ل٢٨٥}.

بەڵێ ئەم دوو کەشتیە، یەکێکیان هی ناو ئاو، یەکیان هی فەزا و ئاسمان، تەواوی زانستی زانایانی پسپۆڕی تێدا خرایە کار و، بەتوندو تۆڵترین و بێ کەم و کورتی ترین شێوە دروستکرا. بەڵام چونکە ئینکاری وجودی دەسەڵاتی خوای پەروەردگاری کرد. یەك گەشتیشیان پێ نەکراو بوە هۆی لەناو چونی خۆ و هەموو ئەوانەشی هەڵیگرتبوون.

بەڵام: لەملاوە پێغەمبەر نوح - سەلامی خوای لێ بێ - بە ئامێری سادە و ساکاری تەشوێ و تەور و مشار، لەوشکانیدا بە فەرمانی خوا کەشتیەکی دروستکرد.. کە لەکاتی دروستکردنیدا بێ باوەڕان گاڵەتیان پێ دەکرد و دەیانگوت: کێ دیویەتی لە زەوی وشکا کە نە ئاوی لێ یە نەدەریا، کەشتی دروست بکرێ؟!! بەڵام خوای گەورە فەرمووی: گوێ لە قسەی ئەوان مەگرە و ﴿وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا﴾ لەژێر چاودێری ئێمەدا ئەو کەشتی یە دروست بکە.

جا ئەو کەشتی یە سادەی نوح، چونکە ﴿بِأَعْيُنِنَا﴾ی پەروەردگاری لەگەڵ بوو. تەواوی مرۆڤایەتی ڕزگار کرد. ئەوانەی ئیمانداربوون، وە لە هەموو زیندەوەرانیش جوتێکی لێ هەڵگرتن و، لەکاتێکدا زەوی لەهەموویەوە ئاو هەڵدەقولاَ و لە ئاسمانەوە باران دەباری. هیچ هێز و پەنایەك نەبوو کەسێ پەنای بۆ بەرێ و ئاو هەموو شتێکی ڕاپێچکرد.. ئاڵەو کاتەدا کەشتی نوح بەخۆی و سەرنشینانی بەسەلامەتی نیشتەوە و، جارێکی تر مرۆڤایەتی لەو کۆمەڵە خەڵکەوە دروست بۆوە. چونکە بەناوی خوا لێخوڕدراو بەچاودێری خوا سپێردرا.

پێشەوا شافیعی دەفەرمووێت: (کەسێکت خۆش نەوێت کە خوای خۆشناوێت، چونکە ئەگەر ئەو خودای بەجێهێشتبێت، ئەوا تۆش بەجێ دەهێڵێت)..



## ئەگەر دوژمن و نەیارەکانت ویستیان ئازارت بدەن، پشت بەخوا ببەستە

مرۆڤ لە ژیانیدا، لەلایەن کەسانی دەوروبەرەوە ـ بەتایبەتی کەسانی خراپەکار و ناڵەبار و بێ دین و تەشقەڵە بازەوە، توشی ئەوە دەبێت کە ئازار بدرێ بە قسە و بەکردار ماڵی بخورێ، مافی بخورێ. ئەمیش لەبەر پاراستنی کەسایەتی خۆی و، نزم

نەکردنەوەی ئاستی حورمەت و ڕێزی خۆی بۆ ئاستی ئەو شەڕانی و خراپەکارەی کە هیچی پێ عەیب نی یە. یان لەبەرئەوەی ئەم بەتەنهایە و نەیارەکانی کۆن و دەستە و تاقمن، یان یاسا کاری نەدەکرد و مافی ستەم لێکراو و ماف خوراوی وەرنەدەگرتەوە. ئەوا لەم کاتانەدا مرۆڤی موسڵمان و ئیمانداری بەحەق، خۆی بەتەنها نازانێ و پەنا بۆ تۆڵەی شەخصی نابات و خراپە بەخراپە چارەسەر ناکات. بەڵکو پشت بەخوای بەرزی باڵادەست دەبەستێ و دەڵێ خوایەگیان وا فلان کەس و دەست و تاقمەم دایە دەستی تۆ. ئەمجا دڵنیایە کە خوا پشتی دەگرێ و لە دنیا و قیامەتدا تۆڵەی بۆ لەو ستەمکارانە دەکاتەوە.

خوای گەورە خۆی فەرمانمان پێ دەکات کە ئاوا پشت بەخوا ببەستین و دەفەرمووێ: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾﴾ الشُّعَراء.

وە دەفەرمووێ: ﴿إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَـٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْ ۗ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٩﴾﴾ الأنفال.

ئەگەر ژیانی پێغەمبەرانی خوا - سەلامی خوایان لەسەربێ - بخوێنیتەوە، دەبینین کە چۆن لەو کاتانەدا کە لەلایەن بێ باوەڕانی دوژمنی سەرسەختی خۆیان و ئاینەکەوە، ئازاردراون ئەوان زۆر

ئازایانە باسی پشت بەستن بەخوایان کردووە. بۆ نمونە بەسەرهاتی پیری پێغەمبەران، (نوح)دا، لەبەرامبەر سوکایەتی و ئازاردانی بێ باوەڕانی گەلەکەیدا، نوح ڕوو دەکاتە ئەو بێ باوەڕە ستەمکارانە و دەفەرمووێ: ﴿يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ۝٧١﴾ یونس: ٧١.

واتە: ئەی محمد ﷺ بەسەرهات و هەواڵ و ڕووداوەکانی نوح پێغەمبەر بۆ ئەو خەڵکە باس بکە. کاتێك کە بە قەوم و عەشرەتی خۆی وت: خزمینە ئەگەر ئێوە سەغڵەتن بەمانەوەی من لەناوتاندا، یاد خستنەوەی بەڵگە و ئایەت و فەرمانەکانی خوای گەورەتان لاگرانە، ئەوە دڵنیابن کەمن کۆڵ نادەم، چونکە خەمخۆری ئێوەم. هەروەها من پشتم بەخوای خۆم بەستوە و ئەو زاتە پشتیوانمە، ئێوە چیتان لەدەست دێت درێغی مەکەن، خۆتان و بتەکانتان و هاوبیروباوەڕەکانتان با بکەونە خۆ و کاروباری خۆتان ڕێکبخەن دژی من، با هیچ شتێکتان شاراوە و تەم و مژاوی نەبێت. هەرچیتان لەدەست دێت دژ بەمن ئەنجامی بدەن، منەتتان نەبێت من ناترسم، حەز دەکەن هیچ چاوەڕێش مەکەن و مۆڵەتیشم مەدەن. {تەفسیری ڕۆشن، ل٣١٧}.

هەروەها (هود) پێغەمبەر ـ علیه السَّلام. لەوەڵامی قەومە بێ باوەڕەکەیدا فەرمووی: ﴿فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ۝ إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم..﴾ هود.

واتە: ئەگەر ئێوە دەتوانن بەدور لەزاتی خوا، بەخۆتان و بتەکانتانەوە، هەر هەموتان چیتان لەدەست دێ، دژی من ئەنجامی بدەن، پیلان و فێڵ و تەڵەکە درێغی مەکەن، هیچ مۆڵەت و فرسەتیشم مەدەنێ، بزانم چیتان لەدەست دێت؟! خەڵکینە دڵنیابن کە من پشتم بەخوای گەورە بەستوە کە پەروەردگاری منیش و ئێوەشە. {تەفسیری ڕۆشن، ل٣٢٢}.

**<u>وانەیەکی گرنگ</u>:** لەدوو بەسەرهاتی ئەو دوو پێغەمبەری خوایە (نوح و هود) ئەوەتێدەگەین و فێردەبین کە:

١) ڕێبازی پێغەمبەران و خواناسان بەگوڵ نەچێنراوە و درك و داڵیشی دێتە ڕێ، بەڵام هیچ کات پێغەمبەران نەچوون پەنا بۆ توند و تیژی و کوشتنی نەیارەکانیان بەئاشکرا و نهێنی ـ تیرۆر ـ بدەن، بەڵکو دینی خوایان ڕاگەیاند و ئەو خراپەکارانەیان دایە دەست خوا. وە هێز و پشت و پەنایان تەنها بەخوای گەورە زانی و دروشمیان ـ من پشتم بە خوای پەروەردگارم بەستوە ـ بوو.

٢) هود، وە پێغەمبەرانی تر هەرگیز بەخەڵکیان نەوتووە ـ الله ـ هەر پەروەردگاری ئیماندارانە. بەڵکو پێیان ڕاگەیاندوون کە

خوای گەورە پەروەردگاری ئێمەی موسڵمانیش و، ئێوەی بێ باوەڕیشە. هەروەك قورئانیش یەكەم ئایەتی بە ﴿رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ دەست پێدەكات و، كۆتا ئایەتیشی بە ﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ﴾ كۆتایی دێت. بۆیە هەمیشە موسڵمان خێری بۆ هەموو كەس دەوێت، بە كافر و نەیارەكانیشیەوە و وەڵامی شەڕ بە شەڕ ناداتەوە. كەسێكی نەرم و نیان و سەلامەت و دەستی خێرە و، مەبدەئی یە، ئازا و بوێرە، دورە لە هەڵەشەیی و هەڵچونی كاتی و كاری نادروست.



## پیاوچاكانی كورد، پشتیان بەخوا بەست و خواش پشت و پەنایان بوو:

دەچینە خزمەت مامۆستا مەلا محمدی چروستانی، كە لە یاداشتەكانی خۆیدا، فەرموویەتی: حاجی ئەمین ناوێك بۆی گێڕامەوە كە: زەویەكمان كێڵابوو بۆ شكارتەی (شكارتە بەواتای پەڵەدانەوێڵەیەكی بچوك دێت، كە كەسێك بۆخۆی یان بۆ كەسێكی تری چاندبێت).

گەنمە بەهارە بۆ مامۆستای باوكت ـ باوكی مامۆستا مەلا محمدی چروستانی، كە ئەویش مەلایەكی مودەڕیسی بەناوبانگ

بووە ـ زەویەکە لەبەر ئاو بارەدا بوو، لەبەینی سنوری ئابلاخ و کانی گۆمە نیزاعی لەسەربوو. کوێخا ساڵحی کانی گۆمە مەنعی داچاندنی زەوی ئەکرد و خۆی جوتی ناردە سەر و دایچاند بەبەهارە، ئێمەش گرد بووینەوە کە بچین مەنعی بکەین، مامۆستا نەیهێشت. هەرچەند ئیسراڕمان کرد، فەرمووی: خۆتان ماندوو مەکەن، ئەم حەقە خوا دەیسەنێ!

ئێمەش لەبەر دڵی ئەو وازمان هێنا، سوێندی خوارد و وتی: ئێمە سەرمان سوڕمابوو، زانیمان ئەمە سرێکی خواییە، کە غەدری کوێخا ساڵحی لە مامۆستا قبوڵ نەکرد.

بەلاّم ئەم مامۆستا بەڕێزە چەند واریع و موتەقی بوە، کە خوای گەورە ئاوا پشتیوانی لێکردووە؟

هەر مامۆستا مەلا محمدی چروستانی دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ: فەقێ ئابلاخ ـ ئەو کاتە ئابلاخ گوندێکی بچوك بووە لە ناوەندی شاری سلێمانی دور بووە!! ـ کە فەقێکانی ئابلاخ جومعان ئەچون بۆ سولەیمانییە، جار جار لەشار دەعوەت دەکران، شەوێ درەنگ دەهاتنەوە بۆ ئابلاخ، لەباوکم بیستوە، فەرمووی: جارێك فەقێکان پاش جومعە دەعوەت کرابوون شەو درەنگ کە دێنەوە توشی زابتێك (ئەفسەرێك) دەبن، کە سەرخۆش و مەست دەبێ.. لێی دەدەن، چەرمەسەریەکی زۆری دەدەن، ئەمجا بەجێی دەهێڵن..

یەکێ لە فەقێکان بەناوی (مەلا قادر) ئەگەڕێتەوە و بەعزێ شتومەکی لێ ئەسێنێ. هەرچەن فەقێکانی ڕەفیقی مەنعی ئەکەن، گوێیان ناداتێ، زابتەکە ڕوت ئەکاتەوە! دێنەوە بۆ ئابلاخ.. باوکم فەرمووی: بۆ سبەینێ کە نۆرە دەرسی مەلا قادر هات، ناردم بەدوایا کە بێت بۆ دەرس. بەوەحدەتی خوا هەر کەهات و دانیشت بۆ دەرس، ژانێکی زۆر بەشیدەت کەوتە سەرم. کە تاقەتی تەماشای کتێبم نەما!

وتم: مەلا قادر بڕۆرەوە، سەرم زۆر ژان ئەکات. بۆ سبەینێ لە ئەوەڵەوە ناردم بەدوایا ـ دەرسی یەکەمم بۆ ئەو دانا ـ چونکە دوێنێ دەرسی نەخوێندبوو، منیش ژانە سەرەکەم نەمابوو.. ئەمجارەش کە مەلا قادر هاتە حوجرەوە دەستبەجێ سەرم دەستی کردەوە بە ژان! تاقەتم نەما!

وتم: مەلا قادر سەرم ژان دەکات. دیسان بێ دەرس ڕۆیشتەوە. ڕۆژی سێهەم دیسان بەو نەوعە. ئەو سێ ڕۆژە کە ئەو فەقێیە دەهاتە سەر دەرس خوێندن، سەرم دەستی دەکرد بە ژان، کە ئەو دەڕۆی ژانە سەرەکەشم لادەچوو!!

ڕۆژی سێیەم مەلا قادری فەقێ وتی: مامۆستا ئەوە بۆچی کەمن دێم بۆ دەرس، تۆ سەرت ژان دەکات؟! وتم: نازانم، بەڵام ئەمە بێ نهێنی نییە. چیت کردووە؟! وتی: هیچم نەکردووە، تەحقیقاتم لە فەقێکان کرد، مەسئەلەی زابتەکەیان بۆ گێڕامەوە، کەشەوی

شەممە لێیان داوە و مەلا قادر ڕوتی کردۆتەوە، ئەمجا منیش حوکمم لێکرد، کە ئەبێ بچێ ئەو زابتە بدۆزێتەوە و چیت لێ سەندووە بیدەیتەوە. فەقێکە وتی: مامۆستا تۆ بەتەمای سەرم بەفەتارە بدەی؟! بەخوا ئێرە بەجێدێڵم و ئەمە ناکەم. ئەوەبوو بوخچە و ئەسبابی پێچایەوە و ڕۆیشت!! {دیوان و یاداشتەکانی چروستانی، ل٣٠ و ل٣٥}.

(﴿ٱللَّهُ أَحَدُ﴾ هەر تۆی، ﴿لَمْ يَلِدْ﴾ کەست لێنابێ، ﴿وَلَمْ يُولَدْ﴾ لەکەس نەبووی، ئەبەدیت و هەر دەمێنی، ئەزەلیت و تۆ هەر بووی.. (**اللطيف**) سۆزت گشتگیرە، کە زستان هات بەبەهارەکەی، چۆڵەوانی بە شارەکەی، نگین بە محمد دەدەی.. یوسف بە خەزنەدارەکەی، هەژار دەوڵەمەند دەکەی و دەوڵەمەندیش هەژار دەکەی.. (**التَّواب**)ی بۆ گوناهبار، دەردی دڵی تیمارەکەی.. (**مُحصي**) هیچت لێ وون نابێ، وتە و کارمان ئامارەکەی (**المُنْتَقِمْ**) هەر تۆی و بەس. کە خەشمی خۆت بەکارەخەی، چەوساوە و ماف خوراوەکان لە چەوسێنەر ڕزگارەکەی. (**جَبّار**)ی هەر خۆت ئەزانی، باری زاڵم چۆن لارەکەی. بازاڕی دنیا هەڵدەگری، قیامەتێك بەر قەرارەکەی، بەبەهەشتە نازدارەکەت، خەڵاتی چاکەکارەکەی!..

## بەرەکەتی تەمەن لەدینداریدایە:

بەڵێ ئیمانداری بەڕێز، هەموومان لەناخی دڵمانەوە سوپاسی خوای پەروەردگارمان دەکەین کە ئێمە لە غەفڵەتدا نین، کە ئێمە خوامان ناسیوە، ڕێبازی ڕاست و دروستمان هەڵبژاردووە. ئای ئیسلامەتی و خواناسی چ بەرەکەتێکی عەجیبە؟!

بەم دینداری و خواناسی یە، هەرچەندە بەساڵ تەمەنت کەم بێ بەڵام پڕ بەرەکەت دەبێ، ئەوەتا یەك نوێژی بە جەماعەتی مزگەوت پاداشتی یەك بەبیست و حەوت نوێژی هەیە. کەواتە: ئەگەر تۆ ساڵێك بەردەوام بی لەسەرئەوەی هەموو نوێژەکانت بەجەماعەت لە مزگەوت بکەی، وەکو ئەوە وایە کە تۆ بیست و حەوت ساڵ نوێژت کردبێ!!

پاشان ئەوەی تەمەن بێ بەرەکەت دەکات و گوناه و تاوانە، بەڵام تۆ کە جومعەت کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ئەم نوێژ و خوطبەی جومعەیە، بۆئەو جومعەیەی داهاتوو، کە فارەتی گوناهی نێوانیانە!! پاشان ئەگەر مرۆڤی ئیماندارشەوی پڕبەرەکەتی قەدری بەنسیب ببێ، ئەوە بۆی چاکترە لە هەزار مانگ. کە نزیکەی ٨٣ ساڵە، واتە تۆی ئیماندار بە عیبادەتی یەك شەو تەمەنت دەبێتە ٨٣ ساڵ!!

ئای چ فەزڵ و بەرەکەتێکی گەورەیە!.. ئەی ئەگەر مردی؟! ئەگەر لەسەر ئەم ڕێبازە پاکەی ئیسلامەتی مردی، ئەوە لە کاروانی

سەرفرازی، ژیانی قیامەتت زۆر لێرە خۆشترە، بەڕاستی ڕزگاربوونە ﴿فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾﴾. دەی وەرە پەیمان بدە بەخوای خۆت کە لەسەر ئەم ئیسلامە بەردەوام دەبی.

## کورتە وەصفێکی بەهەشت!

(ژیان هاتن، مرد چونە، دوای هەڵاتن ئاوابوونە، ڕۆژێك دادێ زەوی حەملی فڕێ دەدا، لەدایك بوون و جەم بوونە، فەرمانی بێ چەند و چوونە، وای لەو کەسەی وادەزانێ مەرگ مانای فەنابوونە، .. لەو ڕۆژەدا مرۆڤەکان هەردوویەشن، ڕوخسار سپی، یاخود ڕەشن، ڕوخسار سپی جوان و گەشن، لە ڕەحمی خوا بەهرەوەر و خاوەنبەشن..

بەهەشت پەیمانی خواوەندە، بۆئەو بەندەی کە پابەندە، کاتی خەڵات وەرگرتنە، نەڕۆژوو نە نوێژکردنە، نەسەرپێچی و دەرکردنە، ئاهەنگە، یاری کردنە، سوپاسی خواوەند کردنە، نە ئاخێکە، نە ئۆفێکە، شوکرانە و ئۆخەی کردنە..

موەکانیان هەمووی ڕەشە، ڕوخساریان ڕووناك و گەشە، شەنگ و شۆخن، تازە لاون، بەخامەیەك نەخشێنراون، بەفریشتە چوێنراون، میوانی ڕێز لێگیراون.. کەس کەسی تر وەرس ناکا،

هەست بە خەم و ترس ناکا، چی دەنۆشیّ، چ دەپۆشیّ، ئامادەیە و پرس ناکا..

گۆشتی مەل و میوەی تازە، نیگەران نین، هەمووی هەر بە کەیف و سازە، مولّکی زۆری بیّ ئەندازە، هەمووی عەنتیکەیە و شازە، هەرچی دەبینی نەخشاوە، چلّەگیایەك نەلەخشاوە، وای لەو نگین و بەختەیان، ئاوریشم و تاج و تەختەیان، گولّزارە، بەهارستانە، بالّەخانە چراخانە، هەر ساتێکی ئەو ژیانە، هەموو دنیای بەقوربانە..

ئەوە ئاکامی ئیمان و چاکەکارییە، بەختەوەری، پایەداری، میوانداری خودای باری، ئیقامەیەك بەیەکجاری، مندالّ وەك دەنکە مرواری، خزمەت دەکەن دەخنێنەوە و دەکەن یاری.

یاران هەر کەس کەلّکەلّەی چونە بەهەشتی لەسەردایە، با خێراکا و لەخۆی ڕایە چاکە بکاتە دەستمایە. {هەنسك و هیوا، م.غریب پێنجوێنی، ل٤٠}.



# وانەی بیست و هەشتەم

## بابەت: بەکاری خوا ڕازی بە و سوپاس گوزاربە

۞ **قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَتَعالى:** ﴿وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُواْ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةُۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ ﴿٣٦﴾﴾ الرُّوم: ٣٦.

۞ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : إتَّقِ اللهَ حَيْثُما كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيْئَةَ الحَسَنَةَ تَمْحُها، وَخالِقِ النّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ**)رَواهُ الترمذي وَقال: حَديثٌ حَسَنٌ.

**سەرچاوەکان:**

١) تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین.

٢) یاوەرێك بۆ سەرکەوتن، هاژە شێروانی، ل١١، ل٥٥، ل٤٠، ل٢٦.

٣) ڕوو سپی یەکان، ئەندازیار عثمان، ل٤٣.

٤) خەمبار مەبە، د. عائض القَرَني، و: أحمد شێخ عبدالله وەرتی، ل٢٠٢.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

مرۆڤ لە ژیانیدا ناخۆشی زۆری توش دەبێت. مەگەر كەسێ ژیری و عەقڵی لەدەست دابێت ئەینا هەموو مرۆڤێكی تێگەشتوو خەم و خەفەتێكی هەیە لە ژیاندا، ئەگەر خۆیشی كەم و كورتی نەبێت لە بواری دارایی و ماڵ و منداڵ و جەستەدا، بێگومان خەمی كەسانێك دەخوات كە خەمبار و چاو بە فرمێسكن، كە هەژار و نەدارن، كە نەخۆش و لەش بەئازارن.. بەڵێ ژیان بەژانی لەدایك بوون دەست پێدەكات و خەم و خەفەت و شكست و ئازاریشی تێدایە، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَـٰنَ فِي كَبَدٍ ۝٤﴾ البلد.

واتە: بەڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان دروستكردووە و بەردەوامیش لە كێشە و ناڕەحەتی و سەغڵەتی و ناخۆشیدایە، چونكە بە شێوازێكی بەرچاو خۆشیەكانی كورت و تەمەن كۆتان. {تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین}.

## مەڵێن خودایە بۆ من وام لێدێ؟!

مەبەستمان لەم پێشەكیە لەم وانەیەدا ئەوەیە كە ئەگەر توشی كێشە و گرفت و ناڕەحەتیەك بووی لە ژیاندا، (لەخوا غافڵ مەبە) و

مەڵێ: باشە بۆچی هەر من توشبووم؟! ئامان نەکەی بڵێی: خوایە بۆچی هەر من؟!

### بەسەرهاتێك:

یاریزانێکی بەناوبانگی تێنس هەبوو، ناوی (أرثر)بوو، ئەم یاریزانە بەناوبانگە دوای ئەوەی بەهۆکاری گواستنەوەی خوێنی پیس بۆی، لەکاتی کرداری نەشتەرگەری دڵیدا، توشی نەخۆشی کەمی بەرگری لەش (ئایدز) هات. هەر بۆیە زۆربەی ئەو خەڵکەی هەواداری بوون و شەیدای ببون، لەم ساتەدا بروسکە و هاوخەمی خۆیان دەردەبڕی و سەردانیان دەکرد. یەکێك لەوانە بۆی نوسیبوو: بۆچی خوا تۆی هەڵبژارد تا تووشی ئەم پەتا نەعلەتیە ببیت و بناڵێنیت بەدەست ئەم نەخۆشی یە نەفرەتیەوە؟! ئەویش دەستی کرد بە نوسین و وەڵامدانەوەیەکی باوەڕدارانە و دانایانە و بۆی نووسی:

لەنێوان (٥٠٠) ملیۆن کەس کە تێنس دەکەن، کەسیان فێری ڕێساکانی نەبوون تەنها (٥٠) ملیۆنیان نەبێت و لەناو ئەمانەشدا تەنها (٥) ملیۆنیان یاریزانی لێهاتوون، لەمانەشدا تەنها (٥٠) هەزاریان گەیشتنە یاریگا باشەکان، لەمانیش تەنها (٥) هەزاریان گەیشتنە پاڵەوانێتی (گراند بۆ ئاشتی)، لەسەر ئاستی جیهان لە فەڕەنسا، لەمانەشیان تەنها (٥٠) کەسیان گەیشتن بە پاڵەوانێتی کێبڕکێی (ویمبلدون) لە بەریتانیا، چواریان گەیشتە خولی پێش

کۆتایی و دوانیان گەیشتنە یاری کۆتایی، لەم یاریەشدا من بردمەوە، کاتێك کاسی پاڵەوانیەتیەکەم وەرگرت و بەرزمکردەوە، نەمگوت: خودایە بۆ من؟!! {یاوەرێك بۆ سەرکەوتن، هاژە شێروانی، ل١١}.

کەسانێك هەن وەختێك بەخواپەرستی و دینداری خۆشحاڵن کە لەئەو پەڕی ژیانی خۆش و لەشی ساغ و داهاتی باش و قەدر و حورمەتدا بن، بەڵام ئەگەر لە ژیانیاندا توشی گرفت و ناڕەحەتی و کەم دەرامەتی و نەخۆشی و ناخۆشی بوون. ئەوە دەست دەکەن بە ناشکوری و کوفر کردن ـ **نَعُوذُ بالله** ـ ڕەخنە لەکاری خوا دەگرن، وا دەزانن دەبێ کە ئەمان نوێژ و ڕۆژوویەکیان گرت. ئیتر دنیا بەدڵی ئەوان بێ و خوا بە ئارەزووی ئەوان کاربکات! بەڕاستی ئەمانە لە دینداری حاڵی نەبوون و هەروەکو عادەت و خوو پێوەگرتن کردویانە. خوای گەورە لەباسی ئەو جۆرە کەسانەدا دەفەرموویٚ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ١١﴾ **الحج**.

واتە: هەندێك کەس کە ئیمان لەدڵیاندا پتەو نی یە، خوداپەرستیەکەی لەسەر لایەکی خوارە، تەنها لەیەك حاڵەتدا خواپەرستی دەکات، ئەویش ئەو کاتەی کە دنیا بەدڵی ئەو بێت.

ئەگەر لە ژیانی دا خێر و خۆشی ڕووی تێبکات، ئەوە دڵخۆشە و ڕەزامەندی نیشان دەدات. خۆ ئەگەر تووشی تاقیکردنەوەیەك هات، ناخۆشی و زەحمەتێك هاتە ڕێگای، ئەوە سواری سەری خۆی دەبێت و هەڵدەگەڕێتەوە و بێزار دەبێت و ناڕەزایی دەنوێنێت. جا ئەو کەسەی کە بەو شێوە خوابپەرستێت، ئەوە بەو هەڵوێستەی دنیا و قیامەت لەدەست خۆی دەدات و. زەرەرمەندە لە هەردوو جیهاندا، بێگومان ئائەوە خەسارەتمەندی و زەرەرمەندیەکی ڕوون و ئاشکرایە، لە حاڵێکدا دنیا تەمەن کۆتایە و ژیانی قیامەت نەبڕاوەیە..

## سەرنجی ژیانی ئەم بانگخوازە بدە:

بانگخواز (عبدالله بانعمه) ناوبراو خەڵکی شاری جدەی وڵاتی سعودیەیە و، توشی ئیفلیجی بووە و تەنها سەری دەجوڵێ!

بەردەوام دۆست و ناسیاو و خەڵکی تر سەردانی دەکەن، ئەویش ئامۆژگاری خێریان دەکات. هەندێ برادەریش هاوکاری دەکەن وە ئەیبەن بۆ مزگەوت و لەوێ کۆڕ و وتار ئەدات، بۆ خۆی دەڵێت: ڕەنگە زۆر کەسی تر هەبێت حاڵی لەمن خراپتر بێت، کەس ناوی نابات و لەجێی نەبوانە، بەڵام کاتێك من بوومە بانگخواز و ئاخیرەتم هەڵبژارد، خوای گەورە زیاتر لای لێکردمەوە و بەفەزڵ و کەرەمی خۆی بەسەری کردمەوە، بەڕاستی دینداری پایە بەرزی یە بۆ دنیا و

قیامەت. ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَـٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ۝١٠﴾الأنبياء.

ناوبراو باسی سەرگوزشتەی ژیانی خۆی دەکات و دەڵێت: من گەنجێکی دوور لەخوا بووم و کۆمەڵێ هاوەڵی خراپم هەبوو، جگەرەم دەکێشا و سەرگەرمی هەواو ئارەزوو دنیابووم.

باوکم بیستبووی کە جگەرە دەکێشم، ڕۆژێك لێی پرسیم جگەرە دەکێشی؟ دەنگم بەسەردا بەرز کردەوە و بەدرۆ سوێندم بۆ خوارد کە جگەرە ناکێشم.

ئەویش توڕە بوو دوعای لێکردم و پێی وتم: یاڕەبی ملت بشکێت ئەگەر درۆ بکەیت و جگەرە بکێشیت. دیارە سوێندی درۆ تاوانێکی گەورەیە، هەروەها دەنگ بەرزکردنەوە بەسەر دایك و باوکدا گوناهە، زۆر گەورەترە لە ووشەی (ئۆف) کە نابێ لە ڕووی دایك و باوکدا بوترێ:﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا﴾ الإسراء: ٢٣.

هەروەها قورئان لەسەر حەقی دایك و باوك دەفەرمووێ: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا﴾الإسراء: ٢٣.

ئەمە بێجگە لەوەی کە چەندەها فەرموودەشمان هەیە لە بارەی حەقی دایك و باوکەوە. دیارە دوعای باوکیش بەچاك و بەخراپ

دوور نی یە گیرابێت لەسەر منداڵەكانیان. (بۆیە پێویستە دایك و باوك خۆ بپارێزن لەوەی كە دوعای شەڕ لە منداڵەكانیان بكەن).

بەڵێ ئەم گەنجە دەڵێ: بۆ بەیانی درەنگانێ لەخەو هەستام، بەناوی قوتابخانەوە چوومە دەرەوە، لەگەڵ هاوڕێ خراپەكانمدا خۆمان دزیەوە لە قوتابخانە و چووین لە قەراغ دەریا مەلەمان كرد، دوایی بۆ ئەوەی خوێی دەریامان لێ بێتەوە وتمان با بچین بۆ مەلەوانگە خۆمان بشۆین. كاتێك هاتین بۆ مەلەوانگە سەیرمان كرد داخراوە، خەریكبوو برادەرەكانم بگەڕێنەوە، من هانم دان كەبەسەر دیواردا سەربكەوین، تومەز شوێن قەدەری خۆم كەوتوم.

بەڵێ بەسەر دیواردا بازمان دا و لەسەر بەرزی یەوە خۆم هەڵدایە حەوزی مەلەكەوە. ویستی خوا وابوو كە بەسەردا بكەومە ئاوەكەوە و فەقەراتی ملم بشكێ و چوار پەلم ووشك ببێت!!

لەچەند چركەیەكدا چوار پەلم ووشك بوو، نەمدەتوانی دەست و قاچم بجوڵێنم و مەلە بكەم!

دەستم بەكەسدا نەدەگەیشت، دەنگم بەكەسدا نەدەگەیشت. بۆ چەند خولەكێك خۆم گرت كە ئاو نەچێتە دەممەوە و هەناسە نەدەم، بەلام سوودی نەبوو، ئەو چەند خولەكە چیم دی؟!

قورئان دەفەرمووێ: ﴿فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾﴾ ق.

پەردەی سەرچاو و دڵم لاچوو، مردنم بینی، بەڕاستی مەوقیفێکی سامناکە، فلیمی ژیانی (١٩) ساڵی تەمەنم بەخێرایی هاتە بەرچاوم کە هەمووی گوناهو دور لە خوایی بوو.

ئەوەی کە تیایا دڵم پێی خۆشبوو، ئەو خێرە بوو کە ئەمدا بە پیرەژنێك و ئەویش دەستی بەرز دەکردەوە و دوعای بۆ دەکردم... ئینجا خوا هێنای بەدڵمدا کە هەر کەس بمرێ و دوا وتەی (لا إله إلا الله) بێت، ئەچێتە بەهەشتەوە. هەر ئەوەندە فریاکەوتم بەخێرایی بڵێم: (**أشهَدُ ألّا إلهَ إلّا اللهُ، وَ أشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ**)، ئیتر خۆم بۆ نەگیراو ئاوم قوتدا و لەهۆش خۆم چووم..

بەهەموو حیسابێکی بەشەری دەبوایە من ئێستا لە گۆڕدابومایە، یەك چارەکە سەعات لەژێر ئاوەکەدا بووم. ئینجا دەریان هێنابووم و بردبوویانم بۆ خەستەخانە !.

بەڕاستی کاروکردەوەی چاکە مرۆڤ دەپارێزێ لە عاقیبەتی شەڕی، (**صَنائِعُ المَعْرُوفِ تَقي مَصارِعَ السُّوءِ**). بۆیە تکاتان لێدەکەم کە کاری چاکە زۆر بکەن، موسڵمانێك درك و داڵ لەڕێی موسڵماناندا لابەرێ، خوای گەورە لە پاداشتی ئەو چاکەیەدا ئەیخاتە بەهەشتەوە.

ئافرەتێکی خراپەکاری بەنی ئیسرائیل، ئاوی دا بەسەگێکی تینوو، خوا لە پاداشتی ئەو کارە چاکەیدا لێی خۆشبوو. (**صَنائِعُ**

**المَعْرُوفِ)** زۆر شت دەگرێتەوە.. سەلام کردن، زەردەخەنە، وتەی چاك، ئەمانە هەموو خێر و صەدەقەن..

چوار ساڵ لە نەخۆشخانە مامەوە، شانزە نەشتەرگەری گەورە و بچوکیان بۆ کردم! وا چواردە ساڵە لەسەر جێگا کەوتووم!! دایکم دڵخۆشیم دەداتەوە و دەڵێت: **(إنْشاءَ الله)** کەفارەتی گوناحە.

تووشی حاڵەتێکی خوێن بەربوون بووم، ناچار نەشتەرگەریەکیان بۆ کردم، کە ڕێژەی سەرکەوتنی نەشتەرگەریەکە لە سەدا پێنجە، بەبێ بەنج نەشتەرگەریان بۆ کردم، بۆئەوەی تووشی جەڵتەی دەماغ نەبم!! ئەمجارەشیان خوا نەیکوشتم، ئەوەتا ماوم بۆئەوەی چاکەیەك زیاتر بکەم..

بەڕاستی لەش ساغی تاجێکە لەسەری لەش ساغاندا و هەستی پێ ناکەن. ئەزانن چەند ناخۆشە خواردن و خواردنەوەیەك لەبەر دەمتابێت و نەتوانی دەستی بۆ بەریت و بیخۆیت.. هەمیشە چاوەڕێی کەسێك بکەی بێت بیکات بەدەمتەوە!!

ئەزانن چەند قورسە نەتوانی مێشێك، مێشوولەیەك لەخۆت دووربخەیتەوە؟!!

بەڕاستی دایکم زۆر زەحمەتی بووە بەهۆی منەوە، جاری واهەیە بەچەند ڕۆژ ئەوەی دەیخۆم لەسکما دەمێنێتەوە و نایەتە دەرەوە! لەبەر ئەوەی من جووڵەم نیە. دایکی داماوم زۆر ماندووە بەدەست

پاکردنەوە و جولاندنمەوە. زۆرکەس ڕەنگە قەدری دایك و باوکی نەزانێت، کە خەلات و بەخششێکی زۆر گەورەی خوای بەخشندەن بۆی!

ڕۆژێکیان بیست لاوی بێ باوك و دایك هاتن بۆلام، دوایی کە ڕۆیشتن یەکێکیان گەڕایەوە لام و وتی: خۆزگەم بەخۆت!! وتم: لەخوا بترسە چۆن ئاوات بەمن دەخوازیت! من چواردە ساڵە ئەمە حاڵمە و جووڵەم نی یە و، بوومەتە ئەرك و عەزاب بۆ دەوروبەرەکەم.

وتی: ئەمجارەش خۆزگەم بەخۆت!!

وتم: نازانم بۆ وادەڵێی؟!!

وتی: لەبەرئەوەی تۆ دایك و باوکت هەیە. ئێمە مەحرومین لە نازی دایك و باوك، دوای بەخششی دین و ئیمان بەخششی دایك و باوك دێت. عبدالله تۆ سوپاسی خوا بکە بەس نی یە دایك و باوکت هەیە!!

ئەم لاوە شەلەل لێدراوە دەڵێ: من سێ ئاواتم هەیە:

خۆزگە بمتوانیایە سوجدەیەك بۆ خوا ببەم بەو شێوەیەی کە سەرم بخەمە سەر زەوی!

وە خۆزگە بمتوانیایە لاپەڕەی قورئان هەڵبدەمەوە، کە زۆرکەس قەدری ئەوە نازانێت، من پێنج جزم زیاترم لەبەرە. کاتێ لەسەر قورئانی بەردەمم دەخوێنم ئەبێ ڕاوەستم تا یەکێك دێت لاپەڕەی

قورئانەکەم بۆ هەڵبداتەوە!! سێیەم ئاواتیشم ئەوەیە، خۆزگە بمتوانیایە باوەشێ بکەم بە دایکما!!

ئامانجیشم ئەوەیە بتوانم ببمە مایەی هیدایەتی کەسانێك کە لەرێ لایان داوە، هەرچەند هیدایەت لە خواوەیە. بەڵام چەند خۆشە ئێمەش هۆکار بین بۆ هۆشیار بونەوە و گەڕانەوە و تەوبەکردنی کەسانێك کە لەخوا دوورن.

داوا لەدایك و باوکەکان دەکەم کە هەرگیز دوعای شەڕ لە منداڵەکانیان نەکەن، ئەوە حەزرەتی (یەعقوب) کە کوڕەکانی گەڕانەوە و وتیان یوسف گورگ خواردویەتی، سور دەیزانی درۆ دەکەن، بۆیە فەرمووی: بەڕاستی گورگێکی بەڕەحم بووە کوڕەکەمی خواردووە و جلەکانی نەدڕیووە.

﴿فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ١٨﴾ یوسف.

یەعقوب (سەلامی خوای لێبێت) هیچ دوعایەکی شەڕی لێ نەکردن.

سوپاس بۆ خوا لەوەوە کە من سەرگەردان بووم و، هانی دەوروبەریشم دەدا بۆ سەرگەردانی بوم بە بانگخواز بۆ ڕێی هەق و ڕاستی، ئێستا بە فەزڵی خوای گەورە و دوعای خێری دایکم، هاوەڵ و دۆستی باشم هەیە و منیش هەرچی سەردانم دەکات ئامۆژگاری خێری دەکەم، بەڵکو پەند و عیبرەت لە ژیانی من و لە قسەکانم وەرگرن.

**بەئەندازەی زانینتان بانگەوازبکەن..**

خوای گەورە میهرەبانە هەموو دەرگاکان داناخات، ئەگەر خەڵات و بەخششێکی بۆ تاقیکردنەوەیەك لێ سەندی، چەند دەرگای ترت بۆ دەکاتەوە، هەر کەس بستێك بچێت بەلای خواوە خوای گەورە باڵێك دەچێت بەلای ئەودا، کێ بەپێ بچێ بەرەو لای خودا، خوای گەورە بە فەزڵ و گەورەیی خۆی بە ڕاکردن بەرەو پیری دێت. هەرچەند من ناتوانم دەموچاوی خۆم بخورێنم بەڵام من ئاسودەم، ئاسودەییەك کە زیاترە لە ئاسودەیی هەر شەش ملیارەکەی خەڵکی سەر زەوی.. من بانگەواز دەکەم، چونکە پەروەردگار باسی ئوممەتی ئیسلام دەکات و دەفەرمووێ: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ۗ.. ﴿١١٠﴾﴾ آل عمران.

بەڕاستی هەموتاکێکی موسڵمان بە ئەندازەی شارەزایی و توانای گەیاندنی دروست و ڕاست بەرپرسیاریەتی بانگەواز لەسەر شانیەتی.

باڵندەیەکی لاوازی وەکو (پەپو سلێمانە) ـ هُدْهُدْ ـ لە زەمانی حەزرەتی سولەیماندا (سەلامی خوای لێبێ) خەمی بانگەوازی بوو، خوای گەورە بەهۆیەوە گەلێکی لە خۆرپەرستی یەوە ڕزگار کرد

بەرەو خواپەرستی. هەروەكو خوای گەورە لەبەر بەرزی هەڵوێستی هُدْهُدْ لە سوڕەتی ـ النَّمل ـ دا بەدرێژی باسی كردووە.

بەڵێ كاتێك گەنجێك هاوسەرگیری دەكات، پێویست ناكات كەس پێی بڵێ بڕۆ كاربكە. ئەوە شتێكی بەڵگە نەویستە كە ژنی هێناوە، بەرپرسیاریەتی بۆ دروست بووە و، ئەبێ هەوڵ بدات خۆی و هاوسەرەكەی و منداڵەكانیشی بژیەنێت.

كەسێكیش بەهەمان شێوە كە موسڵمان دەبێت و دەڵێت: (**لا إلهَ إلَّا الله، محمّد رسول الله**) بەوە بەرپرسیاریەتی دەكەوێتە سەر شانی، ئەگەر پێی بڵێی دەبێ خەمی بەرنامەی خوا و بانگەوازت هەبێت، لای سەیرە، ڕەنگە بڵێ چۆن؟!

لە فەرموودەدا هاتووە لە قیامەتدا خەڵكی یەخەتان دەگرن (**يتعلق أناسٌ فِي رِقابِكُمْ يَوْمَ القِيامَةِ**) یەكێ یەخەت دەگرێ و دەڵێ: تۆ هەق و ڕاستیت دەزانی، بۆ نەهاتی پێم بڵێی؟

یەكێكی تر یەخەت دەگرێ، دەڵێ: من ستەمم لێدەكرا بۆ هاوكاریت نەكردم، ڕووبەڕووی ستەمكار ببمەوە؟!

جامادام دەڵێین: (**لا إلهَ إلَّا الله، محمّد رسول الله**) و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانمان پێ دەكا بە بانگەواز و دەفەرمووێ: (**بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً**) كەلەم فەرموودە شیرینەدا سێ شتی جوان و گرنگ كۆبۆتەوەكە ڕەوانبێژی ـ جوامعُ الكلِمِ ـ ی پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەخات. (**بَلِّغُوا**) ئەمە تەكلیفە كە ئەبێ پێی هەڵسین.

(عَنِّي) تەشریفە، چونکە دەفەرمووێ لەمنەوە، تۆ لەجیاتی پێغەمبەری خوا ﷺ تەبلیغات بکەی، پەیامی خوا بگەیەنی ئەوە بەڕاستی ڕێزدار بووی (وَلَوْ آيَةً) ئەمەش تەخفیفە، ئەمە ئەوپەڕی ئاسانکاریە و بیانوی کەسی نەهێشتوە، چونکە کەم کەس هەیە ئایەتێك نەزانێت.

بەڵێ عبدالله ی بانگخواز دەڵێ: لەسایەی خواوە زۆر لەو لاوانەی دێنە لام بەفەزڵی خوا زیاتر پابەند دەبن بەفەرمانەکانی شەرعەوە، هەندێکیان بەهۆی گۆرانی نابەجێ و ناشەرعی و شتی ترەوە دڵیان تەنگە و دوورن لە خوا، کاتێك یادیان دەخەمەوە کە گۆرانی ناشەرعی و نابەجێ دوورڕوویی لەدڵدا دەچێنێ و دڵ پەك دەخات، وازی لێدێنن و دڵیان ئاسودە دەبێت. ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾﴾ طه.

دەبێ داوای هیدایەت لەخوا بکەین، ئەوەی داوای نەکات خوا نایداتێ، هیدایەت بەنرختین شتی ئەم دنیایەیە. (يا عِبادي كُلُّكُمْ ضال إلاّ مَنْ هَدَيْتُهُ فَاسْتَهْدُونِي اهدكُمْ) هەروەك لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتووە.. قورئانیش دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ﴾ العنكبوت: ٦٩.

من داوا لە گەنجان دەکەم کە هاوەڵی باش بۆخۆیان هەڵبژێرن، سەگێك هاوەڵی کۆمەڵێ لاوی خواناسی کرد، باسەکەی لە قورئاندا تۆمارکرا ﴿وَكَلۡبُهُم بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ﴾ الكهف: ١٨.

عبدالله دەڵێ: کوڕێکی پورم ناوی (هانی باحطاب)بوو، منداڵی ئیفلیجی هەبوو، تەمەنی دوو ساڵان بوو. منیش دوو ساڵ لەو گەورەتربووم، من هەر لە منداڵیەوە خزمەتم دەکرد و ئەمکردە کۆڵم و یاریم لەگەڵ دەکرد. کەچی سُبْحانَ الله، من لە (١٩) ساڵیدا توشی ئیفلیجی تەواو بووم. ئێستا هانی دێت دەم و چاوم بۆ دەخورێنێ و خواردن دەکات بەدەممەوە!! ئەوە دنیاکەیە، ئەگەر بۆ پێش تۆ بەردەوام بێ ناگاتە تۆ (لَوْ دامَتْ لِغَيْرِكَ ما وَصَلَتْ إِلَيْكَ) هەرگیز بەخەیاڵمدا نەهاتووە کە ڕۆژێ من وام بەسەربێ و ببم بەبار بەسەر دەوروبەرمەوە.

ئەم گەنجە ئیفلیجە بانگخوازە دەڵێ: کاتێك لە کەناڵی (البِدايَة)وە، چاوپێکەوتنم لەگەڵ کرا، ئافرەتێك کە بەحاڵمی زانی خوای گەورە دڵی نەرم کرد، تەلەفۆنی بۆ کردین و لەبەرخوا شوی پێکردم و تەنها ئەیەوێ خزمەتم بکاو بەمەش دایکی ماندووم ڕەنگە تۆزێ ئەرکی سووك ببێت!. {ڕووسپیەکان، ئەندازیار عثمان ل٤٣}.

## وتەی پرشنگدار

- ئێمە تەنها جارێك دەژین، بەڵام بەسە ئەگەر ئێمە کاری باش بکەین.

- نیوەی یەکەمی ژیانمان بەبیرکردنەوە لە نیوەی دووەمی ژیانمان بەسەر دەبەین، نیوەی دووەمیش بۆ نیوەی یەکەم دەگرین.

- ژیان کتێبێکە، گەوج لاپەڕەکانی هەڵدەداتەوە بێ ئەوەی دیقەتی بدات، بەڵام دانا بەوردی دەیخوێنێتەوە و وا هەست دەکات کە هەلی دووبارە خوێندنەوەی بۆ ناڕەخسێت.

## باقەدر و نرخی خەڵات و بەخششەکانی خوای گەورە بەسەرمانەوە بزانین

بەسەرهات

پیاوێکی تەمەن (٧٠) ساڵ تووشی گرفتێکی تەندروستی بوو، کە ئەویش ئەوەبوو: نەیدەتوانی بەشێوەیەکی ئاسایی میز بکات - خوای گەورە پەنامان بدات - دوا بەدوای زیادبوونی ئێش و ئازاری، دکتۆرەکەی نەشتەرگەریەکی بۆ کرد، پاش سەرکەوتنی نەشتەرگەریەکەشی لیستێکی نەخۆشخانەکەیان دا بە کابرای نەخۆش.

بەبینینی لیستەکە کابرا دەستی کرد بە گریانێکی بەکوڵ، کە دکتۆرەکە بینی لێی چووە پێشەوە و پرسی: ئەگەر پارەکەی زۆرە

و پێت نادرێت، با هەولێکت بۆ بدەین نەخۆشخانە دابەزینێکت لەنرخی نەشتەرگەری و مانەوەی نەخۆشخانە بۆ بکات؟!.

پیرەپیاوی نەخۆشیش وتی: هۆکاری گریانەکەم ئەوە نی یە!! ئەوەی دەمگریەنێ ئەوەیە کە خوای گەورە خەڵات و بەخششی میزکردنی بۆ ماوەی (٧٠) ساڵ تەمەن پێداوم و هیچ لیستێکیشی بۆ نەناردووم!!

(سبحان الله قەدر و نرخی هیچ بەخششێك نازانین، تا ئەوەی کە لەدەستی نەدەین). {یاوەرێك بۆ سەرکەوتن، هاژە شێروانی ل٥٥}.

## ئەگەر تووشی ئازار و نەخۆشی سامناك بویت، پشت بەخوا ببەستە و ئیرادەت بەهێز بێ

**بەسەرهاتێك:** (دایل کارنجی) داستانی پیاوێك دەگێڕێتەوە کە بەبرینی ڕیخۆڵە گیرۆدە بوو بوو. نەخۆشیەکەی ئەوەندە ترسناك بوو، پزیشکەکان کات و ساتی مەرگیان بۆ دەست نیشان کردبوو. هەتا پێیان ڕاگەیاند کە کفنێ بۆ خۆی ئامادە بکات!!

(دایل کارنجی) دەڵێ: لەناکاوێ نەخۆشەکە کە ناوی (هانی) بوو، بڕیارێکی سەرسوڕهێنیدا، بەو شێوەیە بیری لەخۆی کردەوە: باشە ئەگەر لەو ژیانەدا ماوەیەکی کورتم مابێ، بۆبە هەوەسی خۆم لەو ماوەیە چێژ وەرنەگرم؟ چەندە لەمێژە لەخولیای ئەوەدام بەچوار دەوری زەویدا گەشتێ بکەم، ئەو هەلەی ئێستام ئەو هەلەیە

ئاواتی خۆمی تێدا بێنمە دی، پاسەپۆرتی ئەم گەشتەی کڕی.
پزیشکەکان واقیان وڕما. پێیان گوت:

ئێمە لەوە ئاگادارت دەکەینەوە کە بتەوێ ئەو گەشتە ئەنجام بدەی، ئەوا گۆڕەکەت دەکەوێتە ناو قولایی دەریا!!

بەلام بەو جۆرە وەلامی دانەوە: نەخێر.. ئەوەی ئێوە دەیلێن هیچی ڕوونادات. من بەلێنم بە خزمەکانم داوە تەنیا لە گۆڕستانی خانەوادەکەم دەبێ بمنێژن..

بۆیە (هانی) نەخۆش بڕیاری خۆی دا و سواری کەشتی بوو! دەستی کرد بەو گەشتە پڕ لە ئارامی و بەختەوەریەی بڕیاری لێ دابوو. لەناو کەشتی یەوە نامەیەك بۆ خێزانەکەی دەنێرێ و تیایدا دەلێ: لەسەر پشتی کەشتیدا ئاو دەخۆمەوە و ئەو خواردنەی دلم بۆی دەچێ و بەچێژ و خۆشە دەی خۆم. لەخۆشیاندا وا چەند هەلبەست و هۆنراوەم هۆنیوەتەوە!

جۆرەها خۆراك دەخۆم. هەتا ئەو چەوریەی لێم قەدەغە کرابوو. لەو ماوەیەدا ئەوەندەم بەخۆشی بەسەر بردووە، کە لەژیانی خۆمدا خۆشی وەهام نەبینیوە!.

پاشان بزانین ئەم نەخۆشە کە چاوەڕێی مردنی لێدەکرا چی لێ بەسەردێ؟ (دایل کارنیجی) لای وایە کابرا لە نەخۆشی چاك دەبێتەوە، ئەو شێواز و ڕەفتارەی پیادەشی کردبوو، شێوازێکی سەرکەوتوو بوە بۆ بنبنڕکردنی نەخۆشی و زالبوون بەسەر

ئەشكەنجەدا.. مەبەست لەم داستانە ئەوەیە كە: شادی و گوشادی و ئاسوودەیی و بەختەوەری چەندین پلە لەداو و دەرمانی پزیشكی سودمەندترن. {خەمبارمەبە، د. عائض القرني. وەرگێڕانی: أحمد شێخ عبدالله وەرتی ل٢٠٢}.



## بیر لەو شتانە بكەنەوە كە هەتانە..

نوسەر و مامۆستای زانكۆ (د. عائض القرني) لە كتێبە بەناوبانگەكەی خۆیدا، بەناوی: (لاتَحْزَن، ص٢٣٥) دەڵێ: سەرم سوڕماوە لەجوانی قسەی زانای دەروون ناس (ولیم جایمس)، كە زانایەكی هەرە بەناوبانگی دەروونناسی ئەمریكیە و زۆر بەناوبانگە لەلای ئەمریكیەكان بە (باوكی زانستی دەروونناسی) ناسراوە. ئەم زانا گەورەیە دەڵێ: (**إنَّنا نَحْنُ البَشَرَ نُفَكِّرُ فيما لا نَمْلِكُ، وَلا نَشْكُرُ اللهَ عَلى ما نَمْلِكُ، وَنَنْظُرُ إلى الجانِبِ المَأْسَوِيِّ المُظْلِمِ في حَياتِنا، ولا نَنْظُرُ إلى الجانِبِ المُشْرِقِ فيها، وَنَتَحَسَّرُ عَلى مَ يَنْقُصُنا، وَلا نَسْعَدُ بِما عِنْدَنا**).

واتە: ئێمەی مرۆڤ زۆربەی كات زۆربەمان بیر لەوشتانە دەكەینەوە و خۆزگەیان بۆ دەخوازین كە نیمانە. بەڵام شوكرانە بژێری خوا ناكەین لەسەر ئەوەی هەمانە و لەبەردەستماندایە. وە تەماشای لایەنی خەماوی و تاریكی ناسۆرەكانی ژیانمان دەكەین،

بەلاّم ناڕوانینە لایەنی ڕۆشن و ڕووناك و دڵخۆشکەری ژیانمان. وە هەمیشە ئاهو حەسرەت هەڵدەکێشین بۆ ئەوەی کە لەدەستمان داوە یان کەموکوڕیە لە ژیانماندا. بەلاّم خۆشبەخت نین بەوەی کەلەبەردەستماندایە.

خوای گەورەش دەفەرمووێ: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾ ئەگەر شوکرانە بژێربن لەسەر ئەوەی هەتانە بۆتان زیاد دەکەین. وە پێغەمبەری خواش ﷺ، دەفەرمووێ: (**وَ أَعُوذُ باللهِ مِنْ نَفْسٍ لا تَشْبَع**). پەنا دەگرم بەخوای گەورە لە نەفسێك کە تێر نابێ.

ئەفلاتون دەڵێت: (ئەگەر ڕۆژێك پلە و پایەت هاتە خوارەوە، نائومێدمەبە، چونکە خۆر گشت ڕۆژێك دێتەوە خوارەوە و بۆ ڕۆژێکی نویێ بەرز دەبێتەوە).

### لەگەڵ تۆ نەهات و لەگەڵیشت ناڕوات

دەگێڕنەوە پیاوێکی دانا سەیری کەسێکی خەمباری کرد، وتی: ئەی پیاو دوو پرسیارت لێدەکەم و وەلاّمەکانیم دەوێت؟

پیاوە مەحزون و خەمبارەکەش وتی: بپرسە.

پیاوە داناکە وتی: هاتویتە ئەم دنیایەوە و ئەم خەم و خەفەت و گرفتانەش لەگەڵ خۆت دەبەیت؟ ئەویش وتی: نەبەخوا..

پیاوە داناکەش وتی: کارێك لەگەڵ تۆ نەهات و لەگەڵیش ناڕوات، واباشترە کە خەم و خەفەت ئەوەت لێنەبات کە هەتە.

خۆڕاگربە لە گرفتەكانی دنیات. دەبا سەیركردنت بۆ ئاسمان درێژتر بێت لە سەیركردنت بۆ زەوی. ئەو كات ئەوەت بۆ دێت كە دەتەوێت.

بەم شێوەیە پیاوەكە بە سینەیەكی كراوە دەرچوو و لەبەر خۆشیەوە دەیوت: (كارێك لەگەڵ تۆ نەهات لەگەڵیشت ناڕوات)، كەواتە: واباشترە كە خەم و خەفەت لەناوت نەبات.

ئیمامی شافیعیش دەڵێت:

لێگەڕێ بارۆزگار چی دەكات بیكات.

دەرونێك چارە بكە كە قەزا و قەدەر بیكات.

بۆ نەهامەتیەكانی شەوانیش مەگری.

كوا نەهامەتیەكانی دونیاش تاسەر دەمێنێ. {یاوەرێك بۆ سەركەوتن، هاژە شێروانی، ل٤٠}



## وتەکانی دکتۆر ئیبراهیم فەقێ بۆ گۆڕینی ژیانت:

- خەفەت مەخۆ بۆ شتەکانی دونیا، چونکە دروستکراوین بۆئەوەی تاقیبکرێینەوە و توشی خۆشی و ناخۆشی ببین، تا خوای گەورە بمانبینێت ئایا ئارام دەگرین؟ هەر بۆیە لەسەرخۆبە و مەشێوێ و دڵنیابە کە دەرچونت نزیکە، هەوریش کاتێك چڕ دەبێت و ڕەش دەبێت، بەڵگەی ئەوەیە کە باران بارین نزیکە.

- هەندێك کات هەیە کە هەست دەکەیت کۆتاییە، لەدواییدا دەبینیت کە سەرەتایە، هەندێك دەرگاش هەیە واهەستدەکەیت کە داخراوە، لەدواییدا دەبینیت کە ئەوە دەروازەیەکی ڕاستەقینەیە.

- ئەگەر پێداگریم نەبوایە فێرنەدەبووم، بێزاریش نەبوایە دڵخۆش نەدەبووم، ئازاریش نەبوایە نەدەحەسامەوە، نەخۆشیش نەبوایە چاك نەدەبوومەوە، هەژاریش نەبوایە دەوڵەمەند نەدەبووم، ونیش نەبومایە بونم نەدەبوو، شکستەکانیشم نەبوایە سەرنەدەکەوتم..

- کار بەبێ هیوا بوون، دەبێتە هۆی لەدەست چونی کار.. هیواش بەبێ کار دەبێتە هۆی بێهیوایی، بەختەوەری کار بەهیواوەیە، جوانی هێواش بەکارەوەیە.

# باڵێکدانەوەی گەش بینانەت هەبێ بۆ ڕووداوەکانی ژیانت..

دەڵێن پیاوێك هەبوو، گەیشتە تەمەنی خانەنشینی و لە ماڵەکەی دانیشت و دەستی کرد بە نوسینی ئەو نەهامەتیانەی کە بەدرێژایی ژیانی بەسەریدا هاتووە. نوسی: ساڵی پار نەشتەرگەری زراوم کرد و چەند مانگێ لەجێگەدا کەوتم، تەمەنم بوو بە شەست ساڵ و ئەو کارەم جێهێشت کە سی ساڵبوو تێی دا خزمەتم دەکرد.. باوکم مرد، کوڕەکەشم لەکۆلێژی پزیشکی فەصڵ کرا، لەبەرئەوەی چەند مانگێك نەچوو بۆ دەوام، بەهۆی کارەساتی ئوتومبێل کە توشی بوو، کۆتایی بە قسە و نوسینەکانی هێنا بەوەی کە: ئای کە ساڵێکی پڕ شووم و نەهات بوو! !

لەناکاو خێزانەکەی هاتە ژوورەوە و بینی کە هاوسەرەکەی زەینی ڕۆیشتوە و لەناو خەمدا نقوم بووە، لەسەر سەریەوە بە تیلەی چاوێك کاغەزەکەی بەردەستی خوێندەوە و، بینی لە ژوورەکە چووە دەرەوە..

دوای کەمێك گەڕایەوە، کاغەزێکی هێنا و خستیە تەنیشت ئەوەی هاوسەرەکەی نوسیبووی، لەم کاتەدا مێردەکەشی کاغەزەکەی بەرز کردەوە و خوێندیەوە نوسرابوو:

ساڵی پار لەو دەرد و ئازارە ڕزگارت بوو، کە چەند ساڵێك بەدەستیەوە دەتناڵاند، تەمەنت بوو بە شەست ساڵ و

تەندروستیت لەوپەڕی باشیدایە. دوای خانەنشین بونت خۆت تەرخان دەكەیت بۆ خوێندنەوە و نوسین... باوكیشت ژیا تاتەمەنی بوو بە هەشتاو پێنج ساڵ، بەبێ ئەوەی بێزاری بۆ دەوروبەرەكەی دروست بكات و بەبێ خەم و ئازار سەری نایەوە. كوڕەكەشت لە مردن دەربازی بوو لەم كارەساتی ئوتومبێلە و بەتەواوی چاك بۆوە بەبێ هیچ كەم و كوڕیەك. دێڕەكانی كۆتایی پێهێنا بەوەی: (ئای چ ساڵێك بوو كەخۆش بەختیمان زاڵ بوو بەسەر بێ بەختیمان!).

لەپەرداخێكی نیوەدا، نیوە پڕەكە ببینە، نەك نیوە بەتاڵەكە:

بەسەرهات

نوسەرێك دەڵێ: كاتێك لەكۆتایی شەستەكانی سەدەی ڕابردوو ژنی هێنا، شوقەیەكی بەكرێ گرت و نەیتوانی ناو ماڵەكەی پڕ بكات لە كەلوپەل، لە هەفتەیەكیشدا تەنها یەك جار گۆشتی دەخوارد. هیچ هۆیەكی گواستنەوەشی نەبوو.. جگە لە پێیەكانی و خێزانەكەشی زۆر بە قەناعەت بوو، هەرگیز سكاڵای نەداری و هەژاری گوزەرانی نەدەكرد، دەڵێت:

كاتێكیش گەشت بكەین دەرگای شوقەكەمان بەهێواشی دادەخەین، چونكە دڵنیاین هیچی وامان نی یە بدزرێت، ئەگەر هاتوو دزیش هات لەوانەیە ئەوەی پێیەتی بۆمان بەجێ بێڵێت. بەم شێوەیە ژیانمان تێپەڕی بەخۆشی و بەناخۆشی، خوای گەورەش

کچ و کوڕی پێ بەخشین لەگەڵ خەڵات و بەخششێکی زۆر کە لە هەژمار نایەت. ئەمەش لە چاکی و گەورەیی و بەزەیی خۆیەتی و ئێمەش بەردەوامین لەسەر ئەم جۆرە گوزەرانە و زۆر پێی سوپاسگوزارین.

کەواتە: با هەوڵبدەین ڕووناکی کۆتایی تونێل و شەمەندەفەر و کۆتاییەکەشی ببینین، کە دیارە ئەمەش سیمای کەسی واقیعیە لە ژیاندا. بەوپەڕی قەناعەتەوە بژین و ژیان بەهیوا و ئاواتەکانمان و خەونە جوانەکانمان جوانتر و جوانتر بکەین.{یاوەرێك بۆ سەرکەوتن، ل٢٦}.



## لەخوا غافڵ مەبە و هەرگیز لە ڕەحمی خوا نائومێد مەبە

پێشەوا - إِبْنُ حَجَر الهَيْتَمي - لە کتێبەکەیدا - الزَّواجِر - دەفەرمووێ: (**سُوءُ الظَّنِ باللهِ تَعالى وَ القُنُوطُ مِنْ رَحْمَتِهِ مِنَ الكَبائِرِ**).

واتە: گومانی خراپ بردن بەخوای گەورە و نائومێد بوون لە ڕەحمەتی خوا لە گوناهە هەرە گەورەکانە! بەبەڵگەی ئەوەی خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾﴾ الحجر.

واتە: كێ نائومێد و بێ هیوا دەبێت لە ڕەحمەت و بەخششەكانی پەروەردگاری، مەگەر كەسانێكی گومڕاو سەرگەردان.

زانایان فەرموویانە: (**شَرُّ النَّاسِ الَّذِينَ يُقَنِّطُونَ النَّاسَ مِنْ رَحْمَةِ اللهِ**).

واتە: خراپترینی خەڵكی ئەو كەسانەن كە خەڵكی نائومێد دەكەن لە ڕەحمەت و لێخۆشبوونی خوا. ئەوەندەی باسی سزا و خەشمی خوا و، غەزەبی بۆ گوناهبار و تاوانكاران باس دەكەن بەتەنهاو باسی فراوانی دەرگای ڕەحمەتی خوا و، لێخۆشبوونی لە خراپەكاران بە تەوبە و پەشیمانی، باس ناكەن و سەرەنجام ئەو كەسانە نائومێد دەبن لەوەی كە خوا ڕەحمیان پێ بكات و لێیان خۆش بێ. بۆیە لەسەر خراپە و گوناه بەردەوام دەبن و تەوبە ناكەن!... {نظرة النَّعيم ج١١، ص٥٣٤٤}.



## وانەی بیست و نۆیەم:

# ئەی هەژار
# لەخوا غافڵ مەبە
# دەرگای ڕەحمەتی خوا کراوەیە!

## وانەی بیست و نۆیەم

## بابەت: ئەی هەژار لەخوا غافڵ مەبە، دەرگای ڕەحمەتی خوا کراوەیە..

❁ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ۗ وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾﴾ البَقَرَة.

**❁ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (مَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّر يُصَبِّرْهُ اللهُ، وَلَنْ يُعْطَوْا عَطاءً خَيْراً وَأَوْسَعَ مِنَ الصَّبْرِ). رَواهُ البُخارِيُّ: (١٤٦٩). وَمُسْلِمْ: (١٠٥٣).**

### سەرچاوەکان:

١) مَوْسوعَة الآداب الإسْلامِيَّة، أيمن المزين، ص٣٦٢.

٢) لاتَحْزَنْ، محمد متولي الشَّعراوي، ص٢٦٣.

٣) ئاو و ئاور، هێمن خورشید، ل٢٧١.

٤) گۆڤاری (دوانگە) ژمارە: ٤٧، ل١٢.

٥) گۆڤاری: (پەیامی زانایان)، ژ: ٩٠٨٩، ل٢١.

٦) مرۆسازی، محمد رضا رنجبر، وەرگێڕانی لە فارسیەوە: ڕزگار حمە سلیم، ل٥٣.

٧) بەختەوەر بژی، د. محمد عبدالرَّحمن العریفی، و: هێمن محمد علی، ل٢٤٥.

٨) بەرەو بەهەشت، ئەندازیار عثمان، ل٢٦.

٩) ئەسرینەکانی سەدەی (٢١/٢٠) ئاوات أبوبکر أحمد، ل١٢٧.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ لله رَبِّ العالَمين. وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلهِ وَ صَحْبِهِ أجْمَعينَ:

یەکێ لەو گرفت و نارەحەتیە گەورانەی کە لە ژیاندا وەکو تاقیکردنەوە دێنە سەر ڕێگای مرۆڤ، وە بەڕاستی ئازاری دەدەن و خەمباری دەکەن، بریتیە لە هەژاری و دەست کورتی.

ئەڵێن لوقمانی حەکیم فەرموویەتی: ئەگەر گوژاڵك تاڵە، بەلاّم هەژاری تاڵترە !.

وەچینی فەقیر و هەژاریش لە قورئاندا زۆر باسکراون. ئێمە لەم وانەیەدا بەویستی خوای گەورە ڕوو لە هەژاران دەکەین و دەڵێین: لەخوا غافڵ مەبە و بزانە هەژاریەکەت مانای ئەوە نی یە کە لەلای خوا سوکی و بێ نرخی. بەڵکو نرخی تۆ بەدڵتەوەیە کە ئیمانی تێدایە، نەك بەوەی کە لەسەر دڵتە کە گیرفانتە ! تەماشای قورئان بکە لەبارەی هەژارانەوە دەفەرمووێ:

﴿لِلۡفُقَرَآءِ ٱلۡمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَـٰرِهِمۡ وَأَمۡوَٰلِهِمۡ ﴾ الحشر: ٨.

واتە: ئێوە یارمەتی و هاوکاری بدەن بە کۆچبەرانی هەژار و نەدار، ئەوانەی لەماڵ و حاڵی خۆیان دەربەدەرکران لەبەر ئیسلامەتی و دینداریان..

هەروەها خوای گەورە لە قورئاندا، هەر لەبارەی هەژارانەوە دەفەرمووێ: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ البقرة: ٢٧٣.

واتە: خێر و بەخشینتان پێشکەش بکەن بەو هەژار و نەدارانەی کە لێبڕاون بۆ خوا، ناتوانن بەزەویدا بگەڕێن بۆ کاروکاسپی کردن، چونکە سەرگەرمی خوێندن، یان کاری بانگەواز و خزمەتن لەپێناوی خوادا..

ئیمامی غەزالی لەبارەی ئەم دوو ئایەتەوە کە باسی هەژارانی تێدا کراوە دەفەرمووێ:

**(ساقَ الكَلامُ فِي معرض المدحِ، ثُمَّ قَدم وَصفهم بالْفَقْرِ عَلى وَصْفِهِمْ بالْهِجْرَةِ وَالإِحْصارِ، وَفيهِ دَلالَةٌ ظاهِرَةٌ عَلى مَدْحِ الفَقْرِ)**. واتە: ئەم قسە و باسە لەبواری مەدح و ستایشدا هاتووە، پاشان خوای گەورە وەصفی ئەوانی کردووە بەهەژاری و، صیفەتی هەژاری پێش خستوە بەسەر صیفەتی کۆچکردن لەپێناوی خوا و دابڕان و خۆیەکلایکردنەوە لەبەرخوا. ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر مەدح و ستایشی هەژاری...

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**قُمْتُ عَلى بابِ الجَنَّةِ، فَإِذا عامَّةُ مَنْ يَدْخُلُها الفُقَراءُ**). رَواهُ البُخاريُّ: (٦٥٢٧) وَمُسْلِم: (٢٧٣٦).

واتە: وەستام لەسەر دەرگای بەهەشت و بینیم، زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی دەچنە بەهەشتەوە هەژارەکانن.

## ئەی هەژار لەخوا غافڵ مەبە و هەوڵبدە ئەم خاڵانە جێبەجێ بکە:

### ١) ئەی هەژار ناڕازی مەبە بەبەشی خودا

ناڕازی مەبە بەوەی کە خوای گەورە بە هەژاری تاقیکردویتەوە، ناشکور مەبە بەبەشی خوا. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (**إثْنانِ يَكْرَهُما ابْنُ آدَم: يَكْرَهُ المَوْت، وَالمَوْتُ خَيْرٌ لَهُ مِنَ الفِتْنَة، وَيَكْرَهُ قِلَّةَ المالِ، وَ قِلَّةُ المالِ أَقَلُّ لِلْحِساب**). حَديثٌ صَحيح، رَواهُ أحمد في المُسْنَد، (صَحيح الجامِع لِلْألباني: ١٣٩). واتە: نەوەی ئادەم دووشت دەبوغزێنێ و حەزی پێ ناکات. حەزی لە مردن نی یە، لەکاتێکدا مردن بۆی باشترە لەوەی کە تووشی فیتنەی بێ دینی ببێ و بەبێ دینی بژی. وەڕقی لە کەمی ماڵ و سامانە، لە کاتێکدا کەمی ماڵ و سامان حیساب و لێپرسینەوەی قیامەتی کەمترە.

بەڵێ ناشکوری مەکە بە هەژاریەکەت. بەڵکو بزانە هەموو مرۆڤەکان لەسەر زەویدا لەهۆڵی تاقیکردنەوەدان و هەریەکەمان بەجۆرێ تاقیدەکرێینەوە. لەبەرئەوە دڵنیابە: (ئازار تایبەت نی یە بەیەك توێژ). ئەوەتا تەماشاکە:

ئەو کەسەی وا لەناو بیاباندا دەژی، ناڵە ناڵ و هاواریەتی بۆئەوەی چۆن چۆڕێ ئاوی شیرینی دەست بکەوێ و بیخواتەوە.. ئەو کەسەشی کەوا لەباشترین و خۆشترین گەڕەکی شاردا دادەنیشێ و ئاو و کارەبا و سپلیت و تەلەفۆن و تەلەفیزیۆنیشی هەیە، دەبینی داد و بێدادیەتی لەدەست نەخۆشی گەدە و بەرز بوونەوەی پاڵە پەستۆی خوێن و شەکرە و ڕۆماتیزمە و قەڵەوی و چەندین دەرد و نەخۆشی تر.

- ئەگەر کەسێك ملیۆنێر بێ و لە پایتەختی وڵاتدا دانیشێ و، خەو بە چیەوە ببینێ لەبەر دەستی دابێ. هەرچەندە لەڕووی ماددیەوە لە هیچی کەم نی یە. بەڵام وەرە سەیری ناو ناخی بکە بزانە چۆن دەناڵێنێ بەدەست خەمۆکی و، وەسواسی و ترسی ناخ و دڵەڕاوکێ و دەیان نەخۆشی دەروونی!

- ئەگەر کەسێ دەبینی خوای گەورە سەروەت و سامانی زۆر و، تەندروستی و لاشەی ساغی پێداوە و، ژنێکی جوان و خاوەن حوسن و جەمالی بێوێنەی هەیە.. کەچی بەوەوە گرفتارە کە دڵی پیسە لە ژنەکەی و هەمیشە وادەزانێ خەڵکی سەیری خێزانی دەکەن. بەمەش وەکو دڵۆپێ ژەهر بکەیتە جامێ هەنگوینەوە، هەمووی لەناو دەبات و هەست بە هیچ خۆشیەك ناکات.

- ئەو پاشا و دەسەڵاتدارەی کە بە ئاماژەیەك گەردنی کێی بوێت دەیبڕێت، حەز بکات ماڵی کێی بویَ دەیڕمێنیَ، دەبینی بۆتە کۆیلەی ئارەزووەکانی و بەردەستی ئاوات و خۆزگە پەست و نزمەکانی و گەردن کەچی داواکانی جەستەیی.

- ئەو زۆرانبازە بەهێزەی هەتا دوێنیَ پیاو ئەوە پیاوەبوو بتوانیَ توخنی بکەویَ، وا ئێستا توشی دڵ گەورەبوون بووە، لەئەنجامە زلبوونی ماسولکەکانی جەستەیەوە ! !

بەکورتی: بەختی هەمووومان لەم دنیایە زۆر لەیەکەوە نزیکە، تۆ تەماشای ڕووکەش لەخۆشبەختی و چەند دەوڵەمەند بیَ و هەزار چەند لات و کەمدەست بیَ، پشك و بەشیان لە خۆشبەختی و بەدبەختی ئەم دونیایە لەیەکترەوە نزیکە، خودا بەقەدەر ئەو شتەی پێت دەدا، لێت دەستێنیَ. ئەگەر لە شتیَ بیَ بەشی کردی، لەولا بۆت پڕدەکاتەوە. ئەگەر بارێکی خستە سەر شانت یەکێکت لەکۆڵ دادەگریَ... ئەگەر هەر یەکێك لە ئێمە بچوینایە دڵی ئەویترمانەوە دڵمان بە حاڵی دەسوتا.

لەدادپەروەری تەرازووی پشتی پەردەش حاڵی دەبوین، لەوەی گەڕیَ کە تەرازووی ڕووکەش، هەمیشە سەنگەلا دێتە پێش چاوان، هەرگیزیش هەستمان بە ئێرەیی و کینە و لەخۆبایی بوون نەدەکرد.. ئەو کۆشك و تەلار و زێڕ و گەوهەرەی بەچاو دەیبینی

تەنها ڕووکەشی دەرەوەن، لەناخی دانیشتوانی ئەو تەلارانە بپرسە، بزانە چەند ئاخ و حەسرەت لەناویا پەنگی خواردۆتەوە!

ئەگەر بەباشی لەم شتانە تێ گەشتیباین بە نەفس بەرزی دنیامان دەست دەکەوت. بەویژدانەوە ژیانمان بەڕێ دەکرد. چاکەکاریمان دەکردە چەکی دەستمان لە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی، ڕاستت بوێ لەناو مرۆڤەکاندا بەگشتی دۆڕاو و براوە نی یە، وەکو وتمان لەبنەماوە شانسی هەمووان لەوەی ئایا کێ خۆشبەختە و کێ بەدبەختە وەکو یەکە.

کەواتە: ئازار هەر تووشی توێژێکی تایبەت نابێ، بەڵکو کۆلکەی هاوبەشی نێوان هەموو چینەکانە، هەر کەس دەبێ پەرداخێکی لێ بخواتەوە. سەرەنجامیش پەرداخی هەموومان یەکسان دەبێ، سەرباری جیاوازی پلە و شێوەی لە هەر یەکێکماندا..

(ئەمە یەکێکە لە نوسینەکانی: (دکتۆر مصطفى محمود)ی زانای بیریاری میسری. {ئاو و ئاور، هێمن خورشید ل٢٧١}.

## ٢) ئەی هەژار عیزەتی نەفست بپارێزە:

ئەی هەژار عیزەتی نەفست بپارێزە و شکوای حاڵی خۆت تەنها بۆلای خوابە و، داوای لێبکە لە هەژاری ڕزگارت بکات. بەڵکو هەموومان پێویستە بەدڵ دوعا بکەین و لە دەوڵەمەندی ڕاستەقینە کە تەنها و تەنها (الله)یە و هەرچی مرۆڤە و مەخلوقاتە هەژارە و

ئاتاجە بە ڕەحمەتی ئەو، خۆی فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ ٱلۡغَنِيُّ وَأَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُۚ﴾ محمد: ٣٨.

هەموومان لەو خوا دەوڵەمەندە بپاڕێینەوە و بڵێین: ئەی خوای خاوەن بەزەیی و ڕەحمەت، داوات لێدەکەین کە دەرگاکانی ڕەحمەت و بەزەیی خۆت بەشێوەیەك لەڕووی دڵمانا ئاوالا بکەیت، کە ئێمەش بەدڵ و زمان و قسە و قەڵەم و نوسین و ماڵ و سەروەت و سامانمان، ببینە ڕێژنەی ڕەحمەت و بەزەیی و و ببارێین بەسەر بێستانا. ئەڵبەت بێستانی تینوی ژیان و گوزەرانی هەژار و نەداران، بێستانی دڵی پڕ لە ئاهو خەم و حەسرەتیان، بە چەشنێك کە ئیدی کلۆڵی و نەبوونی و هەژاری لەناو مرۆڤەکاندا، بارگە و بنەی بپێچێتەوە و بڕوات.

ئەمەش هیوا و ئاواتی مامۆستا (ئەحمەدی موفتی زادە)ی هەژار دۆستە کە لەم سێ بەیتەدا بەم شێوەیە دەری دەبڕێ و دەڵێ:

ئەی خاوەن ڕەحمەت
دەرگا گەل ڕەحمەت.
وابکەرەوە لەڕووی دڵمانا
بەدڵ، بەزوان، بە قەڵەم، بەماڵ.
ڕێژنەی ڕەحمەت بین بەسەر بێسانا.
بێسانی تینوی ژیانی هەژار
کلۆڵی بارکا لەناو ئینسانا.

بەڵێ ئەی هەژاری بەڕێز، عیزەتی نەفست بپارێزە و هەرگیز باسی دەستکورتی و هەژاری خۆت لای تەواوی خەڵکی دەرمەبڕە، مەگەر باوکت و دایکی خۆت. یان برا و خوشکی دەوڵەمەندی دڵسۆزت، یاخود هاوڕێیەکی دڵسۆزی ئیمانداری نهێنی پارێزت. بەئومێدی ئەوەی هاوکاریت بکەن. وەکەمێ لەنەدامەتی و هەژاریەکەت کەم بکەنەوە، چونکە یارمەتی دانی ئەوان منەتی تێدا نی یە بۆت.

بەلأم: لەلای هەر کەس توشی بوی باسی هەژاری خۆت مەکە.. ئەو هەژارانەی عیزەتی نەفسیان بەرزە خوای گەورە لە قورئاندا ستایشیان دەکات و دەفەرمووێ: ﴿يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ﴾ البقرة: ٢٧٣. واتە: ئەو هەژارانە کە بەهۆی هۆکارێکی ڕەواوە توشی هەژاری بوون و مەجالی کارکردنیان نیە، بەهۆی نەفس بەرزی و ڕاگرتنی کەسایەتی خۆیانەوە، ئەو کەسەی کە لەنزیکەوە نەیان ناسێت و ئاگای لەبارودۆخی ئابوریان نەبێت، وا دەزانێت دەوڵەمەندن.

هەروەها لە هەمان ئایەتی (٢٧٣)ی سورەتی ـ البقرة ـ دا، خوای گەورە جارێکی تر ستایشی هەڵوێستێکی تری مەردانەیان دەکات و، دەفەرمووێ: ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا﴾ واتە:

بەزۆر و خۆسەپاندن داوا لە خەڵکی ناکەن و ناکرۆزێنەوە و ڕووگیریان ناکەن.

**ڕوونکردنەوەیەك:** ڕاستە نابێ هەژار بکرۆزێتەوە و خۆی داوای شت لە خەڵکی بکا و ڕووگیریان بکات و ئەوانیش لەناچاریدا شتێکیان بدەنێ و لەدڵەوە پێیان خۆش نەبێ، کە ئەمە حەرامە.. بەڵام لەهەمان کاتدا نابێ هەژار لوتبەرز و خاوەن فیز و دەعیە بێ و، ئەگەر کەسێکی سەخی تەبیعەت، هەستی بەحاڵی هەژاری ئەم کرد و خۆی یارمەتی و هاوکاری پێشکەش کرد، نابێ ڕەتی بکاتەوە و وەری نەگرێ. لەبەرئەوەی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرموویەتی:

**(مَنْ جاءَهُ مِنْ أَخيهِ مَعرُوفٌ مِنْ غَيْرِ إشْرافِ وَلا مَسْأَلَةٍ فَلْيَقْبَلْهُ وَلا يَرُدَّهُ، فَإنَّما هُو رِزْقٌ ساقَةُ اللهُ إلَيْهِ).** رَواهُ أحمد: (٤/٢٢٠ – ٢٢١) وَصَحَّحَهُ الألْباني ـ الصّحِحَة: (١٠٠٥).

واتە: هەر کەسێ لەلایەن براکەیەوە چاکەیەکی بەرامبەر کرا و شتێکی پێشکەشکرا، بەبێ چاو تێوەبوون و داواکردنی خۆی، ئەوا باوەری بگرێ، وە ڕەتی نەکاتەوە، چونکە بەڕاستی ئەوە ڕزقێکە و خوای گەورە بۆی ناردووە.



## ٣) ئەی هەژار، با هەژاریەکەت هۆکارەکەی تەمەڵی و کارنەکردنی خۆت نەبێ:

بەڕاستی ناشیرینە کاتێ مرۆڤ بێکار و بێ پیشە بێت، بەجۆرێ گوێ نەدات بە بژێوی ژیانی و چاوەڕوانی دەستی خەڵکی بێت. خوای گەورە کاتێ مرۆڤی کردە جێنشین لەسەر زەویدا، دوای هەوڵ و تێکۆشان و کارکردنی لێکرد، کە بەشوێن بژێوی ژیانیدا بگەڕێ و لەو پێناوەشدا ماندووبێ و ڕێگا ببڕێ. چونکە خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی لە زەویدا بڵاوکردۆتەوە و، دەبێ هەر کەس بەدوای بەشی خۆیدا بڕوا و هەڵی بگرێتەوە،وەك دەفەرمووێ:

﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولاً فَٱمۡشُواْ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾﴾ الملك: ١٥. واتە: هەر ئەو خوایە کە ـ الله ـ یە، زەوی بۆ زەلیل و ملکەچ کردوون، هەرچیتان بوێت لەسەری دروست دەکەن، چۆنتان بوێت بەکاری دەهێنن، جا بگەڕێن بەهەموو گۆشە و کەناریدا، لەو ڕزق و ڕۆزیەش بخۆن کە پێشکەشتانی دەکات، دڵنیاش بن کە سەرئەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای ئەو زاتەیە.

بەڵێ مرۆڤ ئەگەر تەمەڵ بوو لە کار و کەسابەت، ئەوا فەقیر و هەژار دەبێت و ژیانێکی زەلیلی دەباتە سەر، لە کاتێکدا ئاینی ئیسلام بۆئەوە هاتووە مرۆڤایەتی بەختەوەر بکات و، کەسیەتی

بەهێز و بەعیزەت بێت. چونکە داواکردن لە خەڵکی و سواڵ کردن پەڵە و نیشانەی شەرمەزاری دوا ڕۆژە.

**دەگێڕنەوە:** یەکێك لە زانایان پرسیار لە کەسێکی تەمبەڵ دەکات و دەڵێ: بۆ هەر پاڵت داوەتەوە و کار و کاسپیەك ناکەیت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: ئاخر من کار بە فەرموودەی پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ

دەکەم کە فەرموویەتی: **(لَوْ أَنَّكُمْ تتوكَّلُونَ عَلى اللهِ حَقَّ تَوَكُّلِه، لَرَزَقَكُمْ كَما يرزق الطَّيْرُ تغدو خِماصاً وَ تَرُوحُ بِطاناً)** رَواهُ الترمذيُّ.

زاناکە تێگەیشت کە کابرا هەڵە لەم فەرموودەیە حاڵی بووە، هەر بۆیە ڕووی کردە کابرای تەمبەڵ و فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویستمان لەباسی تێرکردنی چیکلدانەی باڵندەکاندا، باسی جوڵە و چوونە دەرەوە و گەڕان بەشوێن خۆراکدا دەکات، ئینجا چیکلدانەی پڕەوە دەینێرێتەوە بۆ هێلانەکەی خۆی. نەك بەمانەوە و پاڵدانەوە و دەم کردنەوە!! {پەیامی زانایان، ژمارە: (٩٠٨٩) ل٢١}.



## ئامۆژگارییەکانی ئەحمەدی موفتی زادە بۆ کەسی هەژار

مامۆستا (ئەحمەدی موفتی زادە) لە شعیری (گیانەکەم هەژار)دا، پەیام و مۆژیارییەکی گرنگی مرۆڤی هەژار دەکات و دەڵێ ئەی مرۆڤی هەژار کە گیانی منی، ئای کە چەنێك خۆشەویست و شیرینی، بەلاّم بە مەرجێك لەهەژاریەکەتدا: تەممەڵی و تەوەزەلی و سستی نەکەی لەکار و هەوڵدان بۆ دابین کردنی نان و بژێویتدا. خوا بکات ڕۆژگارێك بێتە پێشەوە کە تۆش لە خەم و مەینەت و نەبوونی و نارەحەتی و گۆشە نشینی و تەنیایی ڕزگارت بێ، بەلاّم ئەی کەسی هەژار تکا و ئاواتم ئەوەیە کە ئەگەر ڕۆژێکی لەو شێوەیە هاتە پێشەوە و ڕزگارت بوو لە نەبوونی و هەژاری، تۆش وەك هەندێ کەسی مایە پوچ و بێ ماریفەت و خۆبەزلزان، خۆت لە هەژارانە بەسەروتر و گەورەتر نەزانی و لەخۆت بایی ببیت، ئەم هەستەشی لەم سێ بەستە شعرەدا دەردەبڕێ:

گیانەکەم هەژار بەو شەرتە لەکار

تەمەڵی نەکەی چەند خوێن شیرینی.

یاخوا ڕۆژگارێ بگا ڕزگاربی

لەخەم و مەینەت لەلانشینی.

یاخوا ئەو دەمە، وەك برێ پوچەڵ

خۆت لە هەژاران بانتر نەوینی.

کاک ئەحمەدی موفتی زادە، یەقینی بە ڕەحمی خوا زۆر بەهێز بووە و دڵنیابووە کە خوای گەورە دەرگای ڕەحمەت لە هەژار دەکاتەوە. لەبەرئەوە ترسی ئەو لە هەژاری نەبووە، ترسی لەوە بوە کە ڕۆژێ خوا ڕزگاری کرد لە هەژاری، لەخۆی نەگۆڕێ و خۆی هەڵنەکێشێ بەسەر هەژار و نەدارەکاندا، کەوەکو ئەو وان، چونکە ئەوە خەجاڵەتی و ڕوو زەردی دونیا و دوا ڕۆژی بەدواوەیە، بۆیە دەڵێ:

تێ ئەگەی چەنێ نەفامەکە خۆ
لەبەر پولێ بانتر ئەزانێ لەتۆ؟!
هەژار گیان ڕۆژێ کەبوی دەوڵەمەن.
دەسمە داوێنت خۆ نەکەی وەپەن.

لە چەند دێڕە شعرێکی تردا، مامۆستای موفتی زادە، جارێکی تر بیری هەژار دەخاتەوە کە ئەگەر ڕۆژێ دەوڵەمەند بوی، نەچی پشت لە هەژار بکەی، دەفەرمووێ:

ئامان هەژار گیان لەخۆ دەرنەچی
کاتێ خوا یاربێ بویتە دەوڵەمەن.
ناوچاوت وەدێو نەکەی لە هەژار
ملت وەڕاجە و دڵت وەتەوەن.
ئاخر فرە یان زوتر هەژار بوون.
ئەمانە واوا با لەخۆنەکەن.

بەڵێ کاک ئەحمەدی موفتی زادە لەم شیعرەی (لەخۆ دەنەچی)دا، دەکەوێتە مۆژیار کردنی هەژار و کرۆکی پەیامی ئاسمانی و ئینسانی دەدا بە گوێیدا و دەڵێ: هەژار گیان، ئامان و دەخیل لەخۆ دەرنەچی و لەخۆبایی نەبیت. کاتێ کە خوا یاربێ بویتە کەسێکی دەوڵەمەند و خوا دەرگای ماڵ و سامان و ڕزق و ڕۆزی لێکردیتەوە. دەخیلت بم لە ئاستی نەدار و هەژاردا ناوچاوت نەدەیت بەیەکدا و، خۆت نەکەیتە دێو لێی و مل و گەردنیشت وەك ڕاجە و (داری دارە ڕای) سەقفی خانوو بەرز ڕاگریت و، دڵیشت وەك بەردی دیوارەکانی خانوو ڕەق ببێت، هیچ هەست و دڵ و ناخت بۆ هەژاری و خەمی نەبوونی و مەینەتی هەژار نەبزوێ!

چونکە زۆر دەوڵەمەندی ئێستا وەختێ بوو کە خۆشیان هەژار و نەداربوون و، سکیان برسی و گیرفانیان خاڵی بوو. بەلام ئەوا دەبینین کە ئەمڕۆ لەخۆیان گۆڕاون و ئاوا بەم شێوەیە بالەخۆیان دەکەن. بۆیە تکا دەکەم کە تۆش وانەبیت و گوێ لەم ئامۆژگاریە دڵسۆزانەم بگریت... {گۆڤاری دوانگە، ژ: ٤٧، ل١٢}

**بیل گیتس دەڵێ:** هەڵەی تۆ نی یە کە بە هەژاری لەدایك بوویت، بەلام هەڵەی خۆتە ئەگەر بە هەژاری بمریت!.



(الفَقِير لَهُ خَمْسَةُ أَحْوال عِنْدَ فَقْرِهِ)

## هەژار، لەکاتی هەژاریدا پێنج حاڵەتی هەیە:

١) حەزی بەماڵ و سامانی زۆر و شەریکە و کۆمپانیای بازرگانی یە و، خۆی بۆ موچەی بەرز و پۆست و پلە و پایە ناکوتێ و لێی ڕادەکات، لەترسی ئەوەی نەوەکو نەتوانێ بەباشی بەکاری بێنێ و حەقی هەژارانی لێ دەربکات و، لە قیامەتدا لەسەری موحاسەبە و سزا و لێپرسینەوەی توند بکرێ. ئەو کەسەی ئەم حاڵەتەی هەبێ پێی دەوترێ (زاهید و دونیا کەمگر).

٢) کەسێکە تێڕوانینی بۆ ماڵی دونیا و حەزی لە پارە و سامان، بەشێوەیەکە کە ئەگەر خوای گەورە ماڵ و سامانی زۆری پێببەخشێ، پێی شاگەشکە نابێ و هەموو شتی چاك و سیلەی ڕەحم و خزمایەتی و هاوڕێیەتی لەبیرناباتەوە. ئەگەر کەمیشی هەبوو، ئەژنۆی خەم لە ئامێز ناگرێ و خەمی لێ ناخوات و وازانێ دونیا بەسەریا ڕوخاوە، خاوەنی ئەم حاڵەتەش پێی دەوترێ (**راضِياً**) ڕازی و ڕەزامەند بەبەشی خوا.

٣) کەسێکە هەبوونی و دەوڵەمەندی پێ خۆشترە لە هەژاری و دەستکورتی، بەڵام حەز بوونی لەماڵ و سامان نەگەیشتۆتە ئاستی هەڵپە و ڕاوە پارەکردن، بەڵکو ئەگەر ئاسان دەستی کەوت و

حەلاڵ بوو، بێ کێشە بوو، وەری دەگرێ و پێی دڵخۆشە و سوپاسگوزارە.

بەلأم ئەگەر زانی لەبەدەست هێنانی ئەم ماڵ و سامانەدا زۆر ماندوو دەبێ و شەو و ڕۆژی تێکەڵ دەبێ و خەو و خۆراکی لێ حەرام دەبێ. ئەوە وازی لێ دێنێ و بەشوێنیدا ناچێ.خاوەنی ئەم هەڵوێستەش پێی دەوترێ کەسێکی قانیع و بە قەناعەت.

٤) قەت تێر ناخوا و هەمیشە عەودالّی پارە و سامانە و هەر دەڵێ نیمە و ئەگەر دانیشتوە و پەلامار نادات ئەوە بێ توانایە، ئەینا گوێ بە ماندووبوون و شەونخونی و حەلاڵ و حەرام نادات. ئەگەر دەستی پێی نەگەیشت وەکو ڕێوی کە دەمی نەگەیشتە ترێ دەڵێ ترشە و نایخۆم، ئەینا گرنگ ئەوەیە پارەی دەست بکەوێ. خاوەنی ئەم حاڵەتەش پێی دەوترێ (الحَريص) ئەو کەسەی کەسورە لەسەر کۆکردنەوەی ماڵ و پارە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: (**ما ذِئْبانِ جائِعانِ أُرْسِلا في غَنَمٍ بِأَفْسَدَ لَها مِنْ حِرْصِ المَرْءِ عَلى المالِ و الشَّرَفِ لِدينِهِ**). حَديثٌ صَحيح، رَواهُ الترمذيُّ، وَقالَ: حَديثٌ حَسَنٌ صَحيح.

واتە: دوو گورگی هاری برسی بکەونە ناو ڕانە مەڕێکەوە، چۆن لەناوی دەبەن و هەمووی کەلە پارچە دەکەن، هێشتا ئەم حاڵەتە ناگاتە لەناوبردنی دین و ئیمانی مرۆڤ بەهۆی سوربونی نارەوا ـ بێ

گوێدانە حەلاڵ و حەرام ـ لەسەر ماڵ و پۆست و پلە و ناو و ناوبانگ..

٥) کەسێکە کە ناچارە بۆ بەدەست هێنانی خۆراك و پۆشاکی ژیانی، وەکو کەسی برسی و ڕوت و بێ بەرگ. خاوەنی ئەم حاڵەتەش پێی دەوترێ (مُضْطَر) ناچار، کە ئەم حاڵەتەش زۆرجار مرۆڤ ناچاری چاو لەدەستی خەڵکی نامەرد و، موحتاجی دەستی ئەم و ئەو و پەنا بردنە بەر حەرام خۆری دەبات. خوای گەورە بمان پارێزی لەم حاڵەتە و (**اللّهُمَّ اغْنِنا بِحَلالِكَ عَنْ حَرامِكَ وَ بِطاعَتِكَ عَنْ مَعْصِيَتِكَ وَ بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِواكَ**). {موسوعَة الآداب الإسْلامِيَّة، أيمن المزين، ص٣٦٢}.



**ئەی هەژار لەخوا غافڵ مەبە و داوا لەخوا بکە تەمەن و ڕزق و ڕۆزیت بەرەکەتدار بکات:**

بەڕاستی تەمەنی مرۆڤ بەوە نی یە چەند ساڵ دەژی. بەڵکو گرنگە ئەو تەمەنە بەرەکەتداربێ، لەبەرئەوەی دەبینین ڕاستە بە ساڵ و مانگ کاتی زۆرمان بەسەر بردووە، بەڵام چەند جار هەل و کاتی زێڕینمان بەسەرچووە و تام و چێژمان لێ نەبینیوە.. چەند جار لە ڕیزی نانەوا و شوێنە گشتی یەکان وەستاوین و چاوەڕێی کاتی لەدەست گرتین و بەرەکەتی کات و تەمەنمان کەم کردەوە.

تەمەنی بەبەرەکەت: ئەوەیە کە چەندێ لەو تەمەنەی گوزاراوە و تێپەڕیوە، سود و کەڵکت لێ وەرگرتووە و تام و چێژی هەبووە.

بەرەکەتی ڕزق و ڕۆزی: ئەوەیە کە هەرچەند لە ڕواڵەتدا کەمت دەست دەکەوێ بەڵام پارەکەت جێگە دەگرێ و بە ئاسانی لە دەستت ناڕوا کە نەزانی لە چیدا صەرفت کردووە.

نمونەیەك لەسەر بەرەکەت: ڕێ کەوتووە ماڵێك (جلشۆرێك ـ غساله) یان هەبێت و وەك دەڵێین لە کۆنەکەش کڕیبێتیان و دەستی دووش بێت، کەچی بە ئەندازەی چەند ئامێری هاوشێوەی ئەوە کە لۆکە و تازەیە و کاری پێ نەکراوە و بە نرخێکی زۆر گران کڕدراوە، کاردەکات و ڕۆژێ لە ڕۆژانیش لەکاریش ناکەوێت پارەی لێ نادەیت. ئەمە جۆرێك لەبەرەکەتە..

بەرەکەت لە پارە و پوڵدا: ئەوەیە (٢٠) هەزار دینار کاری (٨٠) هەزار دینارت بۆ بکات و جێ بگرێ. بەرەکەت ئەوەیە جوتیارێکی سادە، لەزەویە بچوکەکەی و کێڵگە سادەکەی خۆیدا، بەرهەمێك بەدەست دێنێ کە خەڵکی تر لە پێنج ئەوەندە موڵك و زەویدا ناتوانن ئەوەندە بەدەست بێنن.

بەرەکەت ئەوەیە کە: کارگوزارێکی شارەوانی کە بەیانیان کوچە و شەقامەکان پاك و خاوێن دەکاتەوە و، موچەیەکی کەم وەردەگرێت و خانوویەکی سادە و ساکاری بچوکی هەیە. بەڵام سەرجەم منداڵەکانی بە پلەی باش و، لە ڕشتەی پزیشکی و ئەندازیاری و کۆلێجە بەرزەکانی زانکۆ دەخوێنن و، شەهادەی بەرز بەدەست دێنن.

لەبەرامبەریشەوە: کەسانێك هەن، سەرمایەیان بە چەندین پارەی کاش و موچەی چەند ملیۆنی و خانووی جوان و چەند نهۆمی، لەگەڕەکی ڕاقی شاردان و لەسەر سستمی نوێ ژیان بەڕێ دەکەن. کەچی تامردن ئارەزوو دەخوازێت تەنها منداڵێکی پۆلی شەشەمی ئامادەیی تەواو بکات!..

{مرۆسازی، محمد رضا رَنجبر. وەرگێڕانی لە فارسیەوە: ڕزگار حمە سەلیم، ل٥٣}.

**ئەی هەژار لەخوا غافڵ مەبە و ڕزق و ڕۆزی تەنها لە پارە و ساماندا تەماشاکە:**

پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (**مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ مُعافيً في جَسَدِهِ، آمِناً في سِرْبِهِ، عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ، فَكَأَنَّما حيزَتْ لَهُ الدُّنيا**). رَواهُ الترمذي: (٢٣٤٦) وَحَسَّنَهُ، الصَحيحَة لِلْألْباني: (٢٣١٨).

واتە: هەر کەسێك لە ئێوە، کە بەیانی لەخەو هەڵسا لاشەکەیەکی تەندروست و بێ ئازاری هەبوو، لەگەڵ نان خواردنەکەیدا حەپی پێش نان و دوای نانی نەبوو!، ئەمین و ئامان لە ماڵی خۆیدا دەژیا و ئاژاوەی ناو ماڵی نەبوو. ولآتەکەی شەڕی ناوخۆ و دەرەکی تێدا نەبوو. گوێی لە تەقە و تەقینەوە نەبوو، نان و گوزەرانی ئەو ڕۆژەشی هەبوو کەتێیدا دەژیا. ئەوە بەڕاستی با وابزانێ ئەمسەر و ئەوسەری زەوی هەمووی هی ئەوە و موڵکی ئەوە، ئەوەندە دەوڵەمەندە!..

**بەسەرهاتێك:** دکتۆر (محمد عبدالرَّحمن العریفی) دەڵێت: کەسێك دەیەوێت بەیارمەتی خێرخوازان مزگەوتێك دروست بکات. بۆ ئەم مەبەستە چوون بۆ لای یەکێك لە بازرگانەکان، بۆئەوەی لە تەواوکردنی مزگەوتەکەدا یارمەتیان بدات... بازرگانەکە دەرگای لێ کردنەوە و کەمێك لەلای دانیشتن و چەندێکی لەتوانادا بوو

یارمەتیدان.. پاش کەمێك بازرگانەکە حەپێکی لە گیرفانی دەرهێنا و خواردی، یەکێك لە ئامادەبووان پێی دەڵێت: ئەوە خێر بوو؟! ئەویش دەڵێت: ئەوە حەبی خەو بوو، ماوەی بیست ساڵە بەهۆی ئەو حەبەوە نەبێت، خەوم لێ ناکەوێت!!

ئامادەبوان دوعای خێر و شیفایان بۆ کرد و ماڵئاواییان لێکرد.. لەدوای هاتنە دەرەوەیان لەماڵی بازرگانەکە، لەلای کۆمەڵێك چاڵ و ڕێگە و باندا دەڕۆن کەکاریان تێدا دەبێت و، بەهۆی دەنگی موەلیدە و زۆرێك لە گلۆپ و ڕووناکی یەوە، ژاوەژاوێك دروست ببوو.. ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو، پاسەوانی مۆلیدەکەن. کەپیاوێکی هەژاربوو، چەند لاپەڕەیەکی ڕۆژنامەی ڕاخستبوو، زۆر بە ئارامی خەوی لێ کەوتبوو،!!

بەڵێ بەخۆشی و بەختەوەری بژی و کاتی غەم و خەفەت نی یە و، بەگوێرەی هەبوونی و نەبوونی خۆت درێژە بە ژیانت بدە و، هەوڵبدە هەمیشە بە کامەرانی بژیت و ڕێگە مەدە هیچ کات، غەم و خەفەت لە دەرگای دڵ و دەرونت بدات.

جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا، لەیەکێك لە جەنگەکاندا، خواردنیان زۆر کەم پێ دەبێت و زۆریش هیلاك و ماندوو دەبن، پێغەمبەری خوا ﷺ عەباکەی ڕادەخات و فەرمان دەکات بەوەی کە هەموویان خواردنەکەیان تێکەڵ بکەن، پیاوی وا هەبوو تەنها دەنکێك خورما یان دوو دەنك خورمای دەهێنا، کەسی

واهەبوو لەتێك نانی هەبوو دەیهێنا و تێکەڵی دەکرد، هەموویان ئەوەی پێیان بوو لەسەر عاباکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایاننا، پاشان هەموویان دەستیان کرد بەخواردن و زۆریش چێژ و خۆشیان لە خواردنەکەیان بینی، لەوانەشە تێریشیان نەخواردبێت، بەڵام لانی کەم بۆ ساتێکیش بێت برسێتیان لەبیر چۆوە. {بەختەوەر بژی، ل٢٤٥}.



لەخوا غافڵ مەبە و ئاگاداری خۆت بە، بە هەژارکەوتنی کەس دڵخۆش مەبە و گاڵتە بە هەژار مەکە..

دەگێڕنەوە کە: (محمدی کوڕی سیرین) لە کۆتایی تەمەنیدا تووشی هەژاری بوو، فەرمووی: بەخوا کە دوای دەوڵەمەندی هەژارکەوتووم و ئێستا قەرزارم، لە کاتێکدا ساڵانێك لەمەوبەر خەڵکی قەرزارم بوون. وادەزانم کە ئەمە بەهۆی گوناهێکی چل ساڵ خۆم ئەمەم هاتەوە ڕێ و خۆم موفلیس بووم!!

ئەم قسەی (محمدی کوڕی سیرین)یان بۆ (ئەبو سلێمان دارانی) گێڕایەوە، فەرمووی: ئەوان گوناهیان کەم بووە، زانیویانە لەکوێوە بەلا و موصیبەت یان بۆ دێت، من و تۆ ئەوەندە گوناهمان زۆرە نازانین لە کوێوە تووش دەبین. {بەرەو بەهەشت، ئەندازیار عُثمان، ل٢٦}.

## فەڕاشێکی سەرمایەدار: (بەسەرهات)

بەهۆی نەداری و دوورە دەستی لادێکەمان لە خوێندن، هەرزوو لە خوێندن وازم هێنا و بوومە شوانی گوندەکەمان، ڕۆژگارەکان گوزەریان کرد و منیش تەمەنم هاتە سەر، لە گوندەکەی خۆمان کۆچم کرد بۆ ناو شار، هۆکاری بژێوی من دەبێت چی بێت؟! چەند ڕۆژێك بە کرێکاری، لەگەڵ ئەم وەستا و ئەو وەستای دیوار تا ئێوارە بەو سوری هەتاوە، گەرمە چیمەنتۆم ڕادەکێشا.

ئەو بەرگەی لەبەرمابوو، کە سەرنجت دەدا، وا مەزەندەت ئەکرد ماستاو یان دۆی پێدا ڕژاوە. وەها لە ئارەقەی لاشەم چەندین نەخشەی سەیری لەسەر دروست بوو بوو!

ڕۆژێك یەکێك لە ئەندازیاری کارەکە وتی: کاکە تۆ زۆر خۆت ماندوو ئەکەی، ئاوا بڕوات بەرگەی چەند ساڵێکی تر ناگریت و لاشەت ئێکسپایەر دەبێت.

وتم: بەدەست خۆم نی یە وەها کارنەکەم پارەکەم بە حەڵاڵ نازانم و، حەزناکەم پارەی بەلاش بۆ خانەوادەکەم ببمەوە.

وتی: ئەگەر من کارێکت بۆ بدۆزمەوە لەم کارەت باشتر و ئیسراحەت تر و، موچەیەکی بەردەوام و لە سای سێبەر کاربکەیت، ئەیکەیت؟!

تۆزێك وەستام، پاشان وتم: هەر بۆنی حەرامی لێ نەیەت، بەو پەڕی خۆشحاڵیەوە ئامادەم..

وتی: زۆرباشە بەیانی نا.. دووبەیانی وەڵامت دەدەمەوە.

نەمزانی ئەو سەعات و ژەمە خۆراکانە وەها درەنگ دەڕۆن. دوای دوو ڕۆژەکە کاکی ئەندازیار هاتەوە، بەڕوخساریا دیار بوو شێرە، شێر.

لەدوورەوە بانگی کردم، وتی: بەیانی کارمەکە و هەرچی تەسکەرە و جنسیە و پێداویستی خۆت هەیە، لەگەڵ چەند وێنەیەك بیهێنە و وەرە بۆ فەرمانگەکەی خۆمان، موژدەیەکی زۆر خۆش بوو. خەریکبوو لە خۆشیاندا شاگەشکەبم. ئەو ڕۆژە هەرچیم کرد وامزانی یەك چرکە بوو!

بۆ بەیانی هەرچی هەمبوو لە دۆسیەی خۆم بردم و لە دەرگای دەرەوە لەدوا هەنگاومدا دایکم وتی: ڕۆڵەگیان بگەڕێوە کیسە باخەڵ و پارەت لەبیرچووە. گەڕامەوە و دەستەکانم ماچ کرد و شتەکانم لەدەستی وەرگرت..

ئای کوڕێکی هەژاری شەکەتی ڕۆژگار، ئامێکی خۆشی هەڵدەکێشێ، کەم نی یە! خواماڵی ئاوەدان بکات لە کرێکاری ڕزگارم بوو. بومە کارگوزاری فەرمانگەکە. خۆ ئەگەر کۆلکە بڕوانامەیەکم دەبوو پلەکەم بەرزتر دەبوو!

چەند ساڵێك گوزەری کرد و، بوومە خاوەنی ماڵ و منداڵ و، باوانم کۆچی دواییان کرد و چونە جێگەی خۆیان. ئەوان ڕۆیشتن و

دوعا خێرەکانیان بۆ من هاتە پایان. ئەوە منم وەفادارانە ئێستا نزای خێر و خۆشبەختی فێردەوسیان لەخوا بۆ داوا دەکەم.

من نەمزانی ڕۆژگار چ نهێنیەکی لە ئامێزدایە، منداڵی یەکەممان خۆشی بە خانەوادەکەمان دەدا. وردە وردە باری گوزەران قورس دەبوو. هەستم دەکرد پێویستە لە خۆشی خۆمان بگرمەوە و بیدەمە ڕۆڵەکانم. بۆیە بڕیارمدا دوای دەوام وردە وردە کارێکی تریش بکەم. خودا ڕووی سپی بکات، هاوسەرەکەشم هاوکارێکی باشم بوو.

شەوێکیان خەونێکی زۆر ناخۆشم بینی، بەیانیەکەی تا ئێوارە دەتوت بەسەر دونیاوە نیم.

ڕۆژەکان تێپەڕین و ئەو خەونە ناخۆشە هاتە سەر ئەرزی واقیع! لەگەڵ بەڕێوبەر بووە هەرامان و بڕیاری فەصلّ کردنم دەرچوو. ئاخ (خودایە خۆت ڕەزاقیت) سەری دونیام لێ هاتەوە یەك. من خەمی چیم بوو، چیم بۆ پەیدا بوو. هەموو خەیاڵە جوانەکانم بونە سەراب، هەمووی هاتە نیهایەت.

چەند شەوێك بەبێ خەو، چەند ڕۆژێك بەبێ کار، وەهام لێهاتبوو لەگەڵ سێبەری خۆمدا شەڕم دەکرد، پەست، بێتاقەت، بێ مەزاج، هەرچی بەرنامەم هەبوو، هەرەسیان هێنا. کاسەی تەمەنم هاتبووە نیوە. بەفری زستان سەر و سیمامی کردبوە ڕوخساری مەجنونی لەیلا.

غەریب مابووم، بەلاّم هاوسەرەکەم وتی: ژیان هێندە ناهێنیّ، دوو ڕۆژی تر جەلّدەش لێت دەدات و کۆتایی بەتەمەنت دێت. بڕۆ بۆ بازاڕ و تەوەکولت بەخودا هەبێت، سەری بێڕۆزی لە ژێر خاکدایە. خودا دەرگایەك دادەخات و هەزار دەرگا دەکاتەوە. ئەمنا ئەم، ئێمە لەپلە سفرەوە پێگەیشتووین. تا ئێستاش بەشی دوو ساڵ پارەی پاشەکەوتمان هەیە! کەوای وت، خۆشی کەوتە ناو دەرونم بۆم دەرکەوت، خێزانی بە سەلیقە و خەمخۆرم مانگانە شتێکی لە موچەکەم پاشەکەوت کردووە!.

بەڵێ بۆ بەیانی بڕێك لەو پارەیەم برد و لەناو بازاڕ شتی وردەم کڕی و فرۆشتمەوە. ڕەنگە بڕوا بکەن و بڕواش نەکەن، دوای ساڵێك بە پشت بەستن بەزاتی ئیلاهی و ماندوو بونی هەموان، بوینە خاوەنی دوکانێکی جوان و خاوەن موشتەری باش! خەڵکی زۆر حەزیان دەکرد بێنە لام و کەرەسە بکڕن و بفرۆشن..

بەم شێوەیە چەند ساڵێك گوزەری کرد، لە کەسێکی دوکاندارەوە بومە بازرگانێك، وێنەی ژیانی ڕابردووم هەر مابوو، ناو بەناو لەخۆبایی نەبوون سەیرم دەکردن و، یادەوەریە ترش و شیرینەکانی ژیانم وەکو شریتیّ بەبەرچاوما دەهاتن و دەچوون.

ئەحمەدی هەردی شاعیر دەڵێت:

بەسەرسامی لەسەر لوتکەی بڵندی ژینا وەستاوم.

شریتی عومری ڕابردووم، وەکو خەو دێتە بەرچاوم...

لە ژێر سێ وێنەکەدا کە لە چوار چێوەم گرتبوون، نوسیبوم: (لێرەوە دەستم پێکرد).

کۆمپانیایەکی گەورەم کرد بە ناوی هاوسەرە خۆشەویستەکەمەوە، کە لە تەنگانەدا پایەیەکی پتەو بوو بۆمن، چەند سەیارەیەکی گەورە و لق و بەشی بازرگانیم دامەزراند، هەموو کاتێك وتەی هاوسەرەکەم بیر ئەکەوتەوە کە دەیگوت: (خودا دەرگایەك دادەخات و هەزار دەرگا دەکاتەوە).

ڕۆژێك بوو سەری دنیام لێ هاتبووەیەك، نەمدەزانی چی بکەم، وامئەزانی کە لە فەرمانگە و وەزیفە دەرکرام، ئیتر نان بڕاو ئەبم. نەخێر! ئەی ئەو کەسانەی هیوا و ئاواتیان بەخودا هەیە، نائومێد مەبن، نائومێدی لە ڕەحمی خوا، لە ڕەحمەتی خوا، بە مەرجێك وەك پێویست بیناسیت و قەناعەتت هەبێت..

بەڵێ دوای پانزە ساڵ لە کارکردن، ڕۆژێك یەکێك لە کوڕەکانی دەرەوەی ئۆفیسەکەم هاتە ژوور و وتی: کاك (...) پیاوێك هاتووە دەڵێ: خاوەن ئەم کۆمپانیا و شاحینە زل زلانە کێ یە؟! پێی بڵێم بێتە ژوورەوە؟!

وتم: بەدڵنیاییەوە، بابفەرمووێت.

پیاوێکی بەتەمەنی بە هەیبەت سڵاوی کرد و بەڕێزەوە پێشوازیم لێکرد، لە بروسکە خێراتر ناسیمەوە. ئەو ساتانە هاتەوە یادم کە دەرگای فەرمانگەی، بەسەر فەڕاشێکی کارگوزاری بێکەسی بێ

نەوادا داخست و دەری کردم. بەڵام وەها خۆم نیشان نەدا، دەمێك ساڵ بوو لەبەرخوا گەردنیم ئازاد کردبوو، چام بۆ بانگ کرد و فەرمووم لیَ کرد بۆ شوێنەکەی خۆم. بەڵام ڕازی نەبوو.

داوای چەند خزمەت گوزاریەکی لە کۆمپانیاکە کرد..

وتم: بەسەرچاو، بەنرخێکی زۆر هەرزان پێك هاتین.

وتی: بەڕێزەکەم من تۆ ناناسم، بەڵام ڕێزێکی زۆر زۆرت لیَ گرتم، شەرمەزارت کردم بەڕاستی بۆیە وا ناو و ناوبانگت دەرکردوە. ئەمە یەك خاوەن کۆمپانیای وەهام دیتبێت لە خزمەت میوان و موشتەریدا بێت!.

وتم: نا بەڕێزەکەم، تۆ من ناناسیت، ئەم هەموو سەروەت و سامانەم لەخوداوە پیَ بەخشراوە، بەشی تۆشی تێدایە. قەیناکە تۆ هەر من مەناسە، بەڵام من تۆ زۆر باش دەناسمەوە، پێش چەند ساڵ لەمەوبەر من فەڕاش بووم لەلای بەڕێزت، کەم تا زۆر کارم بۆ ئەکردی، بەڵام تۆ بۆئەوەی کەسێکی خزمی خۆت دابمەزرێنی، منت لە کارەکەم فەصلَ کرد، زۆر بەداخ بووم، کۆشیَ ماڵ و منداڵی سەرو پێچکە بەلا نەوازی ماینەوە.

بەڵام خودا ئێمەی لەیاد نەکرد، (لەتۆ حەرەکەت لە من بەرەکەت). پشتمان بەخودا بەست و ستەممان لێکرا، بەڵام خودا ڕزاقە، ڕزق و ڕۆزی هەر بەدەست خۆیەتی بەتەنها. ئێستا وا تۆ

ئیشت بەمنە، منیش لەبەر خاتری خودای بەخشندە لەخزمەتتدام!!

چەند دڵۆپە ئارەقێك ناوچەوانی گرت.. بەشەرمەزاری یەوە داوای لێبوردنی کرد. وتم: زۆر ئاسایی یە و سوپاس بۆ زاتێ کە خەڵقی کردووین و، بەبێ ڕۆزیش دەستمان لێ بەرنادات..

بەڵێ، پاڵەوانی چیرۆکەکەمان لە کۆتایی دا دەڵێت: ئەمە سەربوردی منی هیچ لە بارەدا نەبوو، بەڵام زۆر هیوا و ئومێدم بەخوای خۆم هەبوو، هاوسەری بەختەوەر، قەناعەتی جوان، بوینە مایەی خێر بۆ خۆمان و کۆمەڵگاکەمان، هەرگیز لە خۆمان نەگۆڕاین.

بەڵێ، بە سادەیی هاتوین و بەسادەیی دەگەڕێینەوە، دونیا وەك سێبەری بەربەیان وەهایە، تا بەدوایدا ڕابکەیت پێی ناگەیت، کە پشتت تێکرد و ڕۆشتی، بەدواتا دێت.

هیچ کەس لە ئێمە ڕزقەکەی خۆی بەکۆڵیەوە نیە. ڕۆژانە وەری دەگریت، بەڵام نەبەز و سەربەرز بژی و سەری بەرزت بۆ دەستی کەس نەوی مەکە تا ماچی بکەیت و، ئەویش بەچاوێکی سوك مشتێ دراوی ڕێیبواریت پێبدات. کە نازانی چۆن صەرفی دەکەیت و نازانێ بۆ کوێ دەچێت.

هەرکات هەژار بووی نائومێد مەبە و، هەرکات دەوڵەمەند بووی بوغڕا مەبە. چونکە ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ آل عمران :١٤٠

{ئەسرینەکانی سەدەی ٢١/٢٠، ئاوات أبو بکر ل١٢٧}.



## وانەی سیەم

## بابەت: گرنگی هاوڕێ لە ژیاندا

۞ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ ﴿٩١﴾ وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبْكِبُوا۟ فِيهَا هُمْ وَٱلْغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ﴿٩٥﴾ قَالُوا۟ وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٩٩﴾ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾﴾ الشُّعَراء: ٩١ – ١٠١.

۞ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (مَثَلُ الجَليسِ الصّالِحِ وَ الجَلِسُ السُّوءِ، كَمَثَلِ صاحِبِ المِسْكِ وكِيرِ الحَدَّادِ، يُحْرِقُ بَيْتَكَ أَوْ ثَوْبَكَ أَوْتَجِدُ مِنْهُ رِيحاً خَبيثَةً) رَواهُ البُخاري: (٢١٠١).**

## سەرچاوەکان:

١) تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین، پێداچوونەوەی: د. سید أحمد پێنجوێنی، ل٤٣٥، ل٥٣٧.

٢) هاوڕێیەتی، عەمرو خالید، و: بەناز جمال، ل١٢ — ٢٠، ل٤٤.

٣) گۆڤاری (بڕیار) ژمارە: ٤٧، ل٣٢. وە: ژ: ٦٢، ل٤١.

٤) پایزە برا، مەلا ئەحمەدی شەریعە، ب١، ل٧٥.

٥) ساعَة وَساعة، محمود المصري، ص٣٨٩، ص٣٦٥، ص٣٦٠.

٦) هەفتەنامەی (بەیان)، ژ: ٣٠، ل٩.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين. وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ أجْمَعينَ:

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە بەلوتف و کەرەمی خۆی، بە هیدایەتی خۆی هیدایەتی داین و، هاوکاری کردین بۆئەوەی کە لە زنجیرە باسی (لەخوا غافڵ مەبە)دا، گەیشتینە کۆتایی زنجیرە باسەکەمان، بەتەواوبوونی مانگی پڕ بەخشش و بەرەکەتی ڕەمەزان، هەزاران هەزار سوپاس بۆ تۆ ئەی خوای پەروەردگار، درود و صلاوەت بۆسەر گیانی پاکی پێغەمبەری سەروەرمان محمد المصطفی ﷺ، بابە دڵ، بابە کۆمەڵ، صلاوەت بنێرین بۆ سەرچاوەی هەموو خێر و خۆشیەك :

**اللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمْ.**
**اللّهُمَّ صَلِّ عَلى شَفيعِنا محمد وَ عَلى آلِهِ و صَحْبِهِ وَسَلِّمْ**
**اللّهُمَّ صَلِّ عَلى حَبيبِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمْ.**

ئێمە لە زنجیرە باسەکەماندا بەناونیشانی لەخوا غافڵ مەبە، پێویستە لەکۆتایی دا ئەوە بڵێین کە: هۆکاری زۆر سەرەکی و بنەڕەتی بۆئەوەی مرۆڤ لەخوا غافڵ بێ، یان لەخوا غافڵ نەبێ و هەمیشە خوای پەروەردگاری لەیاد بێ، بریتیە لە دوو شت:

**یەکەم: یاد و زیکری خوای گەورە:**

هەر کەس زۆر یاد و زیکری خوا بکات، بەڕاستی لە ڕیزی لەخوا غافلان نابێ. بەلاّم هەر کەس یادی خوای نەکرد و هیچ کات زیکر و یادی خوای نەکرد و، کارەکانی لەسەرەتا و کۆتاوە بەیادی خوا و ناوی خوا و بسم الله دەست پێ نەکرد.. لەلێ بوونەوەدا بە سوپاس و حەمد و سەنای خوا کۆتایی پێ نەهێنا. ئەوە بەڕاستی لەخوا غافلّ دەبێ و تووشی هەلّە و تاوانی گەورە دەبێت. ئەمەش خوای گەورە خۆی باسی کردووە و دەفەرمووێ:

﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ۝٢٠٥﴾ الأعراف. واتە: هەمیشە لەدلّ و دەرونی خۆتا بەخۆشەویستی و سۆزەوە بەنهێنی یادی پەروەردگارت بکە لەبەرە بەیانەکان و دەمە و ئێواراندا، هەولّبدە لەو کاتانەدا بەتایبەت و لە هەموو کاتێکدا لە غافلّ و بێ ئاگایان مەبە، ئەوانەی دلّیان غافلّە و دنیا مەست و حەیرانی کردوون!..

**دووەم: هاوڕێ و برادەر:**

بەڕاستی هاوڕێ و برادەر کاریگەری زۆری هەیە لەسەر مرۆڤ و، ئەگەر تۆ هاودەمی کەسی لەخوا ترس و چاك و پاك بی. بێگومان کاریگەری دەبێت لەسەرت و ڕەنگدانەوەی بەسەرتەوە دەبێت. خۆ

ئەگەر هاوڕێیەتی کەسانێك بکەی کە لەخوا غافڵن و، بەردەوام لەو شوێنانەن کە دژایەتی خوای لێ دەکرێ و هەرگیز باسی خوا ناکرێ، بێگومان تۆش کاریگەری ئەوانت لەسەر دەبێ و، هەمان رێگە و ڕەفتاری ئەوان دەنوێنی.

بەڵێ بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین: ئەوەی مرۆڤ بەگشتی و چینی گەنج و لاو فریو دەدات، یاخود بەرەو هیدایەتی دەبات، بریتیە لە: (هاوڕێ) بۆیە لەخۆت بپرسە:

ئایا هاوڕێکانت باشن یان هاوڕێی خراپ؟

هاوڕێکانت کەسانێکن بەرەو گوێڕایەڵی خوای گەورەت دەبەن؟ یان دورت دەخەنەوە لێی؟!

ئایا هاوڕێکانت پارێزەری ئەو پەروەردەیەن کە پێی پەروەردەبووی لەماڵەوە، یاخود نا؟

زۆرن ئەو کەسانەی کە پەروەردەیەکی باش کراون و بنەماڵە و خزم و دەوروبەرێکی چاکیان هەیە، بەڵام نازانرێ ئەو گەنجە چی دەکات و چی ناکات. لە کاتێکدا کە لەماڵێکی باشدا پەروەردە بووە. بەجۆرێك کەس و کارەکەی و دەوروبەری سەرسام دەبن، کەکاتێك دەزانن هەندێ ڕەفتاری ناباشی هەیە، یاخود ڕووداوێکی کتوپڕ ئەبێت بەلایانەوە، کاتێك کوڕەکەیان لەلایەن دەزگایەکی پۆلیسەوە دەدرێتەوە دەستیان و ئەمان بێئاگان..

لەبەرئەوەی ئاگادارنەبوون کە هاوڕێکانی کێن؟!

جەختیان لەسەر ئەم خاڵە نەکردۆتەوە، زۆرترین شت کە دەبێتە هۆی لادانی مرۆڤ هاوڕێیە. زۆرترین هیدایەت و ڕێنمونیش هاوڕێیە.. لەڕاستیدا ئەم وتانە نە وتەی ئێمەن و نەهی ڕۆژگار، بەڵکو وتەی قورئان و وتەی فەرموودەکانە بەدرێژایی ژیان. هەروەکو لە ژیانی موسا پێغەمبەردا(علیەالسلام) ئەمە ڕەنگی داوەتەوە. گەورەمان موسا پێغەمبەر و خاوەنی پەیامێك لە نێردراوەکانی بەڕێز (أولی العزم) دەبینین، کە بەتەنها نەیتوانیوە لەسەر ویرد و پەرستشەکان بەردەوام بێت. بەڵکو: پێویستی بە هاوڕێیەتی چەند کەسانێکی باش هەبووە.

هەروەکو خوای گەورە دوعا و نزای موسامان بۆ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: پەروەردگارا دڵ و سینەم و دەرونم ئاسودە و گوشاد بکە، ئیش و کار و کۆششم بۆ ئاسان بکە، گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە.. ﴿وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴿٣١﴾ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴿٣٢﴾ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا ﴿٣٥﴾﴾ طه: ٢٩ـ٣١.

واتە: لەکەس و کاریشم هاوکار و یارمەتیدەرێکم بۆ بڕیاربدە، هارونی برام بێت، خوایە پشتمی پێ بەهێزبکە. بیکە بە هاوبەش و یاریدەدەرم لە گەیاندنی پەیامەکەتدا، تا تەسبیحات و ستایشی تۆ

زۆر بکەین، زۆر یادی تۆ بکەین و ناوی تۆ بەرین، چونکە تۆ هەمیشە بینای بەحاڵی ئێمە، بە هەڵسوکەوتی ئێمە، بە هەموو شتێکی ئێمە..

هەر لە قورئاندا خوای پەروەردگار، هەردوو جۆری هاوەڵی باش و خراپمان بۆ دیاری دەکات و فەرمانمان پێ دەکات، کە لە ڕیزی هاوەڵە چاك و خواناسەکاندا بین و، لە هاوەڵە لەخوا غافڵەکان و بەدکردارەکان بەدور بین. دەفەرمووێ: ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾﴾ الكهف: ٢٨.

واتە: هەوڵبدە کە بەخۆگری و ئارامییەوە ژیان لەگەڵ ئەوانەدا ببەیتە سەر، کە هانا و هاوار بۆ پەروەردگاریان دەبەن و، هەر لەو دەپاڕێنەوە (بۆ دەستەبەرکردنی داخوازیەکانی هەردوو جیهان)، لەبەیانیان و ئێواراندا و زۆر مەبەستیانە ئەو زاتە لێیان ڕازی بێت و لێیان نەڕەنجێت.

هەرگیز نەکەیت چاویان لێ لاخەیت و ڕوویان نەدەیتێ، مەگەر تۆ ڕازاوەیی دونیات مەبەستە؟! نەکەیت فەرمانبەرداری ئەو کەسانەبیت ـ کە بەهۆی گوناه و تاوانیانەوە ـ دڵمانیان غافڵ و بێ ئاگاکردوە و ـ بەرژەوەندی خۆیان نازانن ـ، ئیتر کارو کردەوەی

ئەو جۆرە کەسانە بەردەوام شپرزە و بێ سەروبەری پێوە دیارە...
{تەفسیری ڕۆشن، ل٤٣٥}.

## ئاگاداربە و بزانە: هاوڕێکەت هەڵبژاردەی خۆتە!

هاوڕێ شتێك نی یە زەمانە بیهێنێتە ڕێگات، بەڵکو تۆی کە هاوڕێ بۆ خۆت هەڵدەبژێری. جابزانە هاوڕێکەت کەسێکە ئەگونجێ لەگەڵ پەروەردەکەت، ژینگەکەت، ڕەوشتت، دینت، بۆچونت..

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (**المَرءُ عَلى دينِ خَليلِه، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخالِلْ**). رَواهُ أحمد و الترمذي. واتە: مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، بۆیە پێویستە هەریەك لە ئێوە بزانێ هاوڕێکەی کێ یە و کێ هەڵدەبژێرێ.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**المَرْءُ مَنْ أَحَبَّ**) رَواهُ البُخاري وَ مُسْلِم. واتە: هەر کەس یەکێکی خۆشبوێ، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا، لەگەڵ ئەو کەسە حەشر دەکرێ.

ئایا حەز دەکەیت کێ بێت ئەو کەسەی لە ڕۆژی دوایدا لەگەڵتا بێت؟ خۆت سەرپشك بکە بۆ هەڵبژاردنی ئەو کەسە. من پێم خۆشە پێغەمبەری خوا بێت ﷺ پێم خۆشە هاوەڵان بن، پێم خۆشە لەگەڵ خەڵکانێکی پاك و بەڕێز و دینداردا بم.. بەیارمەتی خوا لەگەڵ ئەوانەدا دەبین.. هەموو کەس لەگەڵ ئەوە دەبێت کە خۆشی دەوێت و لەگەڵی حەشر دەکرێت..

## دوو نمونە لەسەر هاوڕێی باش و هاوڕێی خراپ:

پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێ: (**مَثَلُ الجَلِيسِ الصّالِحِ وَ جَلِيسُ السُّوءِ، كَحامِلِ المِسْكِ وَ نافِخِ الكِيرِ**). واتە: نمونەی ئەو کەسەی کە لەگەڵ هاوەڵی باش دادەنیشێ، وەك هەڵگری بۆنی خۆشی میسك وایە. کە هەمیشە بۆنی خۆش بڵاودەکاتەوە. بەڵام نمونەی ئەو کەسەی کە لەگەڵ هاوەڵی خراپ دادەنیشێ، وەك ئەو کەسە وایە کە فوو ئەکات بە دەمەوانەی ئاسنی گەرمدا و هەمیشە بۆنی دوکەڵی لێ دێت.

جێگای سەرنجە مێژووی ئیسلامی، نمونەی جۆرە کەسانێکمان بۆ دەهێنێتەوە، کە پەیوەندی و هاوڕێیەتیان لەگەڵ کەسانێکی تێکدەر و دور لەدیندا هەبووە. ئەمە چیرۆکێکی گونجاوە بۆ باسەکەی ئێمە، ئەویش باسێکە لەسەر ئەبو جەهل..

ئەبو جەهل کەسێك بووە لە ترۆپکی بێ باوەڕیدا بووە. بێباوەڕیەکی توند کە هیچ هیوایەکی تێدا نەدەبینرا.

هاوڕێیەکی هەبوو زۆری خۆش دەویست بەناوی (عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت). هاوڕێیەتیەکی زۆر گەرم و گوڕ لە نێوانیاندا هەبوو.. بەڵام دەروون و کەسایەتی عوقبە لە ئەبو جەهل باشتربوو، هیوایەکی تێدا دەبینرا. دەیویست ببێتە موسڵمان، بەڵام دوو دڵی و گومانی هەبوو بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ و، لەگەڵ ئەوەشدا کە

گوێی لەوتە و فەرموودەکانی دەگرت، دەروونی دەهەژاند و کاریگەری لەسەری جێ ئەهێشت..

ئەبو جەهل بۆ ماوەیەك گەشتی کرد و شاری بەجێهێشت، بۆیە ئەو کاریگەریە زۆرەی لەلایەن ئەبو جەهلەوە لەسەر عوقبە بوو، لە ڕێگری کردن لە موسڵمان بوونی کەم بۆوە.

دواتر عوقبە چووە لای پێغەمبەر و ﷺ ، ئەویش ئیسلامی بۆ خستەڕوو. عوقبە حەزی بە موسڵمان بوون دەکرد و بەجوانی گوێی گرت و پاشان وتی: ئەی محمد، ئەمەی تۆ دەیڵێی ڕاستە، بەڵام بائەمشەو بیرێکی لێ بکەمەوە بۆ بڕیاردانم بۆ موسڵمانبوون. چاوەڕێم بکە بەیانی دەگەڕێمەوە لات..

بەڵام بەداخەوە لەهەمان کاتدا ئەبوجەهل لە گەشتەکەی گەڕایەوە و عوقبە پێی وت: ئەمەوێ سبەینێ بچمە خزمەت محمد و ئیسلام بونی خۆم ڕابگەیەنم!!

ئەبو جەهل چاوی چووە پشتی سەری و هاواریکرد: ئەی عوقبە سوێند بەو هاوڕێیەتیەی لەنێوانماندا هەیە، هەر کە ئەمڕۆ گەڕایتەوە لای محمد ئەبێ تفێکی لێ بکەیت. ئەینا دۆستایەتی من و تۆ کۆتایی هات!..

بەڵێ عوقبە دوای ئەوەی کە خەریك بوو ئیمان بێنێ و بڵێ: (اشهد ألّا إلهَ إلا الله) و دەستی پێغەمبەر ﷺ ماچ بکات.

هاوڕێکەی پاڵی پێوەنا، کە پێچەوانەی ئەمە هەڵبژێرێ و پێی وت: ئاینەکەت یان هاوڕێکەت؟ خزم و کەسوکارت یان هاوڕێکەت؟

بەلاَم بەداخەوە هەلبژاردنەکەی عوقبە سەرکەوتوو نەبوو، وەك هەڵبژاردنی زۆربەی ئەو کەسانە وابوو کە دونیا هەڵدەبژێرن و ئەکەون و تیا ئەچن.

(عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط) ئەبو جەهلی هەڵبژارد بەسەر پێغەمبەردا ﷺ ! هاوڕێ خراپەکەی هەڵبژارد!

عوقبە پێغەمبەری بەجێهێشت و بەرەو لای ئەبو جەهل ڕۆیشت. پاشان بوو بە یەکێك لەو کەسانەی کە ئازاری پێغەمبەری خوای دەدا. هیچ کەس ئەوەندەی عوقبە چاو نەترس نەبووە بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ، عوقبە کە خەریکبوو دڵی نەرم دەبوو بۆ ئیسلام و بەرەو ئەو ئاینە دەچوو، کاتێ پێغەمبەری ئەبینی وا نوێژ ئەکات لە کەعبەی پیرۆزدا. عەباکەی سەر شانی پێغەمبەر ﷺ کردەوە و بەتوندی ئالاَندی لەملی، ویستی بیخنکێنێ، تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ تاساو کەوتە سەر ئەژنۆکانی!!.

لەڕۆژێکی تردا، پێغەمبەر ﷺ لە کەعبەدا خەریکی سوجدە بردن بوو بۆ خوای تاك و تەنها، ئالەو کاتەدا عوقبە ڕیخۆڵەی حوشترێکی مردارەوەبووی هێنا و، فڕێی دایە سەر پشتی پڕ بەرەکەتی پێغەمبەر ﷺ!!

پێغەمبەر ﷺ توانای نەبوو هەڵسێتەوە، تاکو زەینەبی کچی هات و، ئەو پیسی یەی لەسەر پشتی پێغەمبەر ﷺ، هەڵگرت و فڕێی دا... ئەمەیە عوقبەی کوڕی موعیط..

لەکۆتاییدا لە غەزای بەدردا بەبێباوەڕی کوژرا... لەدوای مردنی بە جۆرێك ئاوسا کە نەیانتوانی هەڵیبگرن و فڕێی بدەنە ناو گۆڕی بێباوەڕەکانەوە. بەهۆی بۆنە ناخۆشەکەیەوە!! بەڵکو لەهەمان شوێن کە لێی کوژرابوو، خۆڵیان کرد بەسەریاو، مردنێکی ناشیرین و قێزەون بوو!!.

هەندێ لە زانایان دەڵێن خوای گەورە لە سوڕەتی ـ الفرقان ـ دا، باسی حاڵی عوقبە و هاوشێوەکانی دەکات کە شوێن برادەری خراپ کەوتن. دەفەرمووێ: ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِي ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلاً ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلاً ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِي ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولاً ﴿٢٩﴾﴾ الفرقان: ٢٧ – ٢٩.

واتە: ئەو ڕۆژە ستەمکار بەهەموهێزی، قەپ دەگرێت لە هەردوو دەستی خۆی (لەسەر یەك دایناون و دەیانکرۆژێت، بەمەرجێ لە دنیادا کەسێ پەشیمان بێت لە هەڵوێست و کارێکی تەنها پەنجەیەکی خۆی دەگەزێت!!) بەدەم شین و گریە و زاری یەوە دەڵێت: خۆزگە شوێن بەرنامەی پێغەمبەر ﷺ بکەوتمایە،

خۆزگە ڕێبازەکەی ئەوم پەیڕەو بکردایە.. هاوار بۆمن، خۆزگە فلان و فیسارم نەکردایە بە هاوەڵ و هاوڕێ و مامۆستای خۆم و (بەدرۆ و دەلەسەی نەخەڵەتامایە و بە هاندانی ئەو ڕێبازی شیرکم پەیڕەو نەکردایە.. ئەو بەقسەی زل منی لەیادی خوا و پەیڕەوکردن لەبەرنامەکەی وێڵ کرد، دوای ئەوەی کە ڕوونی پێم ڕاگەیەندرابوو، شەیتانیش لەولاوە هیچی بۆ ناکرێت و پشتی بەرداوە و ئەو تاوانبار دەکات و خۆی لێ بەری دەکات و هەر کابرای بێ دین خەتابار دەکات!!.. {تەفسیری ڕۆشن، ل٥٢٧}.

## وەرن با پێکەوە دژە نمونەی بەسەرهاتەکەی پێشوو ببینین:

عیاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە، ئیمانی هێنا و موسڵمان بوو، بەڵام هێشتا باوەڕی لاوازبوو، کاتێ کۆچ کردن بۆ مەدینە هاتە پێشەوە و بە هاوڕێیەتی و دۆستایەتی لەگەڵ عومەری کوڕی خەتاب، کۆچەکەیان دەستی پێکرد و کەوتنە ڕێ..

دایکی کەسێکی نارد بۆ لای تاپێی بڵێ: دایکت ئەمرێت، پاشان دایکت سوێندی خواردووە کە (نەچێتە بەر سێبەر و هەر لەبەر خۆر بمێنێتەوە، وە هەرگیز ئاو بەخۆیدا نەکات و خۆی نەشوات). تا دەگەڕێتەوە بۆلای. بۆیە عیاش کە دایکی زۆر خۆشدەویست بەم قسەیە دەستی بەلەرزین کرد و، ویستی کە بگەڕێتەوە بۆلای

دایکی. بەلاَم عومەری کوڕی خەتاب نەیهێشت. تەماشاکەن چەندە گرنگە کە هاوڕێیەکت هەبێت هەوڵی جێگیری و دامەزراویت بدات. پاشان عومەری کوڕی خەتاب وتی: ئەی عیاش، ئەگەر دایکت ئەمڕۆ لەبەر گەرمادا بوەستێ، ئەوا سبەینێ ناچار دەبێت بڕواتە بەر سێبەر، ئەگەر ئەمڕۆ خۆی نەشوات، ئەوا دوای ماوەیەك لەبەر چڵکنی ئەسپێ لێی ئەدات و ناچار دەبێ خۆی بشوات..

مەبەستی ئیمامی عومەر ئەوەبوو: لەبەرچی ئەوەندە شڵەژاویت بۆی؟! دوای دوو ڕۆژی تر دایکت بێزار دەبێ و، لەتاو عەرەقە و چڵکنی لاشەی بەناچاری خۆی دەشوات. خۆئەگەر کەسێك بەرگەی خۆر بگرێت، ئەوا سبەینێ هیلاك دەبێت و واز دەهێنێت و دەچێتەوە بەر سێبەر.

ئیمامی عومەر عیاشی جێگیر دەکرد. بەلاَم عیاش دەیوت: هەر ئەبێ بگەڕێمەوە. بۆیە ئیمامی عومەر پێی وت: ئەی عیاش ئەگەر بگەڕێیتەوە دەبیتە مایەی فیتنە بۆ دینەکەت!

جا موسڵمانی بەڕێز، گەنجی ئازیز، تێڕابمێنە و نرخی ئەو جۆرە هاوڕێیانەت بزانە کە پێت دەڵێن: ئەو کارە مەکە، براکەم ئەوە حەرامە و دەکەویتە هەڵەوە. بگەڕێ بەدوای ئەم جۆرە هاوڕێیەدا. کە بەداخەوە لە نمونەی ئەم جۆرە هاوڕێیانە وەکو گەوهەر و ئاڵتون کەم و دەگمەنن.

دەچینەوە سەر باسەکەمان، عیاش وتی: ئەبێ هەر بگەڕێمەوە، کاتێ ئیمامی عومەر بینی هەوڵدانەکەی لەگەڵ عیاش سودی نی یە و، هەر سورە لەسەر ئەوەی کە بگەڕێتەوە لای دایکی. ئیشێکی سەرسوڕهێنەری کرد، دابەزی لە حوشترەکەی و عیاش حوشتری پێنەبوو. ئیمامی عومەر پێی وت: ئەی عیاش ئەگەر هەر دەگەڕێیتەوە، ئەوا بە حوشترەکەی من بگەڕێوە، لەوانەیە منت بیربخاتەوە و ڕۆژێك لە ڕۆژان بگەڕێیتەوە بۆلام!

دیارە لەو کاتە و سەردەمەدا، حوشتری سواری وەکو ئوتومبێلی ئیستا وابووە لە ڕووی نرخ بەرزی و گرانبەهایی یەوە، عیاش حوشترەکەی وەرگرت و گەڕایەوە بۆلای کەسوکاری و توشی ئازار و ئەشکەنجە و لێدان بوو. خەریك بوو ئاشوب و ناڕەحەتی لێبکەوێتەوە.. مانەوەی حوشترەکەی عومەر لەلای عیاش یادگاریەك بوو، هەر بەبینینی عیاش ئاین و باوەڕی بیرئەکەوتەوە. دواتر عیاش بۆلای ئیسلام گەڕایەوە بەهۆی چاکی هاوڕێکەی کە عومەری کوڕی خەتاب بوو. {هاوڕێیەتی، عمرو خالد، و: بەناز جەمال، ل١٢ – ٢٠}.



## وتەی بەنرخ

- هاوڕێی باش لەخودی خۆت باشترە، چونکە مرۆڤ هەندێ جار خودی خۆی فەرمانی بەخراپە پێ دەکات. بەڵام هاوڕێی باش فەرمانت پێ ناکات تەنها بە چاکە نەبێت. وتەی: إبن أبی أصیبعە.

- پەروەردەکردنی ئاکار و ڕەوشت، لەنان و جلوبەرگ گرنگترە بۆ مرۆڤ. وتەی: سوقرات.

- مرۆڤی ئاکار جوان و ڕەوشت بەرز، ئەگەر وەصفت کرد شەرمەزار دەبێت، ئەگەر هێرشت کردە سەری بێدەنگ دەبێت. موستەفا لوتفی.

## هاوڕێ و ئاوێنە

پێغەمبەری سەوەرمان ﷺ دەفەرموێت: (**المُؤمِنُ مِرْآةُ المُؤمِنِ**). واتە: کەسانی ئیماندار ئاوێنەی یەکترن.. لەڕوانگەی ئەم فەرموودەیەوە بابێن خاڵی هاوبەشی نێوان هاوڕێ و ئاوێنە وەربگرین:

- هاوڕێ: ئاوێنەیەکە بۆ بینینی ڕەفتار و هەڵسوکەوت و مامەڵەی باش و خراپی مرۆڤەکان.

- ئاوێنە: ئاوێنەیەکە بۆ بینینی جەستە و لەش و لار و دەرخستنی ناتەواویەکانی پۆشاک و جلوبەرگ.

هاوڕێ پێویستە لە هەموو کاتێکدا، هەروەك ئاوێنە چۆن پێویستە بۆ دەرخستنی لایەنە باش و خراپەکانی هەڵسوکەوتی کەسەکان.

جۆرەکانی ئاوێنە هەروەك لە هاوڕێدا هەیە:

- ئاوێنەی زەڕەبین: ئەو ئاوێنەیەیە کە شتەکان وەك خۆی بەدەرناخات، بەڵکو چەندین قات لێمان گەورە دەکات.

- هاوڕێی زەڕەبین: ئەوانەن کە هەمیشە شتەکانمان لێ گەورە دەکەن، مێشمان لێ دەکەن بە گامێش، هەڵەکانمان زۆر لەخۆی گەورەتر و زیاتر نیشان دەدەن.

- ئاوێنەی قۆقز: ئەوەیە کە شتەکان بەخوار و خێچی نیشان دەدات، وەك خۆی وێنە نیشان نادات. چاکمان لێدەکات بەخراپە و خراپیشمان لێ دەکات بەچاك.

- هاوڕێی قۆقز: بەهەمان شێوەیە، ناتەواویەکانمان بەخراپتر نیشان دەدەن، چاکمان لێ دەکەن بە خراپ و خراپمان لێ دەکەن بە چاك.

- ئاوێنەی ڕاست و باش: ئەوەیە شتەکان وەکو خۆی بەڕاستی نیشان دەدات. وەکو خۆی ئاڕاستەی بەرامبەری دەکات. بێ شاردنەوەی هیچ ترسێ، یان زیاد کردنی هیچ ترسێ.

ـ هاوڕێی باش: ئەوەیە کە ناتەواویەکانی کەسەکان، وەك خۆی ئاراستەی بەرامبەر دەکات. بێ هیچ زیادەیەك و بێ شکاندنی هاوڕێکەی، هاوڕێی ڕاست هەروەکو کەم و کوڕیەکانت بێ لێ زیادکردن وەکو خۆی پێ دەڵێ، چاکەکانیشت ناشارێتەوە و وەکو خۆی باسی دەکات و، لەمیشدا لێی زیاد ناکات و مەدحی ناڕاستت ناکات. هەڵەکانت نیشان دەدات بۆئەوەی خۆت چاك بکەی، چاکەکانیشت لێ ناشارێتەوە بۆئەوەی نائومێدت نەکات و وانەزانی چاکەت نی یە.

جالەبەر ئەوە هەروەکو چۆن ڕۆژانە کە لە ماڵ دێینە دەرەوە، دەچین بەلای ئاوێنەکەمانەوە سەیری خۆمان دەکەین و لە جەستە و جلوبەرگمان ورد دەبینەوە، بۆئەوەی ئەگەر کەم و کوڕی و ناتەواویەکمان هەبوو، پەڵەیەکی بێزراو بەجەستە و جلوبەرگمانەوە هەبوو، پێش ئەوەی کەس چاوی پێی بکەوێ و پێی شەرمەزاربین. خێرا بەبێدەنگی لای ببەین و چاکی بکەین.

هەر بەهەمان شێوەش، پێش ئەوەی هەڵوێستێك، یان کارێك ئەنجام بدەین، پێویستە بگەڕێینەوە بۆلای هاوڕێکەمان. تاوەکو وتوێژ لەگەڵ هاوڕێیانمان بکەین بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو کارەی دەمانەوێت ئەنجامی بدەین، بەوەی تاچەند ئەنجامی باشی دەبێت.

## وتەی جوان

- هاوڕێ گرتن گرنگە، بەڵام بەردەوامی لەگەڵ هاوڕێ و نەپچڕاندنی پەیوەندی گرنگترە.

- ئاسانە قوربانی دان بۆ هاوڕێ، بەڵام گرانە دۆزینەوەی هاوڕێیەك کە شیاوی قوربانی دان بێت.

**بۆزانیاری:** لە زاراوەی زمانی عەرەبیدا، بەرامبەر هاوڕێ، دوو ووشەمان هەیە:

١) **زَمیل:** واتە: ئەو کەسەی کە بەقەزاوقەدەر بووە بە هاوڕێت، بەناچاری لە فەرمانگەیەکدا بەیەکەوە کاردەکەن، لە شوقەیەکدا، لە ژوورێکدا، لە قوتابخانەیەکدا، ژیان کۆی کردونەتەوە. ئەم جۆرە هاوڕێیە هەڵبژاردنی تێدا نی یە.

٢) **صدیق:** واتە: ئەو کەسەی کە بەحەز و خولیاو سروشتی خۆتان بوون بە هاوڕێ، هەرچەندە لەیەکتر دوربن، کار لە خۆشەویستی نێوانتان ناکات و کاڵ نابێتەوە..

ئەوەشمان لەبیرنەچێت، هەندێ جار هاوڕێ لە (**زَمیل**)ەوە دەگۆڕێت بۆ (**صدیق**). ئەویش بەخۆی بەردەوامی پێکەوە بوونی زۆرەوە. هۆگری یەکتر دەبن، هەروەك جاری واهەیە هەندێك کەس، سەرەتا تا ماوەیەك دلگیرنی یە، دوای مامەڵەیەکی زۆر لەگەڵیدا، ئەوکات خۆشەویستی بۆ کەسەکە دروست دەبێت.

ـ پرسیار کرا لە زانایەك کە هاوڕێ چاکە یان برا؟ لەوەلاّمدا وتی: هاوڕێش برایەکە خۆت بەئارەزووی خۆت هەڵی دەبژێریت..

<u>بزانە و ئاگاداربە:</u> هاوڕێ لەدەست دانی ئاسانە، وەك لە دەستدانی کتێب و ئاوێنە چۆن لە چەند چرکەیەکی کەمدا دەتوانی ئاوێنەکەت بشکێنی و لەدەست خۆتی بدەیت. یان کتێبێك بە ماوەیەکی کورت بەسوتاندن دەفەوتێنیت. بەهەمان شێوەش لەماوەیەکی کەمدا هاوڕێ لەدەست دەچێت. بەلاّم چۆنی کاتی زۆری دەوێت تا کتێبێك دابنێیت، یان ئاوێنەیەك دروست بکەیت. ئاواش ماوەیەکی زۆری دەوێت تا هاوڕێیەکی دڵسۆز دەدۆزیتەوە..

وتراویشە: (الصاحِبُ ساحِب) واتە: هاوڕێ ڕاکێشە، هەموو کەسەکان لە هاوڕێکانیانەوە نزیك دەبنەوە، واتە: دەچنەوە سەر خو و ڕەفتاری هاوڕێکانیان. {گۆڤاری بڕیار، ژ: ٤٧، ل٣٢}.



## کام ناسیاو و هاوڕێ ببەینە ماڵەوە و سەر سفرە و خوانمان؟

پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ، هانی داوین کە کەسێکی گۆشەگیر نەبین و، بەتەنها هەر بۆ خۆمان نەژین، بەڵکو هەوڵبدەین تێکەڵی کۆمەڵ ببین. جا لەو کاتەدا خەڵکی بۆ پۆلێن کردوین بەم شێوەیە:

١) هەر کەس توشبووی لە ڕێگا و بان و مزگەوت و فەرمانگە، سەلامی لێ بکە، جا بیناسی یان نەیناسی، بیناسی کە پیاوی چاکە، خراپە، دیندارە، بێ دینە، موسڵمانە، غەیرە موسڵمانە.. مادام مرۆڤە و توشی بووی بە ڕوویەکی خۆشەوە سڵاوی لێ بکە. بۆئەوەی بزانێ خێرت بۆی دەوێ و لەشەرت ئەمین بێ و لەشەڕ و خراپەی بەدوربێ. چونکە کەسی لار و لەوێر و لاساریش کە سەلامت لێکرد، دەزانێ نرخت بۆ داناوە و ڕێزی دەگری و ئەگەر بیەوێ ئازاریشت بدات پەشیمان دەبێتەوە. بۆیە لەسەلامدا. سەلام لەهەموو کەس بکە. فەرمووی: (**السَّلامُ عَلى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِف**).

٢) هاوڕێیەتی و تێکەڵاویت بالەگەڵ ئیمانداری ڕاستەقینەدا بێت، نەك هەر موسڵمانی بە ناسنامە و قسە. بزانە لە کردەوەیدا ئیمان ڕەنگی داوەتەوە، ئەمجا معامەلە و سەفەری لەگەڵ بکە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**لاتُصاحِبْ إلاّ مُؤْمِناً**). هاوڕێیەتی ئیمانداری ڕاست نەبێ مەیکە.

٣) هاتوچۆی ماڵ و عائیلەت و نان خواردن بەیەکەوە و تێکەڵاوی خێزانیت، با تەنها لەگەڵ ئیمانداریکی بەتەقوا بێت. کە نەك هەر ئەهلی مزگەوت و جومعە و جەماعەتە. بەڵکو بەکردەوە لێت بینیوە کە چەند چاو پاك و داوێن پاکە، چەند دەرونی پاکە، چەندە خۆی لە حەرام دەپارێزێ! لێی دڵنیای ئەگەر بێتە سەر سفرەت و نانت بخوا، نان دێنت نادڕێ، بەچاوی خیانەت و ناپاکی سەیری عائیلە و خێزانت ناکات. دەی ئەمە دەتوانی بیکەی بەهاوەڵی تێکەڵاوی بنەماڵەت. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**وَلا يَأْكُلُ طَعامَكَ إلاّ تَقِيٌّ**).

## خۆشەویستی نێوان هاوڕێکان، تەنانەت لەگۆڕیشدا !

لەجەنگی (ئوحود)دا، کە ژمارەی شەهیدەکان دەگەیشتە (٧٠) کەس، بریندارێکی زۆر و شەهیدێکی زۆر، سەرەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ئامازەی پێدان کە شەهیدەکان دوو دوو بخەنە ناو گۆڕێکەوە، پاشان هاوەڵان دەستیان کرد بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئالەم کاتەدا ئەگەرچی پێغەمبەر ﷺ لەگەرمەی دفن و، شاردنەوە و ئازار و گریان و، ناڕەحەتی لەسەر مردنی حەمزەی مامی دابوو، لەم کاتەدا ڕووی کردە هاوەڵانی و فەرمووی: بوەستن و ورد ببنەوە و بگەڕێن بۆ (عبدالله ی کوڕی حەرام) و (عەمری کوڕی جموح)، بەیەکەوە لەیەك گۆڕدا بیان

نێژن. فەرمووی: (إِدْفناهُما سَوِيّاً فَإِنَّهُما كانا مُتَحابينَ في الدُّنيا). واتە: بەیەکەوە بیان نێژن، چونکە لە دنیادا ئەم دوانە زۆر هاوڕێیەتیان بەهێز بوو، وە زۆر یەکتریان خۆشدەویست، جاچۆن لە دنیادا زۆربەی کات بەیەکەوە بوون، بالەگۆڕیشدا هەر بەیەکەوەبن!!.

## لە قیامەتیشدا لەگەڵ هاوڕێکانمان بەیەکەوە زیندوو دەکرێینەوە

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵ دەرچوو، دەستی کرد بەگەڕان و هەواڵ پرسی بەدوای ئیمامی ئەبوبەکر و عومەردا، لەبەردەم هەموو هاوەڵاندا وەستاندنی. پاشان دەستێکی خستە ناو دەستی ئیمامی ئەبوبەکرەوە و دەستێکیشی خستە ناو دەستی ئیمامی عومەرەوە و، ڕووی کردە هاوەڵان و فەرمووی:

(هكَذا نُبعثُ يَوْمَ القِيامَةِ). واتە: ئابەو شێوەیەش لە قیامەتدا زیندوو دەکرێینەوە. {هاوڕێیەتی، عمرو خالد، و: بەناز جەمال، ل٤٤}.

## لەهاوڕێی خراپ چیم دەستکەوت؟!

دووپیاو کە هاوڕێی گیانی بەگیانی یەکتربوون، یەکێکیان خواناس و چاکەخواز و ڕەفتار جوان بوو، پارێزی لەئاوی شەوێ دەکرد، حەلاڵخۆر و مامەڵە دروست بوو.. ئەوی تریشیان بە پێچەوانەی ئەمەبوو، خوانەناس و خراپەکاربوو، بەسەر ماڵی خواوە نەدەچوو، لەمامەڵەی ناشەرعی و ماڵی هەتیو و ماڵی مزگەوتیش نەدەسڵەمیەوە!

بەلاَم سەیر و سەمەرە لەوەدا بوو، کە کوڕی پیاوە خێرخوازەکە هەتا بڵێی خراپ نارەسەن و چەقاوەسوو بەدکرداربوو، بەدڕەفتاربوو،! کوڕی کابرای خوانەناسیش هەتا بڵێی خواناس و چاکە خواز و کردار و ڕەفتار جوان و زمان شیرین و ڕەوشت بەرزبوو!.

ڕۆژێك کابرای خواناس دەردە دڵی خۆی لای کابرای هاوڕێی کرد و وتی: ئەریێ زۆر سەیرە من نەك حەرام، بەڵکو خۆشم لە گومان لێکراوەکان پاراستوە، تۆش باش خۆت دەناسیت پێویست بە تەعریف و پیا هەڵدان ناکات. بەلاَم کوڕی من چۆنە و کوڕی تۆش چۆنە؟

کابراش یەکسەر وتی: دەزانی بۆچی وایە؟!

وتی: نەخێر نەوەڵلا.

کابرای حەرام خۆر وتی: کوڕەکەی من بەردەوام لە ماڵی ئێوەیە و، نان و خواردنی ئێوەی زیاتر خواردوە لە نان و خواردنی خۆمان. واتە: بەنان و خۆراکی حەلاڵ و زولاڵ پەروەردەبووە..

کوڕەکەی ئێوەش بەردەوام نان و خواردنی ماڵی ئێمەی خواردووە کە حەلاڵ و حەرامی هەمووی تێکەڵە. بۆیە ئاوا خراپ دەرچووە. واتە: بەنانی حەرام گۆش کراوە ! !.

ئەو کاتە کابرای خواناس بیری کەوتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بێ حیکمەت نەیفەرمووە: **(لاتُصاحِبْ إلاّمُؤْمِناً، وَلا يَأْكُلْ طَعامَكَ إلاّ تَقِيّ)**. واتە: هاوڕێیەتی مەکە لەگەڵ ئیماندار نەبێ، بەتەنها مرۆڤی خواناسیش لەنان و خواردنت بخوات.. بەلاَم درەنگ پێی زانی و تازە کار لەکار ترازابوو، دەستی لەبنی هەمانەکەوە دەرچوو. بەسەرهاتەکەشی بۆیە گێڕاوەتەوە تا خەڵکی پەند و ئامۆژگاری لێوەربگرن و بەدەردی ئەو نەچن..

هاوڕێی خراپ وەکو ئاگر وایە، کابرا هەزار ساڵ ئاگرپەرستێت کە دەستی لێدا دەسوتێنێت. ئاو و هەواش لە نزیك و دەوروبەری لاکە تۆپیوی ڕزیو بۆگەن، پیس و بۆگەن دەبن!.. {پایزە برا، مەلا ئەحمەدی شەریعە ب١، ل٧٥}.



## هاوڕێ دەگمەنەکان

ئەو مرۆڤەی هاوڕێیەکی دڵسۆز و بەوەفا و خەمخۆری نی یە، وەکو جەستەیەکی بێ ڕوح وایە. گرنگی نی یە ئێمە چەند هاوڕێمان هەیە، گرنگ ئەوەیە بزانین هاوڕێکانمان کێن؟

لەم زەمانەدا هاوڕێیانی بەوەفا و بەئەمەك و دڵسۆز و خەمخۆر، دراوێکی دەگمەنن. هاوڕێی ڕاستەقینە گەنجینەیەکی بەنرخە، تکایە پارێزگاری لەو گەنجینەیە بکە، لەدەستی مەدە، چونکە دەست کەوتنەوەی ئەستەمە..

چەندە جوانە ئەو هاوڕێیەتیەی پاك و بێگەرد و دور لەبەرژەوەندی ماددی و مەرامە، ژیان چەندە خۆشە لەگەڵ هاوڕێ دەگمەنەکانت، بەلاّم چەند سەختە لەبێ هاوڕێیەتی، یان لەگەڵ هاوڕێی بێ وەفا!!

هاوڕێی ڕاستەقینە لەخۆشی و ناخۆشیدا، لەشین و شایدا، بەشداریت دەکات. هاوڕێی ڕاستەقینە هەمیشە لەکاتی ناخۆشیدا لەتەنیشتی هاوڕێکەیەتی، هەرگیز لێی دوور ناکەوێتەوە، هاوڕێی ڕاستەقینە ئەگەر هەڵەت کرد،ماڵئاوایت لێناکات، بەڵکو لێبوردنت پێشکەش دەکات.. هاوڕێی ڕاستەقینە هەمیشە هەواڵت دەپرسێ، لێت بێزار نابێت. ئەگەر زیزی کردی ناخەوێت، تائەو ئاشتت دەکاتەوە.

لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە: کە هاوڕێی ڕاستەقینە بەبێ هیچ مەرام و بەرژەوەندیەکی ماددی و مەعنەوی تۆی خۆشدەوێت.

بەڵام: ئایا هەموو کەس دەگونجێ بیکەیتە هاوڕێی خۆت؟!

ئەم پەندە زۆر جوانە کە دەڵێت: پێم بڵێ هاوڕێکەت کێیە، پێت دەڵێم تۆ کێی!

لەبەرئەوە پێویستە کەسانی ڕەوشت بەرز و ئاکار جوان و ڕاستگۆ و بەوەفا و داوێن پاك و دەست پاك و زمان پاك و ئەمین هەڵبژێرین، بۆئەوەی بیانکەینە هاوڕێی خۆمان. چونکە دەبێت ئەوە بزانیت کە تۆ لەبری هاوڕێ دوژمنت هەڵبژاردووە!!

پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێت: (هاوڕێ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، باهەریەك لە ئێوە بڕوانێت هاوڕێیەتی کێ دەکات).

نمونەی هاوڕێیانی ڕاستگۆ و بەوەفا لە مێژوودا تۆمار دەکرێ و دەبێتە چیرۆك و لەڕووپەڕی کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا پەخش دەکرێ و هەزاران کەس دەیخوێننەوە و سود لە هەڵوێست و وەفادارییان وەردەگرن..

**باپێکەوە چیرۆکی ئەم دەستە هاوڕێیانە بخوێنینەوە:**

کوڕێك لەسەرەتای تەمەنی لاویەتیەوە، پزیشکەکان ڕایانگەیاند کە تووشی نەخۆشی شێرپەنجە هاتووە، چەند هەفتەیەك لە نەخۆشخانەی تایبەت خەوێنرا و، لە ڕێگەی تیشك و چارەسەری کیماویەوە چارەسەری بۆ کرا.

لەکاتی وەرگرتنی چارەسەرە کیمیاییەکاندا، تەواوی تاڵە ڕەشەکانی قژی لەدەستدا ئەو ڕۆژەی لە نەخۆشخانە هاتەدەر، لەڕێگەی گەڕانەوەی بۆ ماڵ، هەستی بە نیگەرانی و دوو دڵی دەکرد، نەك بەهۆی نەخۆشیەکەیەوە، بەڵکو هەستی بەشەرمەزاری دەکرد کەچۆن بەسەری کەچەڵەوە بڕواتە نێو هاوڕێکانی یەوە؟! چۆن بڕواتەوە بۆ قوتابخانە؟! بڕیاریدا بۆ ئەو مەبەستە، کڵاوێك بکاتە سەری و هەرچۆنێك بێت بڕواتەوە بۆ قوتابخانەکەی و درێژە بەخوێندنەکەی بدات..

لەم خەیاڵانەدابوو، ئوتومبێلەکە لەبەردەرگای ماڵەکەیاندا وەستا! دابەزی و بەرەو ماڵ هەنگاوی نا، لەناکاو شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەری بینی!

بینی وا نزیکەی (٥٠) کەس لە هاوڕێکانی بەیەکەوە و لەبەر دەرگای ماڵ پێشوازیان لێکرد و پێکەوە بەیەك دەنگ گوتیان:

بەخێربێیتەوە بۆ ماڵ، بەخێربێیتەوە بۆ ناومان!..

ئەم لاوە سەیری کردن، بەچاوەکانی خۆی بڕوای نەدەکرد، بینی هەموو ئەو پەنجا هاوڕێیەی سەریان سفر کردبوو، تەنها بۆ ئەوەی هاوڕێکەیان خەمبار و نیگەران نەبێت و بێتاقەت نەبێت. ئەوە هاوڕێیەتی ڕاستەقینەیە، هەستکردن بە ئازار و خەمەکانی یەکتری، هاو سۆزی و هاوخەمی یەکتر!! {گۆڤاری بڕیار، ژ: ٦٢، ل٤١، نوسینی: ئالانی}.

## هاوڕێیەتی گیانداران

هەندێ جار مرۆڤ لەچاوپێکەوتنی ڕەفتاری هاوڕێی خراپ، وازی لە هاوڕێیەتی و برادەری هەموو مرۆڤەکان هێناوە و، گیاندارێکی کردووە بە هاوڕێی خۆی. وەکو لەم بەسەرهاتەدا دەبینین کە ئیمامی ابن الجوزی لە کتێبەکەیدا: (الأذكياء: ص٢٩٨) دا گێڕاویەتیەوە دەڵێ:

کابرایەك هەبوو، ناوی (حَرث بن صعصعة)بوو، ئەم پیاوە دۆستایەتی و هاوڕێیەتی کەسی نەدەکرد، تەنها یەك سەگ کە لەبەچکەییەوە خۆی بەخێوی کردبوو، هاوڕێی شەو و ڕۆژی بوو. زانایان و پیاوانی بەڕێز لێیان دەپرسی: هۆی چیە تۆ وازت لە هەموو کەس هێناوە و تەنها هاوڕێت سەگەکەتە؟! ئەویش وتی: ناحەقم مەگرن و گوێ بۆ باس و بەسەرهاتم بگرن:

من گەنج بووم، هاوسەرم هەبوو، چەند برادەرێکی بەحیسابی خۆم زۆر دڵسۆز و گیانی بەگیانیم هەبوو، شەو و ڕۆژ بەیەکەوە بووین. لەماڵەوە بەخێزانی دادەنیشتین..

ڕۆژێکیان بۆ کارێکی تایبەتی خۆم چوومە شوێنێك و برادەرەکەم خۆی لێ جیاکردمەوە، تومەز ئەم برادەرە ناپاکە، دەستی لەگەڵ خێزانەکەمدا تێکەڵ کردووە و، کە زانیویەتی من لەماڵ نیم چووە بۆ لای. ئێوارە کە گەڕامەوە و دەرگام کردەوە، چی ببینم؟!

والاشەی ژنەکەم بەخنکاوی لەوێ کەوتووە و لاشەی برادەرەکەشم لەلایەوە و قورقوڕاکەی هەڵبڕدراوە و لاشەیان ڕوتە و سەگەکەشم بەدیاریانەوە وەستاوە و دەمی بەخوێنە !

کە چاوی بەمن کەوت سەیری کردم و، سەیری برادەرەکەم و ژنەکەمی کرد، بەئاماژە تێی گەیاندم کە بینیویەتی ئەم پیاوە خۆی کردووە بەم ماڵەدا و منی لەگەڵ نەبووم. زانیویەتی کارەکەی نابەجێیە، بۆیە چاودێری کردوون و کە بینیویەتی وابەیەکەوەن و، ئەو برادەرەم ناپاکی لەگەڵ کردوم، پەلاماری داون و خنکاندونی و بەدیار لاشەکەیانەوە ماوەتەوە. تامن دەگەڕێمەوە و ڕاستی مەسەلەکە دەزانم ! !

ئیتر ئەوەم بینی، وازم لە هاوڕێیەتی هەموو کەس هێنا و ئەم سەگەم بەسەر بۆ هاوڕێیەتی. پاشان (حَرث) ئەم شعرەی وت:

**فللكَلْبِ خَيْرٌ مِنْ صَديق يخونني**

**وَينكح عرسى بَعْدَ وَقت رَحيلى**

**سَأَجْعَل كلبى ماحييت منادمى**

**وَأَمنحُهُ ودى وصفو خليلى.**

{ساعَةٌ وَساعَة، محمود المصري، ص٣٩٠} .



## هاوڕێیەتی مەیمونێکی شارەزاو وەفادار!

لە کتێبی (عَجائِبُ الهِند)دا هاتووە، کە نوسەرەکەی لە گەشتی وڵاتی هندستاندا شتی سەرسوڕهێنەری بینیوە و تۆماری کردووە.. یەکێ لەوانە ئەوەیە کە دەڵێ: لە گوندێکدا کابرایەکی بازرگان هەبوو، ئەم بازرگانە لەجیاتی مرۆڤێك. کوڕێکی گەنج بکات بە هاوکار و بەردەست و خزمەتکاری، هاتبوو مەیمونێکی ڕاگرتبوو، ئەم مەیمونە گەسکی بۆ لە ماڵەکەی دەدا و بۆی خاوێن دەکردەوە! ئەگەر یەکێ لەدەرگای بدایە، دەچوو دەرگای لێ دەکردەوە و پێشوازی میوانی دەکرد، پاشان دەرگاکەی دادەخستەوە.

ئاگری دەخستە ژێر مەنجەڵی خواردن و فووی لێدەکرد، تا ئاگرەکە بڵێسەی دەسەند. چیلکە و داری بۆ ئاگر دێنا، مێشی لەسەر سفرەی نان خواردن دەردەکرد. کە خاوەنەکەی دەخەوت، بەباوەشێن فێنکی دەکردەوە و باوەشێنی دەکرد!.

هەر ئەم گەڕیدە نوسەرە دەڵێ: لە (عەممان)نیش ئاسنگەرێکم بینی مەیمونێکی لابوو، کاری لەسەر ئەو ئامێرەدەکرد، کە فوو لە کورەی ئاگرەکە دەکات. لەبەیانی تا ئێوارە ئەمە کاری بوو! شاگردێکی زۆر گوێڕایەڵ و بێ کێشەبوو! ئاسنگەرەکە دەیوت: ئەوە ماوەی پێنج ساڵە ئاوا کارم بۆ دەکات و ڕۆژێ لە ڕۆژان کەمتەرخەمی نەبووە! {ساعةٌ وَساعَة، محمود المصري، ص٣٦٥}.

## وەفاداری گیانداران بۆ هاوڕێکەیان، دوای مردنی!

گیانداران نەك هەر لە ژیاندا هاوڕێیەکی وەفاداری مرۆڤ بوون. بەڵکو لەدوای مردنی خاوەنەکانیشیان ئەوپەڕی وەفاداری هاوڕێیەتیان نیشان داوە، با سەرنجی ئەم دوو بەسەرهاتە بدەین:

### یەکەم: وەفاداری ئەسپێك بۆ خاوەنەکەی!

نووسەری بەناوبانگ (عبدالرزاق نوفل) لە کتێبەکەیدا (أسرار و عَجائِب، ص١١٩)دا. ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لەشاری (مرسی) لەوڵاتی میصر ڕوویداوە و، باسی وەفاداری ئەسپێك دەکات بۆ خاوەنەکەی، بەسەرهاتەکەی بەم شێوەیەیە:

پیاوێك ماینێکی دەبێ و ئەمماینە بەچکەیەکی دەبێ. بەڵام هێشتا بەچکەکەی شیرە خۆرە دەبێ، کە ماینەکە گیان لەدەست دەدات و ئەم جوانە ماینە بێ دایك دەمێنێتەوە.

دیارە ئەو زەمەنە شیری قوتو و مەمکە وەکو ئێستا نەبووە. بۆیە خاوەنەکەی دێنێ جۆ ورد ورد دەکات و شەکری پێوە دەکات و، دەیدات بەم بەچکەیە.. ئیتر جوان خزمەتی دەکات و ئەگەر ناساغ بێ، حەکیم و دکتۆری بەیتەری بۆ دێنێ و، چارەسەری دەکات. هەتا جوانە ماینەکە گەورە دەبێ و دەبێتە ئەسپێکی گەورە.

دوای چوار ساڵ ئەم پیاوە کە چۆتە تەمەنەوە، نەخۆش دەکەوێت و لە جێگەدا دەکەوێ و خواردن و خواردنەوەی بۆ ناخورێ. ئەم ئەسپە کە دەزانێ خاوەنەکەی کە لەمناڵیا وەکو دایکی بەخێوی کردووە و زۆر دڵسۆزی بووە. وەفاداری خۆی دەنوێنێ و ئەمیش دڵی هیچ نابا و هیچ ئالیك و، خواردنێك کە بۆی دادەنرێ نایخوات و سێبەر و شوێنی حەوانەوەی خۆی بەجێدێڵێ و، ڕۆژانە بەدیار خاوەنەکەیەوە دەوەستێ، کە لەژێر کەپرێکی هاوینەدا ڕاکشاوە!

پاش چەند ڕۆژێ، کابرا دەمرێ و و دەنگ گریان و شین و شەپۆڕی ماڵ و منداڵی بەرز دەبێتەوە و، ئەسپەکە کە گوێی لە هاوار و گریانی ژن و منداڵی خاوەنەکەی دەبێ!

دەزانێ خاوەنەکەی مردووە و ئەمیش لەگەڵ خەڵکەکەدا دەڕوات بۆ گۆڕستان و، هەتا خاوەنەکەی دەخەنە قەبرەوە و دای دەپۆشن و تەلقین دەکرێ لەوێ دەبێت. پاشان خەڵکەکە بڵاوەی لێدەکەن. ئەمیش دەچێتە سەر گردۆڵەیەك و لەسەر بەرزیەکەوە خۆی فڕێ دەداتە خوارەوە و، لای خوارەوەی بەردەڵان دەبێ و بەربەردەکان دەکەوێ و گیانی لەدەست دەدات!!

بەکردەوە وەفاداری بۆ خاوەنەکەی دەربڕی و سەلماندی بەبێ ئەو ژیانی ناوێ!! {ساعَةٌ وَساعَة، محمود المصري، ص٣٦٠}.

## دووەم: سەگێك شەش ساڵە گۆڕی خاوەنەکەی بەجێنەهێشتووە!

ڕۆژنامەی (دەیلی مەیلی) بەریتانی بلاوی کردۆتەوە کە بەدرێژایی شەش ساڵە، سەگێکی بەوەفا هەموو شەوێك هەتا بەیانی لەسەر گۆڕی خاوەنەکەی ڕۆژ دەکاتەوە، ئەو سەگە ئەڵمانیەی کە بە (کاپتن) بانگ دەکرێت، بەدرێژایی ئەو ماوەیە، بەهیچ شێوەیەك گۆڕی خاوەنەکەی بەجێنەهێشتووە، کە لەگۆڕستانی شاری (فیلا کارلوس بان) لەناوەڕاستی ئەرجەنتین بەخاك سپێردراوە.

خانەوادەی مردووەکە دەڵێن: پێشتر بەهیچ شێوەیەك ئەو سەگەمان لەگەڵ خۆماندا نەبردووە بۆ گۆڕستان، لەبەرئەوە بەلامانەوە جێگەی سەسوڕمان بوو، کە چۆن گۆڕەکەی دۆزیوەتەوە !.

ڕۆژنامەی ناوبراو ئەوەشی ئاشکرا کردووە: ئەو سەگە بەوەفایە هەموو ڕۆژێك سەعات شەشی ئێوارە دەچێتە سەر گۆڕی خاوەنەکەی و، هەتا بەیانی لەلای گۆڕەکەی دەمێنێتەوە! لە ئێستاشدا کرێکای گۆڕستانەکە خواردن و خواردنەوە دەدەن بەسەگەکە، دوای ئەوەی سەکەگە بۆتە بەشێك لەژیانی ناو گۆڕستانەکە. {هەفتەنامەی (بەیان) ژ: ٣٠، ل٩}.

## کۆتایی

هەزاران هەزار سوپاس بۆ خوای بەخشندەی میهرەبان، کە یارمەتی دام بۆ تەواوکردنی زنجیرە باسی (لەخوا غافڵ مەبە)، خوای گەورە لێمان قبوڵ بفەرمووێ و، لەکەم و کورتی و هەڵەکانمان ببورێ و بیکەیتە توێشوی قیامەتمان.. بۆ خۆم و دایك و باوکم و هاوسەر و منداڵەکانم.

خوایەگیان هەمیشە یاد و زیکری تۆ بکەین و لەتۆ غافڵ نەبین.. خوایەگیان بەلوتف و کەرەمی بێ سنوری خۆت پاداشتی زەحمەت و ماندووبوونی (کاك مەریوان)، بەڕێوبەری پڕۆژەی گەشە، وە هەردوو لاوی مەرد کاکە: (ئیحسان و میران)، کە بەتایپ وهەڵەچنی و تەصمیم و بەچاپکەیاندنی ئەم کتێبەوە زۆر ماندووبوون. هەر دەست و چاویان خۆش و گەش بێ و بەرهەمیان زیاتربێ.

ئێوەش خوێنەرانی بەڕێز لەدوعای خێر بێبەشمان مەکەن.

دووبارە و سەد بارە، سوپاس بۆ خوای میهرەبان لەسەرەتا و لەکۆتاییدا. صلاوەتیش بۆ سەر گیانی پاك و ڕۆحی هەمیشە زیندووی سەردار و سەروەرمان نوری چاومان. شەفیعی مەحشەرمان. بەئاگاهێنەوەمان لەخەوی غەفڵەت پێشەوای پێغەمبەران محمد المصطفى ﷺ..

اللّٰهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَسَلِّم.

سُبْحانَ رَبِّكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمّا يَصِفُون وَسَلامٌ عَلى المُرْسَلين وَالحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين.

کاتژمێر: ٨:٤١ خولەکی یەکشەممە/ شەوی شەممە ٢٠١٥/٥/٢/٣ (پیرەمەگرون).

تەواو..